# ژیانی پێغەمبەران .. خوێندنەوەیەکی نوێ

لەزنجیرەبەرنامەکانی ژیانی پێغەمبەران سەلامی خودایان

لەسەربێت ( حاجی کاروان )

ئامادەکردن و تایپ و پێداچوونەوەی : سوهەیب

جەمیل عەلی

ئەم کتێبە بۆیەکەمجار لە چاپخانەی( دار المعرفە)

ی شاری بەیروتی پایتەختی لوبنان لەساڵی 2008

ی زایینی بەرامبەر ساڵی 1429 ی کۆچی چاپ

کراوە .

پێشـــــــەکی:

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى اله واصحابه اجمعين..

بۆبەسەربردنی ژیانێکی پڕ لەسەروەریی و بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکی بەندایـەتی، بـۆ دابـین کردنـی یەکـسانیی و دادپەروەریی و بۆ جوان مامەڵە کردن لەگەڵ خوای گەورە و خەڵکی، بۆ گەیاندنی پەیامی خـوایی بـۆ بەنـدەکان و رووناك کردنەوەی رێگای خواپەرستیی، ئەوا خوای گەورە پێغەمبەرانی رەوانە کردووە...

بۆ ئەوەی ئێمەش لەم کاروانە پڕ بەها و پڕ سەروەرییە دانەبڕێین و جێ دەستمان دیاربێت، ئەوا پێغەمبەرانی خوای گەورە مەزنترین و پیرۆزترین کەسن بۆ ئەوەی چاویان لێبکەین و بیانکەین بە پێشەنگی خۆمان.

هەرلەبەر ئەم هۆیەشە کە بە ئەرکی سەرشانی خۆم زانی بەو بەهرە خواییـەی کـە پێم بەخـشراوە ئـەم بەرهەمـە بەچاپ بگەیەنم و خزمەتێك بـە گەلـە سـتەمدیدەکەم و هـەموو موسـڵمانان بکـەم، ئـەم بەرهەمـەم لەشـێوەی بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی پێشکەش بە بینەران کردووە و، دواتر بە باشم زانی لەکتێبێك چـاپ بکرێـت بۆئـەوەی بینەرانیش سوود لەبەسەرهات و رووداوەکانی پێغەمبەران وەربگرن و لەمانای نێردراوییان شارەزابن، بەڵام ئـەوەی نووسیومە و باسیان لێ ئەکەم لەژیانی پێغەمبەران سـەلامی خـوای گـەورەیان لەسـەربێت، لـەم نووسـینە زیـاتر هەڵئەگرێت ... بەڵام هەوڵم داوە بەشێوەیەکی کورت و پوخت و سەردەمیانە پێشکەشی خوێنەرانی بکەم... هەروەها هەوڵی زۆرم داوە لە کۆکردنەوەی سەرچاوەی زۆر باوەڕ پێکراو وەکو ) ئیبن کەسیر و شێخ محەممەد متەوەلی شەعراوی و دکتۆر تاریق ئەلسوەیدان و عەمر خالید ( خوای گەورە پاداشتی هەموولایەکیان بداتـەوە، تکاکـارم خوێنـەرانی خۆشەویست سوود لەم بەرهەمە وەربگرن و ژیانێکی نـوێ و پـڕ بەختـەوەری سـازبکەن و لەکـەم و کورییەکانیـشم ببوورن، چاوەڕێی نزای خێری ئێوەی ئازیز و خۆشەویستم...

حاجی کاروان

هەولێر / هەرێمی کوردستانی عیـــراق

2008زاینی 1429 / کۆچی

( گرنگی ژیانی پێغەمبەران ) سەلامی خوای گەورەیان لەسەربێت

خوای گەورە کە ئاسمانەکان و زەوی و جنۆکەکانی دروستکرد دواتر باوکە ئادەم بڕیار و فەرمانی دەرکـرد کـەدەبێت کەسێك لەسەر زەوی کاروبارەکانی من بیات بەڕێوە و ببێت بەجێ نشینم، بۆیە خوای گەورە ویستی وابوو و کەدەبێ بێتە جێ ئەویش ناردنی کۆمەڵێك پێغەمبەرە بۆ گەلانی سەرزەوی، ئەو هەمووپێغەمبەرانە بـەخۆڕایی و بەویـستی خۆیان نەهاتوون و، بڕیار و فەرمانی خوای گەورەیە و هەرهەمووشیان مەعسومن لەگوناح، کەواتە خوای گەورە کە

هەڵبیژاردوون دەبێ ئێمەی مرۆڤیش گوێڕایەڵیان بین و لە فەرمانیان دەرنەچین چونکە ئەو هەموو پێغەمبەرە کە خوای گەورە بۆ مرۆڤەکانی ناردوون هەرهەموویان شیاوی ئەو مەقامە بەرزەن و پیرۆزن.

سەرجەم پێغەمبەران بە کردەوە تێکەڵ بەناخی گەلەکانیان بووینە و بەکردەوە و جەستەش لەناویاندا ژیاون و شەو نخوونیان کردووە وماندووبووینە و ئەزیەت و ئازار و ناڕەحەتییان بینیوە چونکە ئەو پێغەمبەرانە بەکردەوەش ببوونە پێشەنگ و قودوە، بۆیە خوای گەورە و میهرەبان هەموو پێغەمبەرانی کردبوو بە مامۆستا و چاوساغی گەلان، هەروەها هەژاربووینە و بەئارەقی ناوچەوانیان رزق وڕۆزییان پەیداکردووە و ماندووبووینە، ئەوەتا زۆربەی پێغەمبەران شوانێتیان کردووە و زۆربەشیان دارتاش و بازرگان وئاسنگەربووینەو هتد...چەندە جوانە بازرگانێک چاو لەحەزرەتی سولەیمان بکات و بڵێت ئەو سەروەت وسامانەی لەبەردەستم دایە هی خوای گەورەیە و هیچی منی تیانییە، یاخود چەندە گرنگە گەنجێك وەکو حەزرەتی یوسف داوێن پاك بێت و چاوی لەکاری ناشەرعیی نەبێت و هەرکاتێك کارێکی ناشەرعیی بەرۆکی گرت ئەو بڵێت ) معاذ الله ( و لەخوا بترسێت و بزانێت کە خوای گەورەبەردەوام چاودێرە بەسەریەوە، چەندەبەرز و پیرۆزیشە کچێك یاخود ئافرەتێك چاو لەمەریەم و بنەماڵەی ) ال عمران ( بکات و داوێنی پاك و رەوشتی جوان بێت، ژیانی پێغەمبەران چیرۆکێك نییەو هەموومان لەدەوری چیرۆك خوانێك دابنیشین و ئەڵقە ببەستین و گوێی بۆ بگرین، بەڵکو ژیانیان پڕە لەراستی وهەقیقەت و بەسەرهات، ئێمە کاتێك ژیانی پێغەمبەران ئەخوێنینەوە و گوێی بۆدەگرین بۆئەوەیە تاوەکو لەژیاندا ئۆقرەگر بین و دەستەوسان دانەنیشین، لەوانەوە فێری رەوشتی جوان و خۆشی وناخۆشییەکانی ژیان دەبین، فێرمان دەکەن کەلەم ژیانە بۆچی دەژین و بۆکێ دەمرین؟ پێمان دەڵێن کەبۆچی هاتووینەتە ئەم ژیانە و بۆکوێ دەڕۆین و چیمان بەسەردێت و گەڕانەوەمان بۆلای کێیە؟

پێغەمبەران فێرمان ئەکەن کەتەنها بۆخوا بژین و لەڕێی خواش بمرین وسەربنێینەوە، بەهەشت و دۆزەخیان پێ نیشانداین و لەئازار و ناڕەحەتییەکانی رۆژی دوایی ئاگاداریان کردینەوە، فەرمانییان پێکردین دەست لەگوناهو تاوان هەڵبگرین و ڕێگەی چاکەبگرینەبەر ...پێغەمبەران ماوەی نێوانیان زۆربووە و پێغەمبەری واهەبووە ماوەی نێوانیان دووسەد ساڵ تا پێنج سەدساڵ وتاوەکو هەزار ساڵیش بووە.

خوای گەورە بۆچی ئەو هەموو پێغەمبەرەی ناردووە ولەبەرچی ؟ چونکە کەپێغەمبەرێك لەناو گەلێك بووایە ژمارەیەکیان باوەڕیان دەهێنا و بە ئیمانداری دەمانەوە بەڵام دوای ئەو پێغەمبەرەو بۆماوەی چەند سەد ساڵێك بەهەمان شێوە گەلانی ستەمکار پەیدا دەبوونەوەکە پێشتر پێغەمبەران لەناویان بوون و ماندووبوونیان لەگەڵ دەچێژان.

بۆنموونە ماوەی چەند سەدەیەك گەلی وادەهاتە دنیا پەنای دەبردە بەر کاری بێشەرعیی و بەد ڕەوشتی و مەی خواردنەوە و داوێن پیسی، بەرلەهاتنی پێغەمبەری ئیسلامیش لەنیمچە دوورگەی عەرەبیی خەڵکانی واهەبوون بەردوداریان ئەپەرست و کڕنووشیان بۆ بتی بێ گیان ئەبرد و کچەکانیشیان زیندە بەچاڵ دەکرد !!!...کە حەزرەتی موحەممەد دروودی خوای لەسەربێت هاتە دنیا و خوای گەورە بەپێغەمبەر هەڵیبژاردئەو جۆرە دیاردە نەشیاوو پڕلەتاوانانەی نەهێشت و قەلاچۆی کرد و وای کرد کەخەڵکەکەهەر هەمووی ڕوولەئایینی ئیسلام بکەن کەدوایین ئایین و ڕێبازی ژیانە بۆ مرۆڤەکان، پێغەمبەرانی تریش هەروەکوپێغەمبەری ئێمە وابوون و ڕەنجیان کێشاوەو ماندووبووینە بەدەست گەلە ستەمکارەکانیان.

هیچ گەلێك لەسەر ئەم زەوییە نەبووە کەخوای گەورە پێغەمبەری بۆنەناردبێت و هەموو گەلانی سەررووی زەوی

لە پێغەمبەران بێبەش نەبووینە و بەزمانی خۆیان خوای گەورەبۆگەلەکانی خۆیانی ناردوون، هەرهەمووشیان یەك هەڵوێست و یەك داخوازییان لەگەلەکانیان ویستووە ئەویش تەوبە و ئیستغفار و ڕوولەخواکردن و هیچی تر ... بەردەوام لەگەڵ گەلەکانیاندا بووینە و تادوایین هەوڵ لەگەڵیان بووینە ولێیان جیاواز نەبوونەتەوە، ئەوەندە خەمخۆری گەلەکانیان بووینە و بەردەوام لەگەڵ خەم ونارەحەتییەکانیاندابووینە، سەیری ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی موسابکە چەندە خەمی بەنی ئیسرائیلیەتی و چاونەترسانە و بێباکانە ڕووبەڕووی گەورەترین و زاڵمترین و ستەمکارترین کەس دەبێتەوە کەئەویش فیرعەونە و داوای لێدەکات چیتر بەنی ئیسرائیل نەچەوسێنێتەوە و وازیان لێ بهێنێت و دواتر هەرهەموویان کەژمارەیان شەش سەد هەزار کەس دەبێت لەژێرچنگی فیرعەون رزگاریان دەکات.

بەلاّم لێرەوە دەبێت پێغەمبەران لەیەکتر جیابکەینەوە، بەومانایەی دووجۆر پێغەمبەر هەبووینە )نبی و رسول ( واتە هەمووپێغەمبەرێك ڕەسول نەبووە و هەموو ڕەسوڵێکیش نەبییە، ڕەسوڵەکان پێغەمبەر بووینە و خاوەن پەیامێك بووینە کخوای گەورە بەهۆی ئەوەوە بۆگەلانی ناردووە، ئەگەر پێغەمبەرێکی ڕەسول وەفاتی فەرمووبێ ئەوا خوای گەورە نەبییێکی بۆ گەلەکەی ناردووە کەلەناویاندا ژیاوە و نەبییەکە پەیامی ئەو پێغەمبەرەی جێبەجێکردووە و جارێکی تر ئاگاداری کردوونەتەوە، واتە لەسەر شەرع و بەرنامەکەی ئەو ڕەسوڵە ڕۆیشتووە کەوەفاتی فەرمووە و لەناو گەلەکە نەماوە، هاوەلاّنی پێغەمبەر پرسیارلە پێغەمبەری پێشەوا دەکەن کە ئایا چەند پێغەمبەر هەبووینە؟ پێغەمبەری پێشەواش دروودی خوای لەسەربێت دەفەرمووێت : سەد و بیست و چوارهەزار پێغەمبەر هەبووینە، و سێ سەد و پانزەیان ڕەسولن و ئەوانی تر نەبی بووینە، بەلاّم بیست و چوار پێغەمبەر لە پێغەمبەرەکانی خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەناویان کراوەو ناویان هاتووە، لەناو ئەو سێ سەد و پانزە پێغەمبەرەش پێنجیان ئولولعەزمن کە ئەوانیش حەزرەتی ) نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا و موحەممەد( ن، سەلامی خوای گەورەیان لەسەربێت، بۆچی پێیان دەوترێت ئولولعەزم ؟ لەبەرئەوەی زۆر ئارامگر و بەهیممەت بووینە لەناو گەلەکانیان و زۆریش بەدەست گەلەکانیان ماندووبووینە و ئازاریان چەشتووەو بەدرێژایی تەمەنیان دەربەدەربووینە وشاری خۆیان جێهێشتووە.

شتێك هەیە لێرەوە جێی خۆیەتی ئاماژەی پێبدەین کەئەویش ئەوەیە ئەگەر خوای گەورە هێزی وای نەداوەتە پێغەمبەرەکانی تاوەکو لەگەڵ ستەمکارەکان بەشەڕبێن، بەلاّم موعجیزاتی زۆری پێداون و شتێکی زۆر گەورەتری پێبەخشین کەئەگەر تادوایین هەوڵ لەگەڵ گەلەکانیان بوونایە و ئەوانیش گوێڕایەڵیان نەکردبان، ئەوا هێز و وزەی دەستیان نزاو پاڕانەوەبووە لەگەلەکانیان و خوای گەورەش دەستبەجێ گیرای دەکرد و بەهۆی نزای ئەوپێغەمبەرانەوە گەلەکانیان لەناوئەچوون و لەزەوی ڕۆ دەچوون، هەر بەنزاای پێغەمبەری ئێمەیە کە زۆربەمان کەئوممەتی ئەوین دەچینە بەهەشتەوە، ئەوەتا لەشەوی ئیسراو میعراجدا کاتێك پێغەمبەری خوا دەچێتە خزمەت خوای گەورە لەئاسماندا حەزرەتی موسا دەبینێت و حەزرەتی موساش دەگرێیت، کاتێ پێغەمبەری پێشەوا دەچێتەلای و لەهۆکاری گریانەکەی دەکۆڵێتەوە، حەزرەتی موسا دەفەرمووێت : بۆئەوە ئەگریم کەزۆربەی ئەوکەسانەی دەچنە بەهەشتەوەلە ئوممەتەکەی تۆن و ژمارەیان لەهەموو ئوممەتەکانی تر زیاترە، هەتاوەکو لەهەندێ ڕیوایەتتدا هاتووە کە حەزرەتی موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت تەمەنناى کردووە لە ئوممەتەکەی پێغەمبەری پێشەوابێت.

بۆیە هەردەم پێویستە ئێمە سەرلەکڕنووش و سوژدە دابین و سوپاسی خوای گەورە بکەین کەلە ڕێزی ئوممەتەکەی پێغەمبەری ئازیزداین، سەیری ئەو هەمووگەلەی پێشوو بکە و ژیانی گەلانی پێغەمبەرەکان بخوێنەوەکەچۆن بەهۆی

تاوان و گوناهەکانیان ئەچنە دۆزەخەوە، گەلی نوح چەندە ستەمکار و زاڵم بوون رۆژی واهەبووە بەهەموویان بەرئەبوونە گیانی حەزرەتی نوح و لێیان ئەدا بەدارو بەرد تادەگەیشتە ئەو رادەیەی ئەبوورایەوە و بیٚ هۆش دەبوو و کەسێك لەوباوەڕەدانەبوو کەجارێکی تر هەناسە بداتەوە و بژییێت، یاخود حەزرەتی یەحیا چۆن سەردەبڕدرێت و حەزرەتی زەکەریاش چۆن و بەچ شێوەیەك بەمشاردەکرێتە دوولەت و دەبڕدرێتەوە!!!..

لێرەوە دەبیٚ بەراوردێك لەنێوان ) قصە و قصص ( بکەین، هەموولایەك دەزانێت یەکەمیان بەمانای چیرۆك دێت بەلاّم دووەمیان ماناکەی وەکو ئەو نییە و مانای ئەوەیە واتە شوێنکەوتن ) إقتص اثره (واتە شوێن پێی ئەو هەڵئەگرێت، و پێغەمبەریش شوێن پێی ئەو هەمووپێغەمبەرە هەڵئەگرێت خاوەنی یەك دروشمن کەئەویش ] إن اريدُ الا الاصلاح مااستطعت وماتوفيقي الابالله عليه توكلت و إليه أنيب[ ، جگەلەوەی هەر هەموو پێغەمبەران لەمناڵی تاوەکو دواساتەکانی تەمەنیان پاك بووینە و ئەمین بووینە و مەعسومیش بووینە لەهەمووگوناهێك، پاکییەکەی بەمانای ئەوەی خیانەتیان لەکەس نەکردووە، وەکو حەزرەتی یوسف چۆن خۆی پاراست و نزیکی زولە یخا نەکەوت یاخود حەزرەتی موسا کاتێك ئاودەداتە دووکچەکەی حەزرەتی شوعەیب، ئەمین و دەستپاکیشیان وەکو ئەوەی دەستیان بۆ سامانی کەسێك نەدەبرد و تەنانەت بێباوەڕو جولەکەکان پارەو ئەمانەتیان لای پێغەمبەری پێشەوا دادەناو بۆی هەڵدەگرتن بەبیٚ ئەوەی دەستی بۆببات.

پێغەمبەران کە خوای گەورە هەڵیبژاردوون و بۆ گەلانی ستەمکار ڕەوانەی کردوون، هیچ خاڵێکی لاوازیان تیا بەدی نەکراوە و نەبینراوە، بێباوەڕەکان بەردەوام بەدوای خاڵێکی لاوازی ئەو پێغەمبەرانەدا گەڕاون و نەیاندۆزیوەتەوە، چونکە هەر لەمناڵییەوە فیترەیان پاك بووە وڕابردوو و ئایندەشیان بەهەمان شێوە، چونکە ئەگەر لەم رۆژگارە کەسێکی چاك جێی متمانە و دەمڕاستی خەڵك بێت و خاڵێکی لاوازی لیٚ بەدی بکرێت ئابڕووی دەچێت و ناتوانێت جارێکی تر قسە بۆخەڵك بکات و ببێت بەدەم ڕاستیان، لەماڵەوەش هەربەهەمان شێوە ئەگەر کوڕێك لەماڵەوە هەرچەندە نوێژبکات و ئیماندار و گوێڕایەڵ بێت بەلاّم ئەگەر خاڵێکی لاوازی هەبێت لە سومعە و ڕەفتاریدا ئەوا چۆن لەناو ئەو ماڵەدا خوشك وبراکانی تری دەیکەن بەپێشەنگ و قودوە و چاوساغ و ریٚ نیشاندەری خۆیان لەهەمووکاروبارێکی ژیان، بەلاّم سەرجەم پێغەمبەران وانەبوون و هەرهەموویان پاك بووینە و موعجیزەیەك بوون لەدەستپاکی و راستگۆیی بەر لە پێغەمبەرایەتی و لەکاتی پێغەمبەرێتیشدا تەنانەت حەزرەتی جبریلیش ئەمینە ) نزلت به روح الامين.(

بەختەوەری ژیان:

ئێمە لێرەدا بۆ باسی پێغەمبەران دەکەین ؟ چونکە ئەوان بەختەوەر ترین کەس بووینە و لەهەمووکەسێکی تر خۆشحاڵ تربوون و تەمەنناشیان کردووە گەلەکانیان وەکو ئەوان بەختەوەر بن، سەرکەوتووترین کەسی سەر رووی زەوی بووینەو رۆژێك لەرۆژان بێزاری ڕووی تێنەکردوون و ناسوپاسگوزارییان نەکردووە ]لقد كان في قصصهم عبرة لاولي الالباب [ هەرهەموویان خاوەنی ئەقڵ و کەمال بووینە و نوقسانییان نەبووە و سەرکەوتووبووینە، ئەگەر کەسێك لەم رۆژگارە داهێنەرترین کەس بێت لە ڕووی ئامێر و پێشکەوتن و لەولایشەوە مانای ژیان نەزانێت و نەزانێت ئاخیرەتی چییەو بۆبەهەشت ئەچێت یان جەهەننەم، ئەوا بێگومان ژیانێکی گیانەوەرانە ئەباتەسەرهەرچەندەی داهێنەر وپسپۆڕ و زانستخواز بێت، بەلاّم ئەگەر کەسێك وەکو ئەو داهێنەر بێت و لەگەڵ ئەوەش باوەڕی بەمردن وژیانەوە و جەهەننەم وبەهەشت هەبێت زۆر لەو چاکترە و زانستەکەی بەرەکەتدارترە و سەرکەوتووترە.

بەهۆی ئەو پێغەمبەرانەوە خوای گەورە دەناسین و بەهۆی ئەوانە ئێمە خاوەن عەقڵ و خاوەن جەستەیەکی ڕێکین، بەهۆی ئەوانیشەوە ڕێگەی بەختەوەری دەگرینە بەر، بۆیە پێویستیمان بەوە هەیە ڕێی ئەوان بگرینە بەر و دەسبەرداری نەبین، لای هەمووانیش ڕوون و ئاشکرایە ئەوان فەرمانی خوایان بەجێگەیاند و ئێمەشیان فێر کرد کەوەکو ئەوان بین و وەکو ئەوانیش تام و لەزەتی ئەم ژیانە بکەین و بێزاری خۆمان لەوژیانە نەخەینە ڕوو، و بەردەوام سەرمان لەکڕنووش دابێت و تەسبیحات و ئیستغفاری خوای گەورە بکەین، هیچ پێغەمبەرێك لەگەلەکەی دانەبڕاوە و نەچوونەتە ئەشکەوتێك و سووچێکی پەرستگا و بڵێن من جێگام بەهەشتە و میللەتەکەشم ئارەزووی خۆیەتی، نەخێر وانەبوون و بەردەوام لەگەڵ گەلەکانیان دابووینە و ڕێنماییان پێ بەخشیون و لەخراپە و چاکەکان ئاگاداریان کردوونەتەوە و نەیانهێشتووە بەرەو کوێرایی و تاریکە ڕێگەکان هەنگاو بهاوێن و گومڕابن.

چەندە لەلایەن دەسەلأتدارانی گەلەکانیانەوە ئەزیەت دراون و ترسێنراون بەلأم ئەوان باکیان نەبووە و خۆڕاگربووینە و لایان ڕوون و ئاشکرابووە کەوا خوای گەورە و میهرەبان پشتیوانیانە و هەرخۆیشی سەریان دەخات، بەلأم ئەو پێغەمبەرانە گەرەکیان بووەژێردەستەی ستەمکاران ڕزگاربکەن و نەیەڵن بکرێن بەکۆیلە و بەندە و چەوساوە لەهەمان کاتیش چاونەترسانە چوونەتە کۆشك وتەلاری ستەمکاران کەبەرەو هیدایەت بێن وبابەس بێت ستەم وزوڵم لەمرۆڤە لاوازەکان و ژێردەستەکانیان..

لێرەوە پێویستیشە بزانین کەهەر پێغەمبەرەو بەجۆرێك لەلایەن خوای گەورەوە تاقیکراوەتەوە، پێغەمبەرهەیە بەنەخۆشی درێژخایەن تاقیی کراوەتەوەوهەیشە بەمناڵ نەبوون و یاخود تا گەیشتوون بە پلەی شەهادەت، بۆچی خوای گەورە هەواڵی ئەوهەموو پێغەمبەرەی بە پێغەمبەری ئازیزمان گەیاندووە؟ بۆئەوەیە ) ما نیبت بە فۆادك ( تاوەکو دڵەکەی ڕاگر و خۆڕاگربێت بەرامبەر بەو هەموو ئەزیەت وتەنگ و چەڵەمەیەی کەلەژیانیدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە، هەروەها جگەلە پێغەمبەریش هەواڵێکە بۆ هەموومرۆڤێك و پێویستە پەند و عیبرەتی لێ وەربگرن، بەلأم ئەگەر کەسێك غافڵ بێت و گوێی پێنەدات ئەوا کەسێکی خەسارەت مەندە و دڵەکەی خۆڕاگر نییە، پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلّم دەفەرمووێ :ڕۆژگارێك دادێت ئایینی ئیسلام لەناو خەڵکیدا دەبێت بەنامۆ بەلأم کەسانێك هەن دەست بە ئایینەکە دەگرن و پارێزگاری لێدەکەن و لەهەوڵی بەرزکردنەوەیدان و پاداشتی ئەو جۆرە کەسانە وەکو پاداشتی پلەی شەهیدێکە.

پێغەمبەران هەتا دوایین ساتەکانی ژیان خۆڕاگربوون و کۆڵیان نەداو لەهیچ شتێك نەترسان، هەموجۆرە تاوان و ناوزڕاندنێکیان بەرامبەر بەکارهات و بەشێت و جادووگەر و سەرلێشێواو لەقەڵەم دران کەچی ئەوپێغەمبەرانە هێشتا خۆڕاگربوون و ساردبوونەوە ڕووی تێنەکردن، پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران کە ئەویش حەزرەتی یوسفە خۆی لەکاری بێ شەرعیی پاراست و نزیکی نەکەوت لەوکاتەی زولەیخای خێزانی عەزیزی میسر دەرگاکانی لەسەردادەخات و بەرۆکی دەگرێت ...یاخود حەزرەتی ئیبراهیمی باوکی پێغەمبەران چەندە ئارامگرە لەوکاتەی دەیخەنە ناوئاگرە گەورەکە بە تۆمەتی شکاندنی بتی موشریك و خوانەناسەکان، هەروەها سەیری جورئەت و غیرەتی حەزرەتی ئیسماعیلی نەوجەوان بکە کەلەژێر چەقۆکەی باوکیدایەو دەفەرمووێت ) یا أبتی إفعل ماتۆمر ..( ژیانی حەزرەتی ئەیوب بخوێنەوە کە بۆ ماوەی هەژدە ساڵ لەناوجێگا ئەکەوێت و گۆشتی لەشی لەئێسقانەکانی هەڵئەوەرێت کەچی ڕۆژێك لەڕۆژان ناشوکرییێك لەزاری دەرنەچوو، بۆیە پێغەمبەری ئازیزمان دەفەروویەتی ) الانبیاءِ اشّدُ بلاءا ( پێغەمبەری واهەبووە ژنەکەی لەگەڵی نەبووە و بێ باوەڕبووە و یاخود کوڕەکەی لەڕیزی موشریکەکان بووە ئەوەتا حەزرەتی نوح ژنەکەی و کوڕەکەی بێباوەڕبووینە و حەزرەتی لوتیش ژنەکەی بەهەمان

شێوە و دواتر خوای گەورە لەگەڵ موشریك و بێباوەڕەكان لەناوی بردوون.
بۆیە پێویستە لەسەرهەموومان زووبەزوو ئاوڕێك لەژیانی ئەو پێغەمبەرانە بدەینەوە و شارەزای ژیانیان بین و لێی وردببینەوە كەچەندە واقیع بینانە بەرەو ئەهامەتییەكانی سەردەمەكەیان چووینە و ئەزیەت دراون، وەرە و سەیری ژیانی هاوەڵانیش بكە ئەوەتا عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود ڕەزای خوای گەورەی لێبێت كەكاتێك سورەتی پیرۆزی یاسین لەلایەن خوای گەورەبۆپێغەمبەرەكەی دابەزی دەچێتە سەربانی كەعبە و بەدەنگی بەرز ئەیخوێنێتەوەو باكی لەهیچ كافرێك نییە، كەقورەیشیە موشریكەكان گوێیان لێدەبێت بەهەموو هێزیانەوە دەكەونە گیانی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود تاوەكو لەهۆش خۆی دەچێت و دەبووریتەوە،هاوەڵێكی لەوشێوەیە كەجەستە و گیان و قاچەكانی لەڕادەبەدەر لاواز بوون پێغەمبەرلەبارەیەوە فەرموویەتی قاچەكانی لەكێوی ئوحود بەهێزترن!!!...
لەوكاتەی ئەو هاوەڵە بەڕێزەبەهۆش خۆی دێتەوەپێغەمبەرپرسیاری لێدەكات كەبۆچی واتكرد؟ دەفەرموویت ئەی پێغەمبەری خوا جارێكی تر و چەندین جاری تریش ئامادەم ئەو دیمەنە دووبارەبكەمەوە، دەزانی ئەو هاوەڵەوسەرجەم هاوەڵانی تر بۆ بەو شێوەیە خۆڕاگربوونە چونكە ژیانی پێغەمبەران و ئەوئیماندارانەیان خوێندۆتەوە كەبەرلەوان ژیاون و بەهەموو شێوەیەك ئەشكەنجە و ئازار دراون، ڕۆژێكیان پۆلێك لەهاوەڵان دێنە خزمەت پێغەمبەری ئازیز و پرسیاری لێدەكەن ) متى نصرالله يارسول الله ( دەردە دڵی خۆیان لای پێغەمبەرەكەیان ئەخەنە ڕوو كەتاكەی ئەو هەموو ئەزیەت و ناڕەحەتییە و كەی ڕزگاریان ئەبێت و كەی كاتی سەركەوتن بەرەو ڕوویان دێت ؟ پێغەمبەریپێشەواش پێیان دەفەرموێت بەرلە ئێوە و لەڕۆژگارەكانی پێشوو باوەڕداری واهەبووە لەسەریەوە تاوەكو خوارەوەی بەمشار كراوەتە دوولەت تەنها بۆئەوەی لەباوەڕەكەی پاشەگەزبێتەوە، كەچی پەشیمان نەبۆتەوە و سوورتربووە لەسەر باوەڕەكەی...
بەڵام مخابن بۆگەنجانی ئەم ڕۆژگارەی خۆمان كوا خۆڕاگری؟ كچی واهەبووە چۆتە كۆلێژ و پەیمانگا لەبەرخاتری خۆشەویستەكەی لەچكی سەری لاداوە و پەشیمان بۆتەوە، یاخود گەنجی واهەبووە لەبەردڵی كچێك نوێژو ڕۆژووی تەرك كردووە و وازی لەعیبادەت هێناوە!!!.ئایا ئەمە خۆڕاگرییە؟ نەخێر ئەمە خۆهەڵخەڵەتاندن و لەدەستدانی خۆڕاگری و سەباتەكەیەتی لەسەر ئایین، چەندە خۆڕاگرییە گەنجێك وەكو حەزرەتی ئیبراهیم بێت و باوكی بۆ باوەڕهێنان بانگ بكات، چەندە جوان وخۆڕاگرییە باوك كوڕەكەی بۆ نوێژی بەیانی بانگ بكات و نەهێڵێت بە ئاگری دۆزەخ بسووتێت، خەڵكانێك هەن بۆ پارە و پوول و سامان سوتاون و دینەكەیان بیرنەماوە و خۆڕاگرە بەرامبەر بە قازانج و زەرەری ڕۆژانە كەچی خۆڕاگرییەكی نییە سەربباتە كرنووش و شوكری نیعمەتەكانی خوابكات، چونكە ئەوەندە دنیاییەو لووت بەرزییەكەی ڕێگەی پێنادات سەر بۆخوای گەورە كەچ بكات و لاوازی و بێ دەسەڵاتی خۆی دووپات بكاتەوە.
باباوكان سەیری دیمەنی حەزرەتی نوح بكەن كەلەوكاتەی لافاو هەڵدەستێت و لەسەركەشتییەكەوەیە و كوڕە بێباوەڕەكەشی لەناو ئاودایە و خەریكە دەخنكێت و بۆی دەگریێت و بانگی دەكات كەوەرە لەگەڵما، بۆمردنی كوڕەكەی ناگرییێت بەڵكو بۆبێباوەڕییەكەی فرمێسك ئەڕێژێت و داوای لێدەكات بێتە ڕیزی ئیماندارەكانی ناو كەشتییەكە، باباوكان وەكو باوكی حەزرەتی ئیبراهیم نەبن و دژی كوڕەكانیان هەڵس و كەوت بكەن كەئەگەر كوڕەكەت هاتووچۆی ماڵی خواو مزگەوت دەكات دەستخۆشی لێبكە و ئافەرینی لێبكە ودڵت خۆش بێت چونكە ڕێگای ڕاستی گرتۆتە بەر و كوێرە ڕێگاكانی نەگرتۆتەبەر.
چەندە باوك هەیەلەم ڕۆژگارەی ئێمەدا دژی ئەوەیە كەكوڕەكەی هاتووچۆی مزگەوت دەكات؟ لای وایە كوڕەكەی

سەرلێشێواوو کەسێکی توندڕەوی لێدەردەچێت !!!..بەلاَم نەخێر ئەوگە نجەی هاتووچۆی مزگەوت دەکات کەسێکی ڕەوشت بەرز و ئیماندارە نەوەك سەرلێشێواوو توندڕەو، چونکە ئیسلامەکەی فێری کردووە ڕێزی خەڵکان بگرێت و نەرم ونیان بێت و پەنا نەباتە بەر توندو تیژی و ڕق و کینە، هەروەها ژیانی پێغەمبەرانی خوێندۆتەوەکە وەکو ئەوان خۆڕاگر بێت، خۆڕاگرییەکەی وەکو خۆڕاگرییەکەی حەزرەتی ئیسماعیل و حەزرەتی یوسفە، کەئەویش ڕەمزی ملکەچی وبەندایەتییە بۆخوای گەورە و میهرەبان، بۆیە پێویستە گە نجەکا نمان ملکەچیی ئەو بەندایەتییە بن و ڕێزی باوکیان لەبەرچاوبێت، پێویستە باوکانیش وەکو حەزرەتی نوح بن و نەیەڵن ڕۆڵەکانیان نوێژەکانیان بچێت و تەرکیی ملکەچی و بەندایەتییە بۆ خوای گەورەو میهرەبان بۆیە پێویستە گە نجا نمان مالکەچی ئەو بەندایەتییە بن و ڕێزی باوکیان لەبەرچاوبێت.

ئاما نجێکی تری ژیانی پێغەمبەران ئەوەیە ] لقد كان في قصصهم عبرة لاولي الباب [ ئەگەرمن پەند و عیبرەت لەچیرۆك و بەسەرهات و ژیانیان وەرنەگرم کەواتە هیچم نەکردووە و ناشتوانم شتێك بکەم، ئەگەر عیبرەت و پەند لەژیانیان وەربگرم ئەوا کەسێکی سەرکەوتوو و خۆڕاگرم .هەروەها یەکێك لەئاما نجەکانی ئەوپێغەمبەرانە ] اولئك الّذين هدى الله فبهداهم اقتديه [ خوای گەورە هەڵیبژاردن و هیدایەتی دان وبوون بە پێشەنگ و قودوەی هەموو کەسێك وهەموو گەلێك، کەواتە پێویستە ئێمەش بیانکەین بە پێشەنگ و چاویان لێبکەین، تۆش گەردەتەوێت ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست بهێنیت و بەهەشتە پان وبەرین ونەبڕاوەکەی مسۆگەربکەیت ئەوا سەرجەم پێغەمبەران بکەبە پێشەنگ و سەرقافڵەی خۆت و خەڵکانیش حاڵی بکە کە هەرئەوان بکەن بەچاوساغ و سەرمەشقی خۆیان، پێویستە لەقوتا بخانەش مامۆستایان بەوپەڕی بەرپرسیارێتیەوەئەم چیرۆك و بەسەرهات و پەند وعیبرەتانەی پێغەمبەران وەك ئەمانەتێك بە قوتابیەکانیان بگەیەنن و حاڵیان بکەن لەژیانیان، باسی سەردەمی منالّی حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی عیسا و حەزرەتی یوسف و حەزرەتی زەکەریا و حەزرەتی موحەممەد سەلامی خوایان لێبێت بۆ قوتابیەکان بگێڕنەوە، با ئەوانیش ژیانی ئەو پێغەمبەرانە شارەزابن و بیزانن.

شارستانیەت و بنیاتنان:

خاڵێکی تر لەئاما نجەکانی پێغەمبەران ئەوەیە کە ڕۆڵیان بینیوە لەبنیاتنانی کۆمەڵگە و دروستکردنی ژیار و کلتوور، بۆ ئەم کارە و سەرکەوتنی لەژیاندا ئەم دروشمە بکە ئاما نجت وەکو حەزرەتی ئیبراهیم ] حسبي الله ونعم الوكيل [ بۆ سەرخستنی کاروبارەکانی ژیانت تەنها ئەو دروشمە و پشت بەستن بەخوای گەورە بکە سەرمەشقی ژیانت، چونکە ئەو پێغەمبەرانە بوونە مایەی بونیاتنان و دامەزراندنی ژیار و کۆمەڵگا و خەڵکانیان خستە چوارچێوەی خێزان وڕێزگرتن و خۆشەویستی و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی.

خاڵێکی دیکەی ئاما نجەکانی پێغەمبەرانی خوا ئەوەیە کەلەوانەوە فێربووین چۆن وبەچ شێوەیەك خەڵکان بەرەو هیدایەت و دینداری بانگ بکەین، بەلاَم ئایا تەنها کاری پێغەمبەرانە کەئیسلاَحی خەڵکی بکەن و بانگەواز بکەن ...؟ نەخێر ... ئێستاکە هیچ پێغەمبەرێك نەماوەو تەنانەت حەزرەتی موحەممەدی سەرداری پێغەمبەرانیش لەناومان نەماوە تائیسلاَحی خەڵکی بکات، خۆ ئێمە لەسەرەتاوە ئاماژەمان بەوەکرد کەخوای گەورە لەکاتی دروستکردنی یەکەم مرۆڤ کەئەویش حەزرەتی ئادەم بوو سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت فەرمووی ] إني جاعل في الارض خليفة [ خوا فەرمانی دەرکرد کەدەبێت کەسێك لەسەرزەوی ببێتە جێ نشینم و کاروبارو فەرمان و بڕیار و یاساکانم بەخەڵکان بگەیەنێت، ئێمە، من، تۆ، هەرهەمووکەسێك لەئاستی خۆیەوە بەرامبەر بەم جێ نشینە بەرپرسیارەو، دەبێت بانگەوازی خەڵکی بکات بۆ ڕێی هیدایەت و ئیسلامەتی.

گەنجێك کەلەتاوان و گوناهدا ڕۆچووە کێ ڕێنمایی بکات و ئاگاداری بکاتەوە؟ ئایا پێغەمبەر بێتە خەونییەوە و ئاگاداری بکاتەوە و بەرەو ڕێی هیدایەت بانگی بکات ؟ ئەمە ئەرکی سەرشانی ئەو گەنجەیە کە هاوڕێیەتی و دراوسێیەتی و خزمەیەتی، ئەرکێکە بەسەرییەوەکەدەبێت بەردەوام لەگەڵیدابێت و دەسبەرداری نەبێت تاوەکو واز لەتاوان و گوناهەکە دەهێنێت، مەڵێ ئەمە کاری من نییەو دەستم بەکلاوەمەوە گرتووە و تاوەکو با نەییات، ئەم وتەیە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە کەڕۆژانە لەدەمی سەدان گەنج دەردەچێت، چونکە هەمووماں بەرپرسیارین لەگەیاندنی شەرع و پەیامی ئیسلامیی پیرۆز بەهەمووخەڵکان، ومەڵێ ئەوە فەرمووده و قورئان ئامادەیە و بەس تۆ ئەگەر ڕاڤەیەك لە ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دەزانیت بیدرکێنە و بادەوروبەرت سوودی لێوەربگرن چونکە هەزاران خێر و چاکەت بۆ ئەنووسرێت و دەبێت لەڕۆژی دواییشدا خوای گەورە چ پاداشت و خەلاتێکی بۆ ئامادەکردبیت کەببێتە هۆی ڕزگاربوونت لە ئازارەکانی ڕۆژی دوایی.

چاوساغی و پێشەنگی:

خاڵێکی تری ژیانی پێغەمبەران ئەوەیە، کەئەوان بوون بەقودوە پێشەنگ بائێمەش ببین بەقودوە و چاوساغی خەڵکی، چەندە جوانە کەسێك چاو لەکارو ڕەفتارێکی جوانی تۆبکات، کەسێك کەلەگەڵ خێزانەکەی خراپە و بەبەردەوام جنێوی پێدەدات و لەگەڵی لەبۆسەدایە و ئیدانەی دەکات، کەچی لەولایشەوەدراوسێیەکی هەیە وڕەفتاری لەگەڵ خێزانەکەی لەوپەڕی باشی و لوتکە دایە وحەز دەکات کە کەسە خراپەکەش وەکو ئەو بێت و ڕێزی خێزانەکەی بگرێت و هاریکاری بکات لەکاروبارەکانی ماڵەوەئەوا بێگومان بەهۆی قودوە و پێشەنگێتی ئەوەوە کەسە خراپەکەش چاك دەبێت و هیدایەت وەردەگرێت، بۆیە پێویستە هەموو کەس و گەنجێك لەهەموو شوێنێك و گەڕەکێك و فەرمانگە و دام ودەزگاکان قودوە و پێشەنگایەتی خۆی بسەلمێنییێت تاوەکو خەڵکانیش چاو لەو بکەن.

خاڵێکی تری ژیانی پێغەمبەران ئەوەیە کەئێمە بەهۆی ئەوانەوە لەو قورئانە ئەگەین و لێیەوە حاڵی ئەبین، ژیانی ئەوان عەمەلییەومەتەڵ وبەسەرهات وسەرگوزشتە نییە، چۆن مناڵ بەقسەی باوکی بکات؟ لەحەزرەتی ئیسماعیلەوە فێر دەبێت کە گوێڕایەڵی باوکییەتی، چۆن مناڵ ڕاستگۆبێت و درۆنەکات ؟ لەحەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی یوسفەوە فێردەبێت، یاخود گەنج بەچ شێوەیەك داوێن پاك بێت؟ لەبەسەرهاتەکەی حەزرەتی یوسف و زولەیخاوە، یاخود چۆن کەسێکی ئارامگر و شوکرانە بژێربیت؟ سەیری ژیانی حەزرەتی نو ح و ئەیوب و یونس و حەزرەتی موساو حەزرەتی موحەممەدبکە، چۆنیش ئافرەتێکی داوێن پاك و کچێکی ڕەوشت بەرز بم ؟ سەیری ژیان وبەسەرهات و ڕووداوەکانی مەریەمی دایکی عیساو بنەماڵەی ئالی عیمران و عائیشە و ئاسیادەکەم و دەیانکەم بەسەرمەشقی ژیانم.

چۆن ڕێزی خێزانەکەم بگرم و دڵی ئازارنەدەم و بەردەوام پێی نەڵێم ژن دەهێنم ؟ سەیری حەزرەتی ئیبراهیم دەکەم کەڕۆژێك لەڕۆژان دڵی خێزانەکەی نەهێشاند تاوەکو خێزانەکەی زۆری لێکرد کەژنی دووەم بهێنێت، چۆن ئافرەتێکی ئۆقرە گرو ئارامگر دەبم بەرامبەر بەمێردەکەم ولەکاتی نەخۆشیی و کەوتن لەسەرجێگا بەدیارییەوە دادەنیشم و کۆڵنادەم ودەچم لەبری ئەو کاسبی دەکەم و پارە و خۆراك پەیدائەکەم بۆئەوەی مێردەکەم هەست بەبێزاری و ناڕەحەتی نەکات؟ سەیری ژیانی حەزرەتی ئەیوبی ئارامگر دەکەم و دەیخوێنمەوە و پەیڕەوی ئەکەم.

بۆناشوکری نەکردن لەکاتی لەدەست چوونی ماڵ و مناڵ و سەروەت و سامانی زۆرو بێ شوومارچاو لەحەزرەتی ئەیوب دەکەم، کەژیانەکەی بخوێنەوە کەسێك نەبووە وەکو ئەو بازرگانێکی گەورە و ناودار و خاوەن سەروەت و سامان بێت کەچی لەپڕێکدا هیچی نەماو ڕۆیشت و چواردەمناڵیشی بەداوی یەکدا مردن !!!!... کەچی هێشتا شوکری خوای

گەورە دەكات و بەهۆی نەخۆشییەوە لەناو جێگادایە و سوپاس وستایشی خـوای گـەورە دەكـات و رۆژێـك لـەرۆژان ناشوكری ناكات و ئاخ و ئۆفێك هەڵناكێشێت، كەمن بازرگانم زیان و زەرەری زۆرم بەردەكەوێت و دەستمایە لەدەست ئەدەم ئەوا پێویستە چاو لەحەزرەتی ئەیوب بكەم و كەمناڵێشم مردهەرشـوكرانە و حەمـدی خـوای گـەورە بكـەم، سەرجەم پێغەمبەران بەوشێوەیە بوون و بۆ خوای گەورە ژیاون و بۆخوای گەورەش لەكۆشش دابوونە.

خاڵێكی تری ژیانی پێغەمبەران ) خێر بوون( د، ئەوان هەرهـەموویان مامۆسـتاو زانـستخواز و زانـست بەخـشن و لەلوتكەی پاك و بێگەردیش دابوونە و عابید ترین و زاهید ترین و خـۆڕاگرترین وبـەئارامترین كـەس بوونـە، زانستەكانیان بەتەنها بۆخۆیان نەبووەو بۆهەموو دەوروبەریان بووە، دنیاش وەكو ماراسۆنێك وایە و ئەو كاغـەزەی كەبەدەست راكەرەكەوەیە لەكاتی ڕاكردن دەیدات بەئەوەی تر، كەواتە ئەو پەیام ریسالەیەی پێغەمبـەرانیش كـە یەك دروشم بووە و وەكو یەك خاوەن یەك ئامـانج بـوون و بەیـەكتریان داوە و ئـەمڕۆش وەك میراتێـك بەدەسـتی ئێمەوەیە و دەبێت ئێمەش لەڕاستەخۆمانەوە بیدەین بەخەڵكانی تر و بەهەمووجیهانی بگەیەنین.

ئەوكاتە كەسێكی خۆڕاگر و بەئەمەك و خاوەن باوەڕێكی پتەوو بەتینین، بائێمەش پـەیام و راسـپاردەكانی ئـەو پێغەمبەرانە و بەتـایبەتی تر پێغەمبەری پێشەوا موحەممەد درودی خوای گەورەی لەسەربێت كە دوایین پێغەمبەری خوایە بەئەمانەتەوە بە هەمووكەسێكی بگەیـەنین و بانگـەوازی بۆبكـەین و بێگومـان لـەوكارەش خـوای گـەورە و میهرەبان پشـــــــــــــتیوا نمان ئەبێت....

* *

**سەرەتـای بوونەوەر:**

هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (29) وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ (30) وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ فَقَالَ أَنْبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلَاءِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (31) قَالُوا سُبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (32) قَالَ يَا آدَمُ أَنْبِئْهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ فَلَمَّا أَنْبَأَهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ (33) وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ (34) وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ (35) فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ (36)فَتَلَقَّى آدَمُ مِنْ رَبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (37) قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (38) وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ..(39) البقرة

بێگومان كە خودای گەورە زەوی و ئـاسمانەكانی دروستكرد وای كرد كۆمەڵێك پێغەمبەر بۆ گەلان بنێرێت بۆ ئـەوەی

هۆشیاری ببەخشن بە گەلەکانیان و لە بڕیار و ڕاسپاردەکانی خودا وریایان بکەنەوە . ئاشکراشە کە خودای گـەورە سەد و بیست و چوار هەزار پێغەمبەری ناردووە بۆکۆمەڵە گەلێك کە یاخیی بوون و لە فەرمانەکانی خودا دەرچوون..
مرۆڤ لێرەدا دەکەوێتە بیر کردنەوە کە ئەم نێوانەی پێغەمبەرانە ئەوەندە ساڵە بووە ئەی چۆن یەك ڕاو یەك پەیام بووینە ؟ چۆن وەکو یەکتر داوای یەك شتیان کردووە کە ئەویشیان یەکتاپەرستی و خۆ بەدوور گرتن بووە لە هەموو جۆرە هاوبەشی پەیداکردنێك بۆ خودایەك کە هەموو گەردوونی دروست کردووە و هەرئەوییش ئەم هەموو خەڵکەی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون....
ئەم پێغەمبەرانە ئەوەندە حەکیم و عەلیم و بەخشندە و میهرەبان بووینـە تەنانـەت زۆر خـەمخۆری گەلـەکانیان بووینە و بە بەردەوام لەگەڵ گەلاکانیان دابووینە بۆ ئەوەی بێنە سەر ڕاستە ڕێ و دوورکەونەوە لـەڕێگای جـەهل و نەزانی و تـاریکیی.
پێغەمبەران هەر هەموویان وەکو ئێمە مرۆڤ بووینە و فریشتە نەبووینە و تـەنها وەحیـی خودایـان بـۆ هـاتووە ، سەرەتا با لە دروست بوونی ئەم بوونەوەرە دەست پێبکەین و بزانین چۆن هاتە بوون و چۆن دامەزرا ؟ زانایان دەڵێن :ئەم گەردوونە لە سەرەتادا لە غازێك پێکهات و دواتر تەقیەوە ، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەم کۆمەڵە غازە لە کوێوە هات ؟ قورئان باسی کردووە ئەم کەونە هەمووی لە سەرەتادا لە دووکەڵ پێکهاتووە واتا ) دخان ... ( تەقیوەتەوە و ئەم گەردوونەی لێ هاتۆتە بوون ، شاندێك لە یەمەنەوە دێنە لای پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم و و تیـــــــــان ) :نسألك عن اول هذا الامر ( پێغەمبەریش پێی فەرموون ) كان الله ولم يكن له شيء..(

پرسیاری سەرەتای دروست بوونی بوونی دنیایان لە پێغەمبەر کرد و حەزرەتیش پێی فەرموون تەنها خودا هەبوو و هیچ شتی تری لەگەڵدا نەبوو ، نە عەرش نە فریشتەکان و نە جنۆکە و نە پێغەمبەران . ئنجا فەرمووی ) كـان الله ولم يكن شيئا قبله ..( کەواتە هوالاول ... هو الاخر .. هو الظاهر ... هو القاهر .. هو الباگن...
بەیەك نەفخە و بە بڕیارێکی خوای گەورە ئەم کەونە هاتەبوون و بەیەك نەفخەش هەموو گـــــــــــــەردوون لە ناو دەبات ] فإذا نفخ فيه نفخة واحـدة [ ، ئا بەم شێوەیە و بە فەرمانێکی خودای گەورە ئەم بوونـەوەرە هاتـە بوون ، ئەوەتا ڕۆژێکیان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەسەر مینبەری پیرۆزی باس لە سەرەتای دروستبوونی ئـەم کەونە ئەکات و لە ئەنجامدا مینبەرەکەی لە ژێر پێیە پیرۆزەکانی دێتە هەژان .. خودا خۆی لە قورئانی پـیرۆزدا فەرموویەتی ] وهو يبدئ الخلق ثم يعيده[
هاوەڵێك پرسیارێك لە پێغەمبەری پێشەوا ئەکات ) يارسـول الله ايـن كـان الله قبـل الخلـق ؟؟ ( پێغەمبـەرمان فەرمووی ) كان الله في عمى لاشيء معه ( واتە خودا شوێنی دیاریکراوی نەبووە و هیچ شتێکی لەگەڵ نەبووە و عەقڵ پەی پێ نەبردووەو هەرخۆی دەسەڵاتدار بووە بەسەر هەموو شتێك ، لێرەدا شەیتانی لەعین زۆر زەفەر بۆ مرۆڤەکان دێنێت لەبارەی بوونی خودا و چۆنیەتی دروستبوونی ئەم مەخلۆقاتە بەتایبەتی تر بۆ ئەو کەسەی تازە گەڕاوەیە و ڕوو لە شەرع و بەرنامەی خوا دەکات بۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمان فەرموویەتی خۆتان لەم بیرکردنەوانـە بـە ) زیکـــــــر و لااله الا الله ( بپارێزن و واز لە بـیر کردنــەوە بێـنن ، بـەم زیکـرە زەفـەری شـەیتان لێتـەوە دوور دەکەوێتەوە و وازت لێدەهێنێت "کەواتە مرۆڤ نەیتوانیوە $1\%$ ی دروستکراوەکان پەی بەرێت چ لەناخی خـۆی و چ لە دروستکراوەکان، ئەی کەوابێ چۆن لەگەورەیی پەروەردگار بگات ؟..
]هل اتى على الانسان حين من الدهر لم يكن شيئا مذكورا [ تۆ سەیرکە ئەوانەی پێشی ئێمە چیبیان بەسـەر هـات

یاخود تۆی مرۆڤ سەد ساڵ بەر لە ئێستا هەربوونت نەبووە لەسەر ئەم زەوییە کەواتە کێ خالیقی تۆیە ؟ بێگومان الله جل جلاله ، با بشزانین کە یەکەم شت خودا دروستی کردبێت عەرشی خۆی بووە ، عەرشی خودا کەس نازانێت چۆنە گەورەییەکەی لە رادەبەدەرە ئەوەتا پێغەمبەری پێشەوا وەسفێکی ئاسمانەکان دەکات کە تەبەقەی یەکەمی ئاسمان لە چاو تەبەقەی دووەم وەکو ئەڵقەیەك وایە کە لە بیابان فڕێی بدەیت و دووەمیش لەچاو سێیەم هەروا و چوارەمیش لە چاو پێنجەم بە هەمان شێوە و شەشەمیش لە چاو حەوتەم تەبەقەی ئاسمان هەروەها .. تەبەقەی حەوتەمی ئاسمان لە هەموو ئاسمانەکانی تر زەبەللاحترو گەورترە ، و هەر حەوت تەبەقەی ئاسمانیش لە چاو عەرشی خودا بەهەمان شێوە بەقەد ئەڵقەیەکن کە لە بیابان فڕێی بدەیت !!! پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ دەفەرمووێ ] وما العرش في كف الرحمن الا كحبة في السماء [ زانیت چەندێك قەبارەت هەیە و بەرامبەر ئەم بوونەوەرە گەورەیە چەندێکی، چۆن ئەوێریت بەقسەی نەکەی و بگرە هەندێ جار شەڕی لەگەڵ ئەکەیت و فەرمانی ئەشکێنیت !!..

لێرەوە بزانە بۆچی لەشەوی ئیسراو میعراجدا خودا پێغەمبەرەکەی بانگهێشتی ئاسمان کرد ] لنريه من اياتنا [ خودا بە عەزەمەت و گەورەیی خۆی هەموو بوونەوەر و ئاسمانەکانی پیشان دا بۆ ئەوەی بۆ ئێمەی باس بکات کە چەندە گەورە و پڕن لە موعجیزاتی خالیقی بوونەوەر و تا بزانێت ئەم هەموو کەون و کائیناتە لە ژێر فەرمان و دەسەلاتی خودای گەورەیە ، لەهەموو ئاسمانێك پێغەمبەرەکانی بینی و چەندین ئەشکەنجەو ئازار و نارەحەتییەکانی دۆزەخ و نیعمەتە بێ کۆتاکانی بەهەشتی بینی .

یەکەم شت کە خودا خەڵقی کرد قەڵەم بوو وەك پێغەمبەر لە فەرموودەیەکدا دەفەرمووێت : یەکەم شت کە خودا دروستی کرد قەڵەم بوو ، و پێی فەرموو بینووسە تاوەکو رۆژی قیامەت ، لە هاتنە دنیای ژمارەی پێغەمبەران و خەڵکان و دنیاو ئاسمان و بوونەوەر و قەزا و قەدەر و تەمەنی هەموو کەسێك و ئەوبەشە خۆراکەی بۆی براوەتەوە وەکو رزقێك بۆ ئەوکەسە لەلایەن خودای گەورە جل جلاله، خودا بە قەڵەمی فەرموو ] اكتب من علمي الى يوم القيـــــامة .[

دووەم شت کە خودا دروستی کرد ) اللوح المحفوظ ( بوو ئەو شتەی کەنووسینی لەسەر دەکرێت ، هێشتا جگە لەم دوو شتە هیچ شتی تر دروست نەکراوە نە بەهەشت نە دۆزەخ نە زەوی هیچ کامێکیان ، پاشان خودا دەفەرمـــــووێت ] الله الذي خلق السموات والارض وما بينهما في ستة ايام ثم استوى على العرش [ ئەمجارەیان خودای گەورە لە ماوەی شەش رۆژدا زەوی و ئاسمانەکانی دروست کرد ، بۆ لەماوەی شەش رۆژدا ؟ خۆ دەیتوانی بە ماوەی چرکەیەك و رۆژێکیش دروستی بکردایە ، جوولەکەکان ئەڵێن بۆیە بە شەش رۆژ دروستی کرد تاوەکو خودا پشوویێك بدات . خودای گەورە دەفەرمووێت ] ولقد خلقنا السموات والارض وما بينهما [ واتە ئەوانەی لە نێوان ئاسمانەکاندا هەن وەکو هەوا، هەروەها دەفەرمووێت ] وما مسنا من لغوب [ واتا هیچ هیلاکی و ماندووبوونێك نەیگرتینەوە کە لێرەدا خودای گەورە جوولەکەکان بە درۆ دەخاتەوە کە دەیانووت : خودا لەکاتی ئەو شەش رۆژە پشووی داوە، لەم بوونەوەرە سوننەتی ) تدرج ( هەیە واتە پلە بە پلە بۆیەش کۆتایی دنیا پلە بە پلەیە وەك نەمانی خۆر و کێشی موگناتیسی و لاوازی مرۆڤ و هتد . .... دوای ئەم شتانە هەرچی پێویست بوو خودا خەڵقی کرد وەکو ئاسمان و هەواو فریشتەکان و ئەو فریشتانەی عەرشی خودایان هەڵگرتووە ، بەلام گرنگترین شت کە خودا دروستی کرد و لە ژێر عەرشی پیرۆزی بوو ) سیلەی رەحم ( و تا رەحم و بەزەیی و میهرەبانی.

وەك پێغەمبەرمان دەفەرموویێت ] ان الله خلق الخلق ثم فرغ منهم قامة الرحم [ ، ئنجا بەرەحمی فەرموو کەسێك بەتۆ ناگات تەنها خۆی لەتۆ دابڕێت ، چونكە رەحم و بەزەیی خودا هەموو كەسێك دەگرێتەوە مەگەر ئەو كەسە نەبێ كە خۆی لەو رەحمە بێ بەش دەكات ، وەكو ئەوەی پەنا دەباتە بەر تاوان و خوێن رشتن و پچڕاندنی سیلەی رەحم ، لێرەوە خودا مكوڕبوونی خۆی لەسەر بەجێگەیاندنی سیلەی رەحم دووپات دەكاتەوە، نەكەی پەیوەندیی دۆستایەتی و خزمایەتی بپچڕێنیت، كۆمەڵگای ئەم رۆژگارەش بەهۆی ئەم حاڵەتەوە دووچاری نەمان هاتووە و بەدەست پچڕاندنی شیرازەی خزمایەتی ئەناڵێنیێت هەر بەو هۆیەشەوە شارستانیەت كەوتۆتە مەترسی و نەمان.

دوای رەحم و بە زەیی كە شتێك خودا خەڵقی كردبێ تۆبەیە ، واتە لێبووردەیی لە تاوان و گوناح ، پێغەمبەری نازدار فەرموویەتی دوای رەحم و دروستبوونی زەوی و ئاسمان خودا دەرگایەكی دروستكرد كە حەفتا ساڵ رۆیشتنی پانیەكەیەتی و بەردەوامیش كراوەیە و لەلای رۆژاواوە دروستی كردووە و تا دنیاش مابێت داناخرێت مەگەر رۆژی قیامەت دابێت و زەوی و ئاسمانەكان بە ) كن فیكون ( یێك خاپوور بێت . ئەم دەرگایەش دەرگای تەوبەیە و بۆ ئەو كەسانەیە كە روو لە خودا دەكەن و واز لە تاوان و سەرپێچی دەهێنن . بۆچی خودای گەورە ئەم دەرگایەی لەلای رۆژاوا دروستكرد ؟ رۆژ لەبری ئەوەی لە رۆژاواوە هەڵبێت لە رۆژهەلاتەوە هەڵدێت كە خۆر لەوێ هەڵهات ئیتر ئەم دەرگایە بەفەرمانی خودا دادەخرێت و تۆبەی هیچ كەسێك قەبوڵ نییە...

پێغەمبەریش فەرموویەتی تەوبە قەبووڵە هەتا رۆژ لە رۆژاواوە هەڵبێت و بەس كە گەورەترین نیشانەی قیامەتە، زۆربەی زانایان ئەمەدەسەلمێنن وەكو زانایەك بەناوی ) دیمتری ( كە فەلەكناسە دەڵێت لەساڵی 1970 خێرایی سووڕانەوەی خۆر بەدەوری خۆیدا لە $10\%$ بووە و دواتر بەرە بەرە خێراییەكەی زیادی كردووە و ئەوەتا لەساڵی 1998زیادی كردووە و بۆتە $30\%$ و زیاتریش لە خێراییدایە و جەمسەرەكانی لەیەكتر نزیك دەبنەوە ، كە ئەوەش مانای نزیك بوونەوەی رۆژی قیامەت دەگەیەنێت وەكو هەلاتنی خۆر لە خۆراواوە و ساڵی 2006 یش خێرایی سوڕانەوەی موگناتیسیەكە زۆر زیاتری كردووە . دوای سیلەی رەحم سێیەمیان خودای گەورە رەحمەتی خۆی دروستكرد و لە لەوحی مەحفوز لە ژێر عەرشەكەیدا نووسی ) رحمتی سبقە غـچبی ( واتا رەحمەتی من لە پێش خەشم و توڕەییەكەمە ، لەوكاتەدا خودا سەد رەحمی دروستكرد و یەكێكی نادرە سەر زەوی و نەوەد و نۆیەكەی تری لە ئاسمان هێشتەوە .. كە قیامەت و حەشر و حیساب داهات خودای گەورە ئەو رەحمەی خۆی لەسەر زەوی لەگەڵ هەر نەوەدو نۆ رەحمەكەی ئاسمان لە یەكتر دەدات تاوەكو رەحم بە بەندەكانی بكات ، ئەی كەواتە بۆچی ئێمە دڵخۆش و سەرفراز نەبین كە خودا ئەوەندە لەگەڵ ئێمە بەرەحم بێت، پێشەوا عەلی رەزای خوای گەورەی لەسەربێت دەفەرموویێت : ئەگەر لە قیامەت پێم بڵێن خوا موحاسەبەت بكات یان دایك و باوكت، ئەڵێم خوای گەورە چونكە خوای باڵادەست لە دایك و باوكم بەزەیی ترە ..كەواتە تۆش ئاگات لێبێت بەرەو چ ژیانێكی پڕ رەحم و بەزەیی هەنگاو ئەنێیت.

دواتر خوای گەورە حەرامی كرد كەمەككە وێران بێت كە ماڵی خودایە لەسەر زەوی وەك پێغەمبەر دەفەرموویێت ] ان الله حرم مكة یوم خلق السموات والارض [ حەرامی كرد بفەوتێ و لەناوبرێ ، یەكەم خەڵقی خودا لەسەر زەوی مەككە بوو ، دواتر فریشتەكان ..پێغەمبەر دەفەرموویێت كە چوومە ئاسمان لە شەوی ئیسراو میعراج مۆڵەتم لە خودای گەورە وەرگرت بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ فریشتەیێك بكەم كە عەرشی خودای هەڵگرتووە ، پێغەمبەر دەفەرموویێت : كە فریشتەكەم بینی لەرادەبەدەر گەورە بوو تەنانەت نەرمایی گوێچكەی حەوت سەد ساڵ لە شانیەوە دووربوو.

هەروەها باسی جوبرائیل دەکات کە شەش سەد باڵی هەیە هەرباڵێك لە باڵەکانی بکاتەوە سەرتاپای جیهان دادەپۆشێت کە ئەوەندە گەورە و فراوانە رۆژهەلاّت و رۆژاوا دەگرێتەوە ، ئەمانەی هەمووی دروستکراوی خودای گەورەن و ئەی کەواتە دەبێ عەرشی خودا چەندە گەورە بێت ؟؟؟...!!!

دوای ئەم هەموو شتە خودای گەورە جنۆکەکانی لە ئاگر خەڵق کرد و لەسەر زەوی دامەزران ، جنۆکەکانیش وەکو ئێمە دروستکراوی خودان و تا رۆژی قیامەت لە زیادبووندان بەلاّم ئێمە نایانبینین .... بالێرەوە ژیانی جنۆکەکان و دوای جنۆکەکانیش بخوێنینەوە کە مەزنترین دروستکراوی خودان و ئەوانیش مرۆڤەکانن کە خودا فەرمووی ] إني جاعل في الارض خليفة ... [ هەروەها با ژیانی بەشێك لەو پێغەمبەرانەش بخوێنینەوە کە خودا بەگەورەیی خۆی بۆ جیهانی ناردوون تاوەکو بڕیارو راسپاردەکانی خودا بۆ هەموومرۆڤەکان بگەیەنن نەوەکو بەرەو کوێرە ڕێی و نەفامی و تاریکاییەکان بکەونە ڕێ و لە میانەیدا بەر خەشم و تووڕەیی خودا بکەون و لە ئە نجامدا دۆزەخی بێکۆتاش مەنزڵ و شوێنیان بێت ، ئەم پێغەمبەرانە ئەوەندە گوێڕایەڵی خودابوون تەنانەت بەکوشتن و دووکەرت بوونیان دەسبەرداری ئەوپەیامە ئاسمانییە نەبوون کە خودا بۆی ناردبوون و زۆریش لە خەمی گەلەکەیان دابووینە و هەرچەندەی لەلایەن گەلەکانیانەوە ئازار درابانا ئەوان نزای هیدایەت و خێریان بۆ دەکردن، خۆ دەیانتوانی نزا لە ئوممەتەکانیان بکەن و بە ] کن فیکون [ یّکی خودای گەورە و بالاّدەست هەموویان لەناوبردبان ، بەلاّم نەخێر ئەو پێغەمبەرانە رەحمەت بووینە بۆ گەلەکانیان و لە هەمان کاتیش مزگێنی بەخش بووینە بۆ تەوبە کاران کە خودای گەورە لە بری تەوبەکانیان بەهەشتێکی بۆ ئامادەکردوون کە نەگوێ بیستوویەتی و نەچاو بینیویەتی و نە بەدڵی کەسێکیشدا هاتووە ..... بە پێی را پۆرتی زانایان لەساڵی 2002 کە لە شاری ئۆسلۆ بەسترا، دەرکەوتووە کە دوا دروستکراو لەسەر ئەم زەوییە مرۆڤە ...ئەمەش راستی فەرموودەی پێغەمبەری پێشەواو قورئان دووپات دەکاتەوە، سەعیدی نورسی دەڵێت : مرۆڤ بەری داری بوونەوەرە و هەمووشتێك بۆی ئامادەبوو ئنجا خوای گەورە دروستی کرد و هێنایە سەرزەوی...

کەواتەزەوی ئامادەی هاتنی مرۆڤەو هەرچی پێویست بێت لە بیستن و بینین لەم ژیانە کورتەیدا خوای گەورە بۆی دروست کردووە ] وسخر لكم مافي السموات و الارض[ ، نیشانەی ئەوەیە کەئێمە جوانترین و بەڕێزترین دروستکراوەکانی خوای گەورەین ... کەواتە تۆش وانەکەی ئەم گەورەیییەی خۆت لەدەست بدەیت!!!..

هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ (22) هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ (23) هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ... (24) الحشر.

تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (1) الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ (2) الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَوَاتٍ طِبَاقًا مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ (3) ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ (4) وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِلشَّيَاطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ ...(5) الملك.

اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْأَنْهَارَ (32) وَسَخَّرَ لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ (33) وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ

مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا إِنَّ الْإِنْسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ...(34) ابراهيم.

*　　　　　*

پێغەمبەر ئادەم ) سەلامی خودای لەسەر بێت(

وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ (30) وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ فَقَالَ أَنْبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلَاءِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (31) قَالُوا سُبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (32) قَالَ يَا آدَمُ أَنْبِئْهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ فَلَمَّا أَنْبَأَهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ (33) وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ (34) وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ (35) فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ (36) فَتَلَقَّى آدَمُ مِنْ رَبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (37) البقرة.

بێگومان ئادەم پێغەمبەر باوکی مرۆڤەکانە و خوای گەورە وای کردووە کە هەموو مرۆڤێك ئەم پێغەمبەرەیان خۆش بوویت ، چونکە دوای جنۆکەکان دووەمین دروستکراوی خودای گەورەیە و لە رۆحی خۆی نەفخی کردووە.

لە پێغەمبەر ئادەم فێری کۆمەڵێك پەند و عیبرەت ئەبین وەکو خۆ بەگەورە نەزانین ، هەمووومان باش دەزانین ئــــــــــادەم لە ) تورا ( ە، واتە خۆڵ کەواتە خۆڵیش لەسەر ئەرزە و نابێت بەرز بێت ، هەر لە ئادەم فێری ملکەچ بوون بۆ خودا ئەبین و لەرێی ئەویشەوە دەزانین بەهەشت چییە چونکە یەکەم شوێن و مەنزڵی ئەو بووە بەر لەوەی بێتە سەر زەوی .. هەرلەو فێرئەبین کە چۆن لەدژی شەیتان بوەستین و بەردەوام دژایەتی بکەین ، لە ئادەم فێرئەبین کە ئێمە لەچی دروستکراوین و پێکهاتەی جەستەی ئێمە بریتی یە لە چ جۆرە ماددەیەك ، فێریش ئەبین کە کاری ئێمە لەسەر زەوی بریتی یە لەچی ؟

ئایا فێرئەبین کە چۆن پارە و پوول کۆبکەینەوە و چۆن و بەچ شێوەیەك رابووێرین و مامەڵە لەگەڵ دەوروبەر بکەین و یاخود هەریەکە و بەلایەکەیەوە بە ئارەزووی خۆی مامەڵە بکات و سەرگەردان بێت ؟..

حەزرەتی ئادەم فێرمان دەکات کە بۆچی هاتووینەتە ئەم دنیایە و کاری ئێمە چییە لەســـــــەر زەوی ؟ هەزاران گەنج هەیە نازانێ کار و ئەرکی سەرشانی لەم ژیانەدا چییە و بۆچی هاتۆتە ئەم دنیایە؟ ئایا بۆ ئەوە هاتووە بەئارەزووی خۆی رابووێرێت و گوێ بە فەرمان و بریارەکانی خوای گەورە نەدات، لەژیانی حەزرەتی ئادەمەوە دەبێ فێری ماناکانی ژیان بین و بتوانین بەسەر تاڵ و ناسۆرییەکان سەربکەوین و لەهەمان کاتیش ئەرکی سەرشانمان لەو ژیانەدا بزانین چییە و چی نییە.

ئایاتەنها بۆ ئەوە هاتووینەتە ئەم دنیایە بخۆین و بخۆینەوەو، هەرچی ئارەزوومانە بیکەین و بەجێی بگەیەنین و لەگومرایی و تاریکاییدا گوزەر بکەین؟ ئەی کاری ئێمە لەم دنیایەدا چییە؟ بەتەنها خۆمان دینداری بکەین و حسابێك بۆ دەوروبەرمان نەکەین ؟ ئەی کاری کێیەخەڵکی بەرەو ئیسلامەتی بانگ بکات و هۆشیاری بەخەڵك ببەخشێت و سەرزەویش ئاوەدان بکاتەوە؟...

باوكە ئادەم فێری دانان بە هەڵەمان ئەكات كە مرۆڤ بەهۆیەوە گەورە ئەبێت و ژیانی بەرەو سەركـــــــــەوتن هەنگاو ئەنێت.

كاتێ خودای بالادەست گەردوون و جنۆكە و مرۆڤی دروست كـرد فـەرمووی ) انـي جاعـل في الارض خليفـة ( واتـا كەسێك لەسەر زەوی جێ نشین بێ و كارەكانی من ببات بەڕێوە ، بەر لە مرۆڤ خـودای گـەورە جنۆكـەكانی دروسـت كردووە و هەندێك لە زانایان دەڵێن كە دە هەزار ساڵ بەر لە مرۆڤ خودا جنۆكـەكانی دروسـت كـردووە بـەلام ئـەم بۆچوونە رای جیاوازی لەسەرە و لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێنەكراوە كە جنۆكەكان چەند ساڵ بەر لەمرۆڤەكان لەلایەن خوداوە دروستكراون . ئیبلیس یەكێكە لەو جنۆكانەی كەلەسەر زەوی دەژیا و خودای دەپەرست ، كە بێگومان ئیبلیسیش شەیتانی گەورەیە كە مرۆڤەكان گومڕا دەكات و بەرەو هەڵدێرانیان دەبات .. بەرلـەوەی خـودای گـەورە ئادەم خەلق بكات جنۆكەكان لەسەر زەوی گەورەترین و زەقترین شەڕیان نایەوە و یەكتریان قڕ كرد و دەستیان نایە خوێنی یەكترییەوە و تاوای لێهات یەكتریان لەناو برد . یەكێك لەوجنۆكانەی خـودای گـەورە لەسـەر زەوی بـەرزی كردەوە و بردییەوە بۆلای خۆی ئیبلیس بوو ، ئەوكاتە ئەو ئیبلیسە عابیـد و خـودا پەرسـت بـوو پارێزگـاری لـە پەرستنی خودا دەكرد ، دوای ئیبلیس كەسێك لەسەر زەوی نەماو بوو بە چۆڵەوانی ، خودا بە فریشتەكان و ئیبلیسی نەفەرموو من مرۆڤێك دروست دەكەم، دواتر خودای گەورە چەنگێك خۆڵی سەر ئەرزی هەڵگرت و فەرمووی لەم خۆڵەی سەر ئەرز مرۆڤێك دروست دەكەم ، لەفەرموودەی قودسیدا پێغەمبەرمان فەرموویەتی ئادەم واتە خۆڵی سەر ئـــــەرز )اديم الارض. (

قورئانی پیرۆز باسی دروست بوونی ئادەمی كردووە كە بە چەند قۆناغێك بـووە ، هـەموو كەسـێك ئـەزانێت كـە ئاسمانەكان حەوت تەبەقەن و حەزرەتی ئادەمیش بە حەوت قۆناغ دروست كراوە.

یەكەمیان : لە خۆڵ بووە ) كلكم من ادم وادم من تراب ( پاشان ) كن فيكون .( یاخود خودای گەورە فەرموویەتی )ان مثل عيسى عندالله كمثل ادم خلقه من تراب ( ،

دووەمیان : قوڕ واتە تێكەڵكردنی ئاوو خۆڵ كە لەئەنجامدا ئەبێ بە قوڕ ) من طين. (

سێیەمیان : كە خۆڵەكە بوو بە قوڕ پێویستی بە مانەوە هەیە لەبەر ڕۆژ وەكو دروسـتكردنی خـشت لـە لادێكـان و پاشان دانانی لەبەر ڕۆژ تاوەكو دەبێتە خشتێكی پتە وو توند ، كە خودا دەفەرمووێ ) انا خلقناه من كين لازب. (

چوارەمیان ) : ولقد خلقنا الانسان من صلصال ( وەك داغكردن لە فرن و وشك بوون وپتەوو توند بوون.

پێنجەمیان ) : من حمأ مسنون ( واتە ئەو قوڕەی بەرەبەرە توند و تۆڵ ڕەق ئەبێت و ئاوەكەی هێشتا بۆشە و تەنها شێوەی دەرەوەیەتی.

شەشەمیان ) : من صلصال كالفخار ( وەكو بڵێی لە فرن دانراو بێت و بەتەواوەتی وشك كراوە بێت.

حەوتەمیان ) : ونفخت فيه من روحي فقعوا له ساجدين ( واتە خوداخـوای گـەورە ڕۆحـی پێبەخـشی ، یەكـەمجار ڕۆحەكە لەسەرییەوە چووە لەشیەوە كە گەیشتە لووتیەوە ئادەم پژمین رووی تێكرد.

بەلام بەرلەوەی خودا ڕۆحی پێببەخشێت شەیتان واتە ئیبلیس بە دەورو بەری پەیكەرەكە ئەسـووڕایەوە و ئەچـووە ناویەوە وەك بڵێی گاڵتەی پێ دەهات كە خودا نەیتوانیوە ڕۆحی پێبدات .. درێژی بالای ئادەم شەست باڵە و ئیبلیس نەیدەزانی كەڕۆحی بۆ دێت و سەرزەوی ئاوەدان دەكاتەوە و دەبێت بە جێ نشینی خوای گەورە لەسەر زەوی.

لەبەرامبەر دروستكردنی ئادەم لەلایەن خوداوە لە خۆڵ، زانایان رای جوانیان هەیە و دەڵێن لەبەر ئەوەی مرۆڤ لە

خۆڵ دروستكراوە بۆ ئەوەی تەكەبور نەیگرێت و دەشتوانێت لەسەر ئەم ئەرزە كاروبارەكانی خۆی ببات بەڕێوە ، یاخود كە لەخۆڵ دروستكراوە هەر دەبێ ئیعماری زەوی بكات و خۆڵ بۆ مرۆڤیش دەبێ بە شاهێد لە رۆژی دوایی چاكە و خراپەكانی دەخاتە روو كە رۆژێك لە رۆژان بەسەریدا گوزەری كردووە . جگە لەوەی دەبێت بشزانن كە هەمووتان لە ئادەمن كە خودا فەرموویەتی ) كلكم من ادم وادم خلق من تراب .. ( بۆ ئەوەیە كەسێك لەكەسێكی تر خۆی بە گەورەتر و خاوەن شكۆ و دەوڵەمەندتر نەزانێت ، ئێستا زانیمان كە ئادەم لەخۆڵ دروستكرا بەلام چ خۆڵێك ؟ خۆڵی سەر زەوی و شوێنی دروستكردنی لە بەهەشت و رۆحەكەیشی لە ئاسمان ، ئێمەش لەسەر زەوی پێویستمان بە خۆراك و گیانە، كەم كەس هەیە بتوانێ سێ تا چوار رۆژ بەرگەی خۆراك نەخواردن بگرێت ، كەواتە رۆحیش پێویستی بە خۆراكە كە ئەویش نوێژ و عیبادەت و پەرستشی خودایە سەیری ئەوكەسانە بكە كە نوێژ ناكە ن و بێ باوەڕن بەلام كە تێكەڵ بە ناخیان ئەبیت دەبینیت زۆر ناڕەحەت و دڵ توندن چونكە رۆحیان مردووە و پێویستی بە خۆراكی گیانە كە ئەویش نوێژ و سوپاسگوزاری نیعەتەكانی خودای گەورەیە . با دەوڵەمەنترین كەس و ناودارترین كەسی دنیابێ هەر ناڕەحەت و خەمۆكە بەلام كەسێكی ئیماندار لە و خۆشبەخت و خۆشحاڵترە چونكە خۆراكی گیانی دۆزیوەتەوە كە سوپاس و ستایشی نیعمەتەكانی خودایەكەیەتی لەسەر دروستكردن و رزق و رۆزی پێدانی .. لای هەمووانیش ئاشكرایە كە جەستەی مرۆڤ حەزی بە زەوییە كە ئەخەویت حەز دەكەی لەسەر زەوی بخەویت و لەسەر زەویش نان بخۆیت ، ئەی رۆحەكەت ؟ بێگومان ئەم رۆحەت تەنها بە بینینی بە هەشت و شادبوون بە بەهەشت پشوو ئەدات و ئەحەسێتەوە و تەنها بە شادبوون بە بەهەشت و لیقای خودا تامەزرۆی ئەشكێت، لێرەوە دەردەكەوێت ماڵی راستەقینەی تۆ بەهەشتە، چونكە شوێنی لەدایك بوون و سەرەتای دروست بوونت لەبەهەشتە .هەربۆیە ئەبێ بڵێین )إنا لله وإنا إليه راجعون ( كەواتە كاتی خۆی لەوێ بووین و ئێستاكەش بەشێوەیەكی كاتی لەسەر زەوین و دواتر جێی دەهێڵین .

كە خودای گەورە ئادەمی دروستكرد و رۆحی پێبەخشی، فریشتەكان و ئیبلیس لە هۆكاری ئەم دروستكراوەكەیان پرسی و خوداش فەرمووی ئەمە مرۆڤە و جێ نشینی منە لەسەر زەوی ، بەمە فریشتەكان دڵتەنگ بوون و ئیبلیسیش هەروا ، فریشتەكان فەرموویان تۆ كەسانێك لەسەر زەوی دروست دەكەیت كە فەساد بڵاوبكەنەوە و خوێنی یەكتر بڕێژن لەسەر زەوی ؟ فریشتەكان ئەمیش وەكو جنۆكەكان تێگەیشتبوون كە لەسەر زەوی ئەو كارانەیان ئەنجامدا .

لە بەرامبەردا خودا فەرمـــــــــووی ) اني اعلم مالا تعلمون ( واتە ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن...

فریشتەكان دەیانووت ئێمە بۆ ئەم جێ نشینە باشترین و ئیبلیسیش دەیووت ) انا خير منه .. ( فریشتەكان لە نور دروست بوون جنۆكەكانیش لە ئاگر و مرۆڤ و ئادەمیش لە خۆڵ ، بەلام قەدری مرۆڤ لە ماددەكەوە نییە بەڵكو لەبڕیارەكەی خواوەیە كە فەرمووی ) اني جاعل في الارض خليفة.(

خودا فەرموویەتی ) فإذا سويته ونفخت في روح فاقعوا له ساجدين ( بزانە مرۆڤ چەندە مەزن و پیرۆز و گەورەیە كە خودا بڕیاردەدات كە دەبێ هەمووان كە جوبرائیل و فریشتەكان و ئەو فریشتانەی عەرشی خودایان هەڵگرتووە كـــــڕنووش بۆ ئادەم ببەن !!..

لەوكاتەوە یەكەم سەجدە سەری هەڵدا و هەموو فریشتەكان كڕنووشیان بۆ ئادەم برد بەتەنها ئیبلیسی لەعین نەبێت و سەرپێچی لە بڕیارەكەی خودا كرد و لە وێوە یەكەمین تاوان سەری هەڵدا كە ئەویش دوو تاوانی زۆر زەق و خەسارەت مەند بوو كە تاوانەكانی تەكەبور و حەسوودی بوون..

كەواتە مرۆڤەكان بەرز و پیرۆزن و خودا ئەم ئەمانەتەی بە ئادەم و ئینسانەكان بەخشی و ئادەم و مرۆڤەكان

توانیان ئەم ئەمانەتە وەربگرن ) فحملها الانسان ( واتە مرۆڤ توانی ئەم ئەمانەتـەی خـودا هـەڵبگرێت ، ئەگـەر ئەمانەتەکە هەڵنەگرێت دەبێتە ) ظلوما جهولا ( واتە گەر قەدری نەگرێت و پابەندی ئەم قورئانە نەبێت و قـەدر وقیمەتی خۆی نەزانێت ستەمی لەخۆی کردووە و تەمەن مایە پووچە .. هەموو کەسێك لەسەر ئەم زەوییە جێ نشینە و دەبێ ئەم ئەمانەتەی خودای گەورە لە ئەستۆ بگرێت ، باوەڕدارێتی مرۆڤەکان بە تەنها پەرستش و نوێـژ و ڕۆژی نییە بەڵکو ئاوەدانیی سەرزەوی و هەڵگرتنی ئـەو ئەمانەتـەی خودایـە ، ئەوکاتـە مرۆڤەکـە کەسێکی کامیـل و شامیلەبەواتایەکی تر ) خلیفە ( ڕەنگدانەوەی نـاوو سـیفاتی خـوای گەورەیـە لەمرۆڤـەکان، کەبـەزەیی وسـۆز و بەخشندەییە و هتد .... وەکو پێغەمبەری خوا ) تخلقوا بأخلاق الله( ، پاشان ) وعلم ادم الاسماء كلها ( تەنانەت پێغەمبەری پێشەواش داوای ئەو زانستەی لە خودا کردووە و فەرموویەتی ) یا معـــلم الادام علمني ( ، ئنجا پێـی فەرمووی ) انبأهم بأسمـائهم ( خـودا هـەموو فریـشتەکانی کـۆکردەوە و ئـادەم هـەموو زانـستەکانی فێرکـردن و فریشتەکانیش فەرموویان ) ربنا سبحانك لا علم لنا الا ما علمتنا ( واتە خودایە ئێمە هیچ نازانین مەگەر ئـەوەی فێرمانت کرد..

زانستی فریشتەکان لەلایەن خودابوو بەلاَم زانستی مرۆڤەکان موکتەسەبە و هەوڵ دەدات فێرببێت . چـونکە خـودا عەقڵ و هۆش و مێشك و توانای پێ بەخشیوە هەردەبێت فێر ببێت ، نیعمەتێکی تر ئەوەیە دەبێت فێـر ببیـت کـە هاوسەنگییێك لە نێوان جەستەو ڕۆح دروست بکەیت .. جێ نشینیش بریتییە لەوەی سەر زەوی ئاوەدان بکەیتەوە وەکو ئادەم، تاوەکو زانست و ڕاسپاردەکانی خوا بلاَو بکەیتەوە و بە هەموو خەڵکانی بگەیەنیت ، کـە کەسـانێك لەسـەر زەوی خەریکی بلاَو کردنەوەی فەساد و بەد ڕەوشتین ئەی بۆ مرۆڤی باوەڕداریش ئەم ئایینەی خودا بلاَونەکاتەوە ؟؟؟ مرۆڤ زۆر گەورەیە و جێ نشینی خودایە بەو مانایەی ئەرکی سەر شانیەتی خەڵکان فێری ئیسلامەتی بکات و زانست و زانیاری خودای گەورە بۆ هەموو دەوروبەر بگەیـەنێت ، ) والله يـدعوا الى دار الـسلام ( واتـە خـوا خـەڵکان بـۆ بەهەشتەکەی بانگ دەکات دەی تۆی مرۆڤیش وەکو ئادەم ئەو ئەرکە بگرە ئەستۆی خۆت و بۆ بەهەشتیان بانگ بکە .

ئەم تەمەنەی مرۆڤ ئەمانەتێکە هەر بۆلای خودا دەگەڕێتەوە و لەم ئەمانەتە بەرپرسیاری .. کە خوا پێی فەرمووی )اني جاعل في الارض خليفة ..( کوا جێ نشینیەکەت چیت کردووە بۆ ئەم بڕیارەی خودای گەورە ، بۆ بێ بەش بین لەم ڕاسپاردەیە؟ هەرکاتێ دووربین لە پشت کردن لە فەرمانەکانی خوای گەورە ڕەوشتی ناشیرینمان ئەنجامدا ئـەوا وەلاَمی دوا ڕۆژمان پێنیە و بلێین خوایە ئێمە جێ نشینی تۆبووین لەسەر زەوی !!..

جنۆکەکان و ئیبلیس نەیانتوانی ئەم بڕیار و ڕاسپاردەیەی خوا لە ئەستۆ بگرن و لەسەر زەوی بن بە جـێ نـشین ، چونکە فریشتەکان و ئیبلیس لە خۆڵ دروست نەکراون ، وەك هەموولایەك ئەزانن کە فریشتەکان لەنور دروستکراون و ئیلبیسیش لە ئاگر، کەواتە تەنها کەسێك شیاوی لە ئەستۆگرتنی ئەم بڕیار و ڕاسپاردەیەی خوابێت تەنها ئادەم و نەوەی ئادەمن.

ئێستا زانیمان کە ئیبلیس کڕنووشی بۆ خوای گەورە نەبرد و بێ بەش بوو لە ڕەحمەتی خوا ، شەیتان بـە مانـای ) دەرکراو ( دێت واتا دەرچوو لەرەحمەتی خوای گەورە، لێرەدا شەیتان پەنای بردە بەر لووت بەرزی و خۆبەزل زانی و خۆی بێبەش کرد لە ڕەحم و بەزەیی خودای گەورە ، بۆیە بەردەوام لە بۆسەدایە مرۆڤەکان سەرگەردان بکات و بەرەو هەلاکەت و هەڵدێرانیان ببات ، شەیتان هەموو کات شالاَو بۆ مرۆڤەکان دەهێنێـت کـە ڕوو لـە فەسـادی بکـەن و سەرپێچی لە فەرمانەکانی خوا بکەن ، سەیرکە لەرۆژی عەرەفەدا خوای گەورە بە گەورەیی خۆی چـۆن شـانازی بـە مرۆڤەکان دەکات کە گرد بوونەتەوە و لەولایشەوە ئیبلیس بەرد باران دەکەن و خـودا بـە گـەورەیی خـۆی ڕوو لـە

فریشتەکان ئەکات و دەفەرمووێ بزانن مرۆڤەکان توانیان ئەو راسپاردەیە لە ئەستۆبگرن و پابەندی بڕیارەکەی من بن. کەواتە ئەی مرۆڤ تــۆ زۆر گــەورە و بەقــەدرو قیمــەتیت لــەلای خوداکــەت، چــونکەخودا ڕێــزی لێــت نــاوە و لەهەموووکات و ساتێك بەسەرتەوەچاودێرە و نەغافڵ دەبێت و نەخەو دەیباتەوە.

پاش ئەوەی شەیتان لە رەحمەتی خوا بێ بەش بوو شەیتان پەنا دەباتە بەر بــەخیلی بــە ئــادەم و لەگــەڵ خــودا دەکەوێتە گفتوگۆ و دەڵێت) قال اراْيتك هذا الذي كرمت علي لإن اخرتني الى يوم القيامة لأحتنكن ذريته الا قليلا (دەڵێ خودایە مادام ئاوا ئادەمت لەمن بەرز تر و پیرۆزتر کرد پەیمان بێت نەوەکانی ئەم ئادەمە لە خشتەبەرم و بەرەو هەڵدێرانیان ببەم ، خوداش پێی فەرموو ) قــال اهبط منهــا فمــا يكون لــك ان تتكبر فيهــا ... ( ددەرچــۆ لەبەهەشت چونکە شوێنی کەسانی لووت بەرز و موتەکەبیر نییە ...ئاگاداری خۆ بەگەورە زانین بێت مەبە بەهاوەڵی ئیبلیس و خەڵکی بەکــەم تەماشــا مەکــە، ئــەم نەخۆشــییە کوشــندەیە ئەبێتــە مایــەی رووخــانی کەســاییەتی و شارستانیەتیش بۆیە خوای گەورە ئاماژە بەو لووت بەرزی و تەکەبوریە ئەکات وەك ئەفەرمووێت ) ولاتــصعر خــدك للناس ولا تمشي في الارض مرحا انك ولن تبلغ الجبال طولا ...( ئەوەندە بەس بێت کە پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت :کەسێك بە قەد دەنکە گەنمێك گەورەیی و تەکەبوری لەدڵدا بێت ناچێتە بەهەشتەوە !!...هەروەها دەفەرمووێت : هەرکەسێ خۆی بەگەورە نەزانێت، ئەوا خوای گەورە بەرزی ئەکاتەوە.

لێرەدا شەیتان هێرشەکانی بۆ سەر نەوەی ئادەم زیاتر دەکات و بەخودا دەڵێت لە پێشەوە و لە پشتەوە و راستەوە زەفەریان بۆ ئەبەم و لە چەپەوە و لە هەموولایەکەوە ئەوکاتە دەبینی ) ولا تجد اكيرهم شاكرين ( ئەی ئەوەنییە ئەمرۆ و لەم رۆژگارە زۆربەی مرۆڤەکان رێی شەیتانیان گرتووە و کەمێکیان نەبێت شوکرانەی خودا ناکەن و گەرم و گوڕ نین لە پەرستش و عیبادەتەکانیان و پەنا دەبەنە بەر شــیرك و خــوێن رشــتن و گونــاح و تــاوان ، ئەمــە لــە هێرشەکانی شەیتانەوە سەرچاوەی گرتووە کەلەکاتی دروستبوونی ئادەم ئیبلیس ئەم بڕیارەی دا کە تۆڵە لە نەوەی ئادەم بسەنێت..

دوای قۆناغەکانی تەواو بوونی دروست بوونی ، حەزرەتی ئادەم لە بەهەشت دەسووڕێتەوە و گوزەر دەکــات ، بــەلاّم خەم بۆ تەنیایی خۆی دەخوات و خۆی بە غەریبێك دەزانێت وەك پێغەمبەرمان دەفەرمووێ ) استوحش ادم ...( خوای گەورە کە مرۆڤی دروستکرد و دواتر وای کرد کە پیاو بەبێ ئافرەت نەژیێت و کارەکانی ببات بەرێوەو ژنیش بەهەمان شێوە، بۆیە بەتەنها ژیان خۆشی تیانییەو ناچێتە سەر ...

بۆیە حەزرەتی ئادەم هەستی بە بۆشاییەك ئەکرد، کە ئەبێ کەسی تر لەگەڵ من نەژیێت؟ بەلاّم هێشتا نایزانێت . لەوکاتەدا خودای گەورە خەو دەخاتە چاوەکانی ئادەم و خەو دەیباتەوە .. لەوکاتــەی ئــادەم خــەوتووە خــودا واد ەکات لە پەراسووی چەپییەوە کەسێکی تر دروست بکــات کــە ئەویــشیان دایکــە ) حــەوا ( یــە ، وەك پێغەمبــەر دەفەرمووێت ) خلقت من ضلع اعوج .. ( کە بێگومان جوانترین ئافرەت بــووە لــە دوای ئــەویش حــەزرەتی ســارە ی خێزانی پێغەمبەر ئیبراهیم کە هەردووکیان جوانترین ئافرەت بووینە، بەلاّم بۆچی لەلای پەراسووی چــەپی ئــادەم دروست بوو و لەلای راستیەوە دروست نەبوو؟

بەداخەوە هەندێك کەس ئەڵێن : چونکە لای پەراسووی خوار دروستکراوە و هەر خواریشە !!!!.. کەچی پێچەوانەی ئەو قسەیە چونکە پەراسووی سنگی مرۆڤ دڵی داپۆشیوە، بــەس نییــە بــۆ ئافرەتێــك دڵــی پیاوەکــەی بپارێزێــت لەکاتەکاتەکانی خۆشی و ناخۆشیدا ...لەبەر ئەوەش خەوی لێکەوت تاوەکو هەست بــە ئەزیــەت نــەکات لــەکاتی

دروست بوونی حەوا، و دواتر پێی بڵێت کەمن بەهۆی تۆوە ئەزیەتم خواردووە بەچاوێکی تر سەیری بکـات .پـاش خەلق بوونی دایکە حەوا ئادەم علیه السلام لە خەوەکـەی بـە ئاگادێتـەوە و دەبینێـت کـەژنێك بـە تەنیـشتیەوە دانیشتووە و ئادەمیش سەری سوڕ دەمێنێت و رووی تێدەکات و لێی دەپرسێت کەتۆ کێیت ؟ حەواش ئەفـەرمووێت مـن حەوام و ئافرەتم .. و لەتۆوە خەلق بووم .. وشەی حەوا سـیٚ مانـا بەدەسـتەوە ئـەدات و بەخشـشێکە بـۆ هـەموو ئافرەتێکی باوەڕدار حەوا بە مانـای ) حیاه ( واتە ژیانەوە دێت و بەمانای ئیحتیوا و حەیا دێـت .. واتـا ئەگـەر ئافرەت نەبێت ژیان ئەستەمە و نابێت ... واتایەکی تری ) حواو ( حەیایە ...حەیاش گەورەترین خەسڵەتی رەوشتی ئومممەتی پێغەمبەری پێشەوایە، کە ئەبێت ئافرەتـان خۆیـان بـەو حەیایـەوە جـوان بکـەنو لەدەسـتی نـەدەن ... خوشکەکەم ئاگات لێبێت قەدر وڕێزی تۆ بە حەیاکەتەوەیە هەرکاتێ لەدەستتدا دڵنیابە لای کەس قـەدر و رێـزت نامێنێت و نەکەی بیتکێنیت و بە قسەی دڵداری پێش هاوسەرگیرێتی، جل و بەرگی خراپ و هەڵس و کەوتی ناشیرین وات لێنەکات ئەم رەوشتە بەرزەت لەدەست بدەیت، زانایەك کە لە ئەوروپا ژیـان بەسـەردەبات دەڵێـت : ئـەوروپا لەزۆر شتتدا کامڵە و نوقسانی نییە هەر لە رووی رۆشنبیری بگـرە تـاوەکو شـــــارستانێتی .... تـەنها ) حـەیا و عەقیدە ( ی نوقسانە !!!..کە ئەمە راستییێکە و هەرکەسێك لە ئەوروپا بێت ئەزانێ ئەم قسەیە لەجێی خۆیەتی و تەواوو راست و دروستە ...پێغەمبەری ئازیزیش ئەفەرمووێت : گەر حەیا نەما، ئەوا هەموو شتێك ئە نجام دەدرێـت، کەسەرەتایەکە بۆ رووخان و لەناوچوون...

ئیحتیواش بە مانای لە ئامێز گرتن و لەباوەش گرتن دێت ، تۆ سەیر بکە ئافرەت چەندان منالٚ بەخێو ئەکات و لە باوەشیان ئەگرێت ، ئایا پیاو ئەو توانایەی هەیە منالٚ بەخێو کات و سۆز و بەزەیی خۆی بۆ منالٚەکان دەربخات ؟ بێگومان ناتوانێت .. ئەی ئەگەر ئافرەت لە مێردەکەی دابڕا ئەم ئیحتیوایە بەشی پیاوەکە دەکات بێگومان نەخێر ، چونکە مالٚ بیٚ ئافرەت چۆڵ دەبێت و شیرازەی خێزانیش تێك دەچێت .

دواتر باوکە ئادەم پرسیاری لە حەوا کرد و پێی فەرموو کاری تۆ چییە؟ دایکە حەواش پێی فەرموو ) لتسکن الی ( بەومانایەی من دەبم بەمایەی ئیسراحەت وپشوو بۆتۆ وخێزانێك پێکدەهێنین، خوشکان سەیری ئـەم وتەجوانـەی دایکە حەوا بکەن چەندە وتەیەکی جوان و پڕ پشوویکە بۆ بەرامبەرەکەی، چی تیایە ئەگەر ئەمڕۆ کچێکی ئیماندار وخاوەن ڕەوشت بەگە نجێکی ئیماندار و هاوتـای خۆی بڵێت :من و تۆ بۆیەکتری دەشێین و داواکارم بێیتە خوازبێنیم.

ئەوپەڕی جورئەت و هەست کردنە بەباوەڕدارێتی و جێبەجێکردنی سووننەتێکی پێغەمبـەری ئـازیزە، بۆکـوڕانیش بەهەمان شێوە و خۆزگە هەموو کورو وکچێك بەدوای ڕەوشت و ڕەفتاری جوان وئیماندارانە دەگەڕان نەك بۆ پارەو پول و سامانی زۆر، چونکە زۆر کەس ئەوسەروەت و سامانەی هەیە کەچی لەژیانیدا بەختەوەر نییە و زۆریـش دڵتەنگـە چونکە لەژیانیـدا رۆژێـك لـەرۆژان تـامی ئیمـانی نەچەشـتووە، گـەر ئەوانـەی بـاس لـەمافی ئـافرەت دەکـەن ولەتەلەفزیۆنەکان مێزگرد ئەبەستن و لەرۆژنامە و گۆڤارەکانیش بابەت لـەبارەی ئـافرەت و مـافی ئافرەتانـەوە دەنووسن و لەبارەیەوە لێدوان ئەدەن وتەمەننا دەکەن ژیانی ئافرەتانی کوردیش وەکو ئافرەتانی ئەورووپی لێبێت و ئیسلام ناشیرین ئەکەن وبەنامۆی دادەنێن ئەوا راست ناکەن وخەیاڵیان خاوە، چونکە لەئەورووپاو لەوڵاتانی رۆژئاوا ئەوەی مافی نەبێت ئافرەتە .چونکە کاری سەرەکیی زۆربەی ئافرەتانی ئەورووپی لەش فرۆشیـە ودوورکەوتنەوەیـە لەسۆزی دایکایەتی واتا لەدەستدانی ئەرکی ) سکنا ( و موهیممەی خۆی لەدەست ئەدات، هەزاران وملیۆنان ئـافرەت بوونەتە قوربانی دەستی داوێن پیسان لەئەورووپاو بازرگانیان پێوەدەکرێت لەفیلمە سێکسی یەکان و هتد !!!...کوا شەرم وحەیایەکی هاوتای دایکە حەوا لەجەرگەی ئەورووپا؟ کوا شـیرازەی خێـزان و پێکهێنـانی ژیـانی هاوسـەریی

بەڕێگای شەرعیی و لەسەربنەمای گوێڕایەڵیی و خۆشەویستی و سۆز و مەحەببەت؟
روون وئاشکراشە هیچ پیاوێك بە قەد ئافرەت ئۆقرە گر و بە رەحم نییە بەرامبەر منالْ و هەموو کارو بارێکی ئەم دنیایە لە سۆز و عەتف و رەحم و بەزەیی "کـەمنالێك لەژوورێکــەوە ئــەگرێیت وژیرنابێتــەوە دەبینیــت بــاوەکــە لەژوورەکە دێتەدەرەوە وتەنها دایکەکە سۆزوخۆشەویستی خــۆی بۆمنالەکــەی دەردەبــڕێ و ژیــری دەکاتــەوە، ئایــا بینیوتـانە رۆژێك لەرۆژان منالێك بەبێ دایك و بەلایلایەی باوکی ژیربێتەوە؟ ولآتـانی ئەورووپیش بــەو شــێوەیەن و ئافرەتێك نییە وەکو ئافرەتێکی موسڵمانی داوێن پاك منالەکەی بەخێوبکات و شــەونخوونی بەدیارییــەوە بکــات، هەزاران منالْ فڕێدەدرێن و بەخێو ناکرێن و ملیۆنەها منالی بێ شەرعیش لەدایك ئەبن و فڕێ ئەدرێن !!!...ژیانی کامە ئافرەت چاکترو گرنگتر و پیرۆزترە؟ ئایا ئافرەتێکی ئەورووپی یــاخود ئــافرەتێکی موســڵمانی داوێــن پــاك و خاوێست؟ بێگومان ژیانی ئافرەتە موسڵمان وداوێن پاکەکە.
پاش ئەوەی ئادەم و حەوا هەستیان بە بەبرسێتی کرد خودای گەورە پێی فەرموون ) ولا تقربا هڑە الشجره فتکونا من الڤالمین ( ، هەموو شتێك لە بەهەشتدا بۆ وان ئاسایی بوو بیخۆن تەنها لە بــەری ئــەوداره نــەبێت کــە خــودا ئاگــاداری کردنــــــەوە .. نــەی فــەرموو مــە یخۆن فــەرمووی نزیــك ئــەو دارە مەکــەون ) !!! ولا تقربــا ( ئــەم ئاگادرکردنەوەیە لەلایەن خوداوە بۆ ئادەم و حەوا ئاگادار کردنەوەیەکە بۆ هەموو مرۆڤەکان واتا نزیکی گونــاح و تاوان مەکەون، هەموو گوناهێك سەرەتا لە نزیك بوونەوە دروست ئەبێت، یەکەم لەخەیالْ و بیر کردنەوە و دواتــر زەمینە خۆشکردن و سازکردن و گەیشتن وئەنجام دان !!! بۆیە هەنگاونان بەرەو گوناهو حــەزلێکردن و پــێ خــۆش بوون ڕێگایەکن بۆئە نجامدانی ئەو گوناهانە.
گە نجانی بەڕێز .... ئەبێ هۆشیاربن لەم سەردەمە تازەیە، خۆشل کردن بۆگوناهو شەرم کــردن لــە ئە نجامنــەدانی خۆی لە خۆیدا ئە نجامدانی گوناهەکە مسۆگەر دەکات !!!... بۆیە گوناهو تــاوانی زینــاش لەنزیك بوونــەوە دروســت دەبێت و سەرهەڵدەدات نەك ئە نجامدانی بەشێوەیەکی یەسکەری وەك خوای گەورەش دەفەرمووێت ] ولا تقربوا الزنی [نزیکی زینا مەکەون...
وەکو خۆڕاهێنان لەچاوپیسی ... پەیوەندیی نێوان کوڕ و کچ ... و تێکەلآوی خراپە ... و خەڵوەی نێوانی کوڕ و کچ ...
بۆیە زۆربەی ئەوکەسانەی کە تووشی گونـاح ئەبن لەسەرەتـایەکی بچووکەوە دەستی پێکردووە نەوەك ئە نجامــدانی گونـاهە گەورەکە ... خوشکان ئێوەش ئاگاداری جل و بەرگی جوانتان بن، زۆرجــار مــەڵێ دەی قــەیناکا بــا لەگــەڵ مۆدێلی سەردەم بڕۆم و جلی کورت بپۆشــم چــونکە گوناهباردەبیـت و کەئەمــە هۆیەکــە بــۆ ســەرهەڵدانی گونــاهو خرا پەکاریی ...
دواتر شەیتانیش ئەم هەلەی قۆستەوە و رووی لە ئادەم و حەوا کرد : وقـال مانهاکما ربکما عن هذە الـشجرة ؟ بــۆ خودا ئەو دارەی لێ قەدەغە کردن ؟
بریاری خودا وابوو کە نابێت ئادەم و حەوا نزیکی دارەکە بکەون چونکە ئەگەر وابکەن لە نیعمەتــەکانی بەهەشــت بێبەش دەبن و خۆشییەکانی ناو بەهەشت لە دەست دەدەن ... خودا پێشتر ئاگاداری ئــادەم و حــەوای کردبــۆوە کــە ئاگاداری ئیبلیس بن کە سەختترین و گەورەترین دوژمنی ئێوەیە ، لێرەدا ئیبلیس نیاز پاکی خۆی بۆ ئادەم و حــەوا خستە روو و ) وقـاسمهما انی لکما لمن الناصحین ( سوێند بە خوا دەخوات کە من بۆئێوەمە و ئامۆژگاریتان دەکــەم ، کە سوێندی خوارد ئادەم و حەواش پێیان باوەڕ کرد ... و چونە ژێر دارەکە وە و ) ژاڤا ( واتا دارەکەیان تام کرد و

نەیانخوارد بەلاّم تەنها تامیان کرد، راســـــتەوخۆ ) بدت لهم سوأتهما .. ( پۆشتەی بەریان نـەما کـە پێـشتر داپۆشراو بوون !!!...کەواتە ئاگاداربە چەندەی بیٚ فەرمانی خوای گەورە بکرێت ئەوەندە و زیاتریش کۆمـەڵگا روو لەخراپەکاری ئەکات بەتایبەتی تر لەرووی ) جنس و فاحشە ( ە،وە .خـودای گـەورە ئاگـاداری ئـادەم و حـەوای کردبۆوە کە تا لەبەهەشتا بمێنن نە برسیان ئەبێت نە رووت ئەبن ، بەلاّم وەسوەسەی شەیتان ئەمەی لەدەستدان ، ئەمجارە ئیبلیس وەسوەسەی زیاتری بۆ هێنان تاوەکو گویٚ لە راسپاردەی خوا نەگرن و لە بـەری دارەکـە بخـۆن ..
ئادەم و حەوا ترس دایگرتن و رایانکرد خوداش بە گەورەیی خۆی بانگی کردن و پێی فەرموون ئایـا لەترسـی مـن رائەکەن ئەوانیش وتیان ) بل حیاوا منك ( چونکە رووت بوون و داپۆشراو نەبوون ، وتیان نەخێر شـەرم ئەکـەین بۆیە رائەکەین واتا شەرم لەتۆ دەکەین، ئەی کەوابیٚ دایکە حەوا بەو شێوەیە شەرم لەخوای گەورە بکات ئافرەتانی ئەم رۆژگارە بۆ شەرم لەخواناکەن کەبەرێگاو شوێنە گشتییەکاندا گوزەر دەکەن نیوەی لەشیان بەدەرەوەیـە، بـەلاّم لەم رۆژگارەدا زۆربەی ئافرەتان سەرپێچی لەشەرع و بەرنامەی ئیسلام ئەکەن و بۆژیانێکی کـاتی خۆیـان لـەڕەحم وبەزەیی خوای گەورە بێبەش دەکەن، ئەوەتا پێغەمبەری پێـشەوا فەرموویـەتی لەشـەوی ئیـسراومیعراجدا جبریـل دیمەنێکی ئەشکەنجە و ئازارەکانی دۆزەخی نیشان دام و بینیم زۆربەی کەسانی دۆزەخ لەئافرەتانن، زۆرپێویـستە خوشکانمان ئەو دیمەنە جوان وشەرم وحەیایەی دایکە حەوایان لەبەرچاوبێت و جوانی وزینەتیان بۆکەسانی بێگانە نەخەنە روو کەبەهۆیەوە فەسـادی وبـیٚ رەوشـتی سـەرهەڵدەدات سـەرەڕای خەشـم وقینـی خـوای گـەورە بەسـەر ئەوئافرەتەی پەنا دەباتەبەر ئەوکارە ناشەرعییە .
ئادەم و حەوا بە پەلە پووش و پەلاشی ژێر دارەکانی بەهەشتیان کۆکردەوە و لە خۆیان ئالاَنـد و خۆیـان پۆشـتە کردو ئنجا خودا بانگی کردن و پێی فەرموون ) الم انهکما تلـك الـشجرە( ، بـەرێزان خۆپۆشـتە کـردن نیـشانەی ملکەچی و فەرمان بەرداری خوای گەورەیە و مایەی پاراستنی جوانی ئافرەتە، هەروەهاخوای گەورە روو لە ئـادەم و حەوا ئەکات و پێیان ئەفەرمووێت :پێم نەوتن کە ئیبلیس سەختترین و گەورەترین دوژمنی ئێوەیە ؟ ئا لێرەوە خودا ئادەمی فێر کرد کەچی بڵێت ) .. قالا ربنا ظلمنا انفسنا فإن لم تغفرلنا وترحمنا لكونن من الخاسـرين ( وتيـان ئێمە زوڵممان کرد لە خۆمان و ئەگەر رەحممان پیٚ نەکەیت و لێمان خۆش نەبیت ئەوا خەسارەت مەند ئەبین ...

راستەوخۆ ئادەم تەوبەی کرد ، کەلێرەوە یەکەم تۆبە لە مێژوو سەری هەڵدا و خودا تۆبەکەی قەبووڵ کرد.
ئنجا ئادەم زۆر گریا و خوداش هەردووکیانی لە ئاسمانەوە ناردە سەر زەوی و لەبەهەشـت و نـاز و نیعمەتـەکانی بێبەش بوون ، زانایان ئەڵێن جیاوازی هەڵەی ئادەم و گوناهی ئیبلیس لەوەدایە:
یەکەم : حەزرەتی ئادەم کەهەستی کرد لەودارەی خوارد خوای گەورە سەرزەنشتی کرد یەکـسەر داوای لێخۆشـبوونی کردو پەشیمان بۆوە، بەلاّم ئیبلیس دانی بەهەڵەی خۆی دانەناو خۆی بەڕاست لەقەڵەمدا..
دووەم : ئیبلیس رەخنەی لەکاری خوای گەورە گرت و وتی ) انا خير منە ( واتە من لـەو باشـترم، بـەلاّم حـەزرەتی ئادەم پرسیاری لەکاری خوای گەورە نەکرد چونکە مرۆڤ دروستکراوە نەوەك دروستکار .خوای گـەورە ئەفـەرمووێت ) لايسئل عما يفعل وهم يسألون ( کەواتە ئێمە لەلایەن خوای گەورەوە پرسیارمان لێدەکرێت.
سێیەم : حەزرەتی ئادەم پەشیمان بۆوە و تۆبەی کرد، بەلاّم ئیبلیس هەڵەی خۆی دایە پاڵ خوای گەورە و تی ) فبما اغويتني لاقعدن لهم صراطك المستقيم ( وتی :خوایە مادام منت گومڕا کرد، ئەبیٚ لەڕێی راستی تـۆ لایـان بـدەم، سەیرکە ئیبلیس بەخوای گەورە دەڵێت : منت گومڕا کرد و ناڵێت خۆم گومڕا بووم وام بەسەرخۆمدا هێنا!!!...

چوارەم : ئیبلیس بەهۆی خۆبەزل زانین و تەکەبورییەکەی وای کرد کە کڕنووش بۆ ئادەم نەبات، بەهەشتیش جێگاو مەنزڵی خۆبەگەورە زانەکان نییە، بەڵام حەزرەتی ئادەم لەبەر شەرمی خـوای گـەورە جیـی پـێ جـێ نـەبوو لـەو بەهەشتە پان وبەرینە کە هەڵەکەی کرد "ئادەم هەر دەگریا ، بەڵام خودا بۆ ئادەم بوو بە دڵنەوایی و پێی فەرموو هەوڵ بدە نەوەکانی تۆ گوناح و تاوان نەکەن و روو لەمن بکەن بێگومان پاداشتیان هەر جەرگەی بەهەشـتە و بـۆ ئەوانم ئامادەکردووە بۆیە خوای گەورە ڕوو لەنەوەی ئادەم وهەموو مرۆڤەکان دەکات کە ئێوە بۆچـی ڕێـی شـەیتان دەگرنە بەرو بەگوێی فەرمانـەکانی دەکـەن ئـەی ئێوەخۆتـان نەتانبیـست کـە ئیبلـیس وتـی : دەبـێ زۆربـەیان لەخشتەبەرم و گومڕایان بکەم و نەیوت :لەڕاستەوە ولەچەپەوە ولەپێش و پشت بۆ مرۆڤـەکان دەچـم کـە تـەنها کەمێکیان سوپاسگوزاری تۆبکەن؟ خوای گەورە بەو مەزنی و دەسەڵاتی خۆیەوە داوا لەئێمەی مرۆڤی لاواز دەکات کـە گومڕا نەبین و بەدوای فێڵی شەیتان نەکەوین ..ئێمە لەوخاکە دروست بـووین و پێویـست ناکـات لـووت بـەرز بـین چونکـــــــه ) إناالله واناالیه راجعون ( و گەڕانەوەمان هەر بۆلای ئەوخوایەیـە کەئێمـەی لەنەبوونەوەهێناوەتـە بوون ورزق و ڕۆزی و ژیانی و هەناسەو عەقڵی پێ بەخشیوین .خـوای گـەورە لـەڕۆژی هەینیـدا حـەزرەتی ئـادەمی دروستکرد و، لەرۆژی هەینیش ئەمری خوای گەورەی بەجێ هێناو وەفاتی کرد، فریـشتەکانی خـوای گـەورە خۆیـان شۆردیان و خۆشیان لەگۆڕیان ناوشاردیانەوە...

) إبن القیم ( دەفەرمووێت : بەزمانی حاڵ خوای گەورە بەحەزرەتی ئادەم ئەفەرمووێت : لەبەهەشـتدا وا گـوزەرت نەکرد کە پادشای بەهەشت بیت، و ئێستاش وەکو بەندەیەك مامەڵەت لەگەڵ ئەکەین، ئەی ئەگەر گوناح نەکەیت لێخۆشبوونی خۆم بەکێ ببەخشم ؟ ئەی ئادەم بڕۆ سەر زەوی ولەوێدا بمپەرستەو بەهەشتم بۆت ئامادە کردووە، باش بزانە گەڕانەوەشت هەر بۆلای منە ...ئەی ئادەم بەنەوەکانت ڕابگەیەنە و پێیان بڵێ : هەر چەندێ تاوانیان کردبێت من لێیان خۆش ئەبم گەرداوای لێخۆشبوونم لێبکەن ...گەر خوای گەورەش پرسیارت لێبکات و لێپرسینەوەت لەگەڵ بکات و پێت بلێت بۆ کڕنووشێکت بۆم نەبرد؟ بۆ حەرامت خوارد و بۆ حەرامت لەبەرکردبۆ بـەگوێی شـەیتانت کـرد؟ وەڵامی تۆ چی دەبێت؟ دەی تاوەکو لە ژیاندا ماویت ئەوە دەرگای تۆبە و گەڕانەوە بۆلای خوای گەورە والایە و ڕوو لە پەروەردگارت بکە کەبێگومان شوێن و مەنزڵت بەهەشتەکەی دەبێت کەبۆتی ئامادەکردووە...

وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ (26) وَالْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ مِنْ نَارِ السَّمُومِ (27) وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ (28) فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ (29) فَسَجَدَ الْمَلَائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ (30) إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَى أَنْ يَكُونَ مَعَ السَّاجِدِينَ (31) قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ السَّاجِدِينَ (32) قَالَ لَمْ أَكُنْ لِأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُ مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ (33) قَالَ فَاخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ (34)وَإِنَّ عَلَيْكَ اللَّعْنَةَ إِلَى يَوْمِ الدِّينِ (35) قَالَ رَبِّ فَأَنْظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ (36) قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنْظَرِينَ (37)إِلَى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ (38) قَالَ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ (39) إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ .. الحجر.

وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ لَمْ يَكُنْ مِنَ السَّاجِدِينَ (11) قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِنْهُ خَلَقْتَنِي مِنْ نَارٍ وَخَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ (12) قَالَ فَاهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَنْ تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَاخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ الصَّاغِرِينَ (13) قَالَ أَنْظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ (14) قَالَ إِنَّكَ مِنَ الْمُنْظَرِينَ (15) قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ (16) ثُمَّ لَآتِيَنَّهُمْ مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَنْ شَمَائِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ (17) قَالَ اخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَدْحُورًا لَمَنْ تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنْكُمْ أَجْمَعِينَ

(18)وَيَا آدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ (19) فَوَسْوَسَ لَهُمَا الشَّيْطَانُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُورِيَ عَنْهُمَا مِنْ سَوْآَتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ إِلَّا أَنْ تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ (20) وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ (21) فَدَلَّاهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْآَتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَنْ تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ وَأَقُلْ لَكُمَا إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُبِينٌ (22) قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ (23) قَالَ اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ (24) قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ (25) يَا بَنِي آَدَمَ قَدْ أَنْزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآَتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آَيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ (26) يَا بَنِي آَدَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ يَنْزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْآَتِهِمَا إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ (27) وَإِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً قَالُوا وَجَدْنَا عَلَيْهَا آَبَاءَنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ (28)الاعراف

**پێغەمبەر نوح سەلامی خودای لەسەربێت:**

كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ (105) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ (106) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (107) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (108) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ (109) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (110) قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ (111) قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (112) إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَى رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ (113) وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ (114) إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُبِينٌ (115) قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا نُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمَرْجُومِينَ (116) قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ (117) فَافْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي وَمَنْ مَعِيَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (118) فَأَنْجَيْنَاهُ وَمَنْ مَعَهُ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ (119) ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ الْبَاقِينَ (120) إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآَيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ .(121) الشعراء..

ئەمجارەیان لە خزمەت یەكێكی ترین لە پێغەمبەرەكانی خودا كە ئەویشیان حەزرەتی ) نوح ( د، سەلامی خودای لەسەر بێت ، ئەم پێغەمبەرە بە باوكی دووەمی مرۆڤەكان ناسراوە و زیاتر لە هەزار ساڵ ژیاوە ، ناوی حەزرەتی نوح لە ) ینوح ( هاتووە واتە ئەوەی زۆر و بەبەردەوام بگریێت ، چونكە ئەوەندە خودای خۆشویستووە و بەبەردەوام سەری لە كڕنووش بووە و لاڵاوەتەوە و گریاوە و فرمێسكی ڕشتووە "ئاخۆ تۆش لەكەیەوە فرمێسكی خۆشەویستی و سۆز لەچاوانت بۆ خوای گەورە نەهاتۆتە خوارەوە!! ؟؟؟..

ئەم پێغەمبەرە نزیكەی دە سەدە لە دوای حەزرەتی ئادەم هاتۆتە دنیاوە ، هەندێك لە زانایانیش دەڵێن سەدەی ئەو كاتە لەگەڵ سەدەی ئەم ڕۆژگارە جیاوازی هەبووە و هەر سەدەیەك هەزار ساڵ بووە و دەڵێن حەزرەتی نوح دە هەزار ساڵ لە دوای حەزرەتی ئادەم هاتووە سەلامی خودایان لێبێت . بەو پێیەی لە كاتی حەزرەتی ئیدریس دواتر بۆ سەردەمی حەزرەتی نوح مرۆڤەكان بێ عەیب بوون و هەر هەموویان باوەڕیان بە خودا هەبووە ، كەواتە ئەگەر پێغەمبەران بە بەردەوامی لە دوای یەكتر نەهاتبن ئەوا بزانن كە خەڵكانی پێش ئەوان باوەڕدار بووینە و خودایان پەرستووە.

لەسەردەمی نوح پێغەمبەردا چینێك بەسەر چینێكی ترەوە زاڵ تربوون، وەكو زاڵ بوون بە ماڵ و سامان و پارە و دەسەلاتداریێتی بەرامبەر بە چینەكەی تر ، و سەرهەڵدانی ژێر دەستەیی و ڕق و كینە بەرامبەر یەكتری، وەكو ئەو

سەردەمەی ئەمڕۆ کەدەبینین لەسەرانسەری جیهان ژێر دەستەیی بۆتە دیاردەیەکی باوو لەهەموولایەکەوە کەسانێك بوونەتە ژێر دەستە کەلاواز و بێ پشت و پەنان، جگە لەوەی پارە و پوول و سوڵتە و سامان تەنگی بەم خەڵکە چنیوە و لەرادەبەدەر غرور و لووت بەرزی کردوون . شیرك و بت پەرستن لە هەموولایەك سەری هەڵدا و نزیکەی هەزار ساڵێکی خایاند ، دوای وەفاتی حەزرەتی ئیدریس سەلامی خودای لەسەربێت خەڵکان و زانایان ئەو ئەمانەتەی پێغەمبەریان گرتە ئەستۆی خۆیان بۆ بانگەواز کردن بۆ وەحدانیەتی خودای هەموو جیهان ، لەسورەتی نوحدا خودای گەورە ئاماژە بە ناوی چوار زانا دەکات کە لەو سەردەمە واتە لە نێوان ماوەی حەزرەتی ئیدریس و حەزرەتی نوح خەریکی بانگەواز بووینە و خەڵکیان بەرەو پەرستنی خودای تاك و تەنها بانگ دەکرد ئەو چوار زانایە ئەمانە بوون ) وود و نەسر و یەعوق و یەهود.. (

ئیبلیس نەیدەوێرا نزیکی ئەو خەڵکە ببێتەوە چونکە ئیماندار و خۆڕاگر بوون، ماوەی هەزاران ساڵ ئارامی گرت و خۆی لە خەڵکەکە نزیك کردەوە بەو ئومێدەی دووچاری شیرك و هاوبەشدانان بن بۆ خوا و دەچووە مێشکی خەڵکەکەوە کەبۆچی پەیکەرێك بۆ ئەو زانا مردووانە دروست ناکەن تاوەکو بەجەستە و رۆحیش نەبێت بە پەیکەر لە بەر چاوتان بمێنن ..

ئەمانیش وایانکرد و پەیکەریان تاشی و دروستیان کرد ، دوای ئەم نەوەیە نەوەیەکی تر هاتنە دنیا و ئەمجارە ئیبلیس بە یەکجارەکی پلانی گێڕا و خۆی لەخەڵکەکە نزیك کردەوە و پێی وتن : بۆ ئەم پەیکەرانە ناپەرستن و پێویستە تەقدیسیان بکەن ، چونکە بەم کارەتان لە خودا نزیك دەبنەوە و پلە و پایەتان زیاتر بەرز دەبێتەوە .. ئەمجارەش توانی خەڵکەکە هەڵبخەڵەتێنێت و لە خشتەیان بەرێت ، خەڵکەکە بە گوێیان کردو بە دەوری پەیکەرەکان دەسووڕانەوە و دەیان پەرست و قوربانیان بۆ دەکرد.

خەڵك لە هەموو لایەکەوە کەوتە تاریکیی و هاوبەش پەیداکردن بۆ زاتی خودا جل جلالە ، بۆیە خودای گەورە پێغەمبەرێکیان بۆ رەوانە دەکات ، کە ئەویش پێغەمبەر نوح بوو سەلامی خودای لەسەربێت.

حەزرەتی نوح رەمزی تێکۆشان و ماندووبوون و خەمخۆری خەڵکەکە و رێنمایی بەخش و کەسێکی نەرم و نیان و بەسەبر و بەسۆز بوو بۆ، تەمەنی گەیشتۆتە سەرووی چل ساڵان خودا وەحیی بۆ ناردووە و نەبی و رەسولە . خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی ] انا ارسلنا نوحا الی قومە ان انذر قومك من قبل ان یأتیهم عذاب الیم [ .لە پەنجا ساڵیەوە لەناو گەلەکەی ژیاوە و بۆ ماوەی نۆ سەد و پەنجا ساڵ بانگەوازی لەگەڵ کردن و بە بەردەوام ئامۆژگاری دەکردن و داوای لێدەکرن دەسبەرداری بت پەرستن بن و روو لە خودا بکەن ، بەڵام گەلێکی سەر سەخت و کەللە رەق و نەفام بوون و گوێیان بەو پێغەمبەرە نەدەدا ، و تەنها لە ماوەی دوانزە ساڵدا تاکەسێك باوەڕی پێدەکات واتە هەر دوانزە ساڵ جارێك کەسێك باوەڕی پێدەهێنێت و لە ماوەی ئەو نۆسەد و پەنجا ساڵە تەنها هەشتاو دوو کەس باوەڕی پێدەهێنن و واز لەشیرك و کوفر دەهێنن..

قال الملأ من قومه إنا لنراك في ضلال مبين !!! زۆر سەیرە ئەم پێغەمبەرە بۆ ماوەی نۆسەد و پەنجا ساڵ ئیدانە دەکرێت و بە گومڕا و سەرلێشێواو لە قەڵەم دەدرێت . قال یا قومی لیس لی بچلالە ولکنی رسول من رب العالمین .. زۆر سەیرە پێغەمبەرێك هەموو تواناو هێزێکی خۆی دەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی گەلەکەی لە گومڕایی و تاریکایی رزگاریان بێت و روو لەخودا بکەن بۆئەوەی بەهەشتیان دەست کەوێت کەچی بەشێت و سەرلێشێواو ناوزەدی دەکەن، کەسانی بەرژەوەند پەرست لە هەموو کات و سەردەمێکدا کەسانی باوەڕدار و پەیامدار بە گومڕا ئەزانن و لەم سەردەمەی ئەمڕۆش بە تیرۆریست و هتد......

بەلاَم سوپاس بۆ کەسانێك کە شەوێنکەوتەی پێغەمبەرانن ) نوح ( ئاسا گوێ بەم تۆمەتانە نادەن و خزمەتی پەیامەکەی خوای گەورە ئەکەن .. خودای گەورە دەفەرمووێت ] کذبت قوم نوح فکذبوا عبدنا وقالوا مجنون مزدجر [ هەروەها گەیشتە ئە رادەیەی دەیانووت شێت بووە و مەسی جنۆکە گرتوویەتی ] ان هو الارجل بە جنە [ ئەمجارە پەنایان بردە بەر ئیدانە کردن و ترساندنی بە کوشتن و لە ناو بردن ] قالوا لئن لم تنتة یانوح لتکونن من المرجومین [ ، هۆشدارییان پێدا گەربێتوو وازیان لیٚ نەهێنێت ئەوا بەردبارانی ئەکەن و لەناوی ئەبەن کە ئەمەش دوایین هەوڵە بۆ ڕێگرتن لە پەیامداران.

کەبەلایەوە نزیك ئەبوونەوە داوای ئامۆژگارییان لێدەکرد و دەیانووت قسەمان بۆ بکە ئەی نوح ، کە ئەویش قسەی بۆ ئەکردن و دوایی تەواو دەبوو گالّتەیان پێدەکرد و دەیانووت عەقلّی لە دەستداوە و شێت بووە ، ئەمە نۆسەد و پەنجا ساڵی خایاند . ئنجا حەزرەتی نوح بە خودای فەرموو ] ربي اني دعوت قومي لیلا و نهارا فلم یزیدهم دعائي الا فرارا [ ئەو هەر کۆڵی نەدەدا هەرچەندی گالّتەی پێکراو ئازار درا ئەو پێغەمبەرە لەسەر بانگەوازەکەی سوورتر و گەرم و گوڕتر دەبوو ، تەنانەت گەیشتە ئەو رادەیەی لێیدرا ، پیاوێکی پەککەوتە دەڵێتە کوڕەکەی لە پشتم بکە و بمبە بۆلای نوح، کە دەیگەیەنێتەلای و بە دار لەحەزرەتی نوح دەدات و گالّتەی پێدەکات ، وەك دەگێڕنەوە ئەم پێغەمبەرە رۆژانە بە دەستی گەلەکەی زۆر ئازاری دەچەشت لێدانی زۆری بەردەکەوت و بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك دەبوورایەوە ، پاش بوورانەوەکەی کە سەرتا پای لەشی خوێناوی بوو هەڵدەستایەوە و دەچۆوە بۆلای گەلەکەی و زیاتر ئامۆژگاری دەکردن ، و پێی دەفەرموون من هیچم لە ئێوە ناوێ نە ماڵ نە سامان نە موڵك و نە دەسەلاّتدارێتی من تەنها دەمەوێ ئێوە بەر خەشم و قینی خودا نەکەون گومڕا نەبن ، من هاتووم تا ئێوە لە تاریکی و جەهالەت رزگار بکەم و شیرك بۆ خودا پەیدا نەکەن ، من زۆرتان لێناکەم و باوەڕ هێنان بە زۆر لێکردن نییە و پێی دەفەرموون ] إن اجری الا علی الله...[

]فقال الملأ الذین کفروا من قومه ما نراك الا بشرا ام مثلنا [ بە حەزرەتی نوحیان دەووت : ئەو ژمارە کەمەی لەگەڵ تۆن هەرهەموویان هەژارن و وەکو ئێمەنین ، ] وما نراك اتبعوك الا اربلنا [ بە گالّتە پێیان دەووت : ئەوانەی شوێنکەوتەی تۆن بە تەنها ئەوانەن کە ژێر دەستەی ئێمە بووینە و بەلووت بەرزی ولە خۆباییەکی زۆرەوە دەیانووت چۆن ئێمە شوێن تۆ بکەوین ؟ ).ملأ ( ئەو کەسانەن دارو دەستەی دەسەلاّتدارانن و رۆڵی چەواشەکردن و خۆپەرستی ئەگێڕن، بەلاّم بەهۆی دەسەلاّتدارانەوە خۆیان دەوڵەمەند و پایەدار بکەن، بۆیە زۆر جار دەسەلاّتداران کەسانی دەستکورت و هەژار بەکەم ئەزانن و پێوەر لای ئەوان ماددیە نەك مرۆڤایەتی، بۆیە کاری پێغەمبەران بۆ شوێنکەوتوانیان راستکردنەوەی ئەم بیرە کورتەیە و دابین کردنی یەکسانییە.

پێغەمبەر بە رازی بوون بە قەدەری خوداوە روو لە خودای گەورە دەکات و دەفەرمووێ : خودایە من شەوو رۆژ بانگەوازم لەگەڵ کردن و لەهەمووڵایەکەوە لەگەڵیان بووم و راسپاردەکانی تۆم بۆ روون کردنەوە وداوای مەغفیرەتم

بۆ دەكردن كەچی ئەوان رادەكەن و تەنانەت پەنجە دەخەنە گوێچكەكانیانەوە ، ئەمجارە هەر كۆڵ نـادات و ] ثـم اني دعوتهم جهارا [ ، كە لە شوێنێك كۆدەبۆوە بانگی هەموویانی دەكرد و هەروەها ] واسررت لهم اسرارا [ بەنهێنی لە رێگا قۆڵی دەخستە قۆڵی موشریكەكان و داوای لێدەكردن بەرەو مەغفیرەت و لێخۆشبوونی خـودا بـێن و واز لـە گوناح و تاوان بێنن .

داوای لێدەكردن شوكری نیعمەتەكانی خودا بكەن و ] یرسل السماء علیكم مدرارا [ ئەم ئاسمانەی بـۆ كـردوون بـە پارچەیەك نیعمەت ، بە گوێیان نەدەكرد ، ویمددكم بأموال وبنین .. ویجعل لكم جنات ویجعل لكم انهـارا .. هـەر سەرزەنـشتیان دەكـرد و گاڵتـەیان پێـدەكرد ، ] مـالكم لاترجـون لله وقـارا و قـد خلقكـــم اطـوارا [ دواتـر نیعمەتەكانی ئاسمانیان بە نموونە بۆ دەهێنێتەوە وەكو رووناكی مانگ و خۆر و ئەستێرەكان و باران بارین، زیكری ئیستغفار مایەی وەدەست هێنانی جۆرەها بەخششی خوای گەورەیە ئەوەندە بەس بێت بـەم زیكـرە بـەرێی خۆشـیدا ئەرِوات و بەئاماانجەكانی ئەگات، بۆیە پێویستە رۆژانە بەلانی كەم سەد جاران ئەم زیكـرە بكـەین و پێغەمبـەری پێشەواش فەرموویەتی هەركەسێك دەست بە ئیستغفارەوە بكات خوای گـەورە لەهـەموو ناخۆشـی و نارِەحەتییـەك رزگاری ئەكات و خۆیشی نازانێت چۆن رزق و رۆزی بۆ دابین ئەكرێت و چۆنیش بۆی دێت.

دوای نۆسەد و پەنجا ساڵ لە بانگەواز كردن لە تەمەنی موبارەكی ئەم پێغەمبەرە ئیتر خودا فەرمانی پێكرد و پێی فەرموو با بانگەوازەكەت بەس بێت .. حەزرەتی نوح دەستی بە نزا كـــــــرد و فەرمووی ] ربـي لاتـذر علـى الارض من الكافرين دیارا .. انك ان تذرهم یضلوا عبادك ولایلد الا فاجرا كفاارا [ نزای كرد خودایە نەوەی ئەو موشریك و زاڵمانە نەهێڵیت نەوەكو شوێنكەوتەی ئەوان بن .. خودای گەورە نزاكەی گیرا كرد و پاشان فەرمانی پێكرد كەشتییێك دروست بكات ، ئەویش فەرمانی خودای بەجێ هێناو كەشتییێكی زۆر گەورە و زەبەللاحی لە بیابانێكی وشك دروستكرد ، گەلەكەی بینیان خەریكی دروستكردنی كەشتیە لە بیابانێكی وشك و دوور لە شەپۆلی دەریا جارێكی تر كەوتنەوە خۆ بۆ گاڵتەكردن بەم پێغەمبەرە و دەیانووت : راستمان وت كە وتمان تۆ گومرا و شێتیت !!... ئارامگرتن و هەناسە درێژی و خەمخواردنی حەزرەتی نوح گەیشتە ئەو ئاستەی كە خوای گەورە ئاگاداری بكاتەوە كەتەواو هیچ كەسی تر لەگەلەكەت باوەرِ ناهێننهیچیان لەگەڵ مەكە و چی تر بانگەوازییان لەگەڵدامەكە ...بەمتمانە بوون بەخوای گەورە و باوەرِهێنان بە پەیمانی خوای گەورە، حەزرەتی نوح نەیپرسی بۆ لـەم شـوێنە دوورە و دوورتـر لـە دەریـا ئـەم كەشتییە دروست بكەم ؟؟؟ بۆیە كە فەرمانی خوای گەورەیە بێ دوو دڵی و راستەوخۆ جێبەجێی دەكات، چونكە خێر و خۆشی سەركەوتن بەدەست دەهێنێت، بۆیە ئەگەر خوای گەورە كەبرِیاری سەركەوتن بدات و بتپارێزێـت كـەس بـۆی نییە و لەتوانایدا نییە لەناوبەرێت و ببێتە رێگر لەبەردەمت.

وتەی زۆر هەیە لەبارەی دروستكردنی كەشتییەكە كە ماوەی چەند ساڵێكی زۆری خایاندووە، چونكە حەزرەتی نـوح خاوەنی دار و كەرەستەی كەشتییەكەنەبوو، بەڵام گەورەیی كارەكە و دروسـتكردنی كەشـتییەكە هـەموو ئەزیـەت و ئازارەكانی حەزرەتی نوحی بیردبۆوە، بۆیە پێویستە كەسی خواناس ئازا و چاونەترس و نەبەرد بێت جگە لە خوای گەورە لەهیچ هێز و دەسەڵاتێك نەترسێت بەڵام نابێت بەحەماسەت و كەف و كوڵ بێت، پێویستە بەبیر و هـۆش و زانست و پلان دانەر بێت بۆ بە ئەنجام گەیاندنی كاری بەجێ و پرۆژەكانی ئایندەی لەهـەمووی گـرنگتر نابێـت ) نیەت بۆ خوای گەورە ( مان، لەبیر بچێت.

خودای گەورە بە حەزرەتی نوحی فەرموو ] ان موعدهم الصبح الیس الصبح بقریب [ خـۆی و خێزانێکـی و سـێ لـە منالەکانی لەگەڵ بڕوادارەکانی کە لەگەڵی بوون بەرەو کەشتییەکە سەرکەوتن خێزانەکەی تری و منالەکانی تـری لەگەڵ موشریکەکان مانەوە چونکە لەرێزی ئەوان بوون و دژی حەزرەتی نوح بوون .. چـەندەناخۆش و ناڕەحەتییـە لەماڵەوە خێزان و منالەکانت بەقسەت نەکەن و لە فەرمانەکانت دەربچن و سەرەڕای ئەوەش دژی بـیر و باوەڕەکـەی تۆبن و گوێی بۆ نەگرن!!!...

بەرلەوەی سواری کەشتییەکەبن خودا پێی فەرمووبوو کەی لەناو تەنوری ماڵەوەت لـەبری ئـاگر ئـاو هاتـە دەرەوە سواری کەشتییەکە بن و پەلە بکەن ، و لەهەموو گیاندارێك دوو جووت سواری کەشتییەکە بکە ، کە ئاو لە شـوێنی تەنووری ئاگر فوارەی کرد ، سەرتاپای زەوی رووی لەتەقینەوە کرد و بوو بەکانی و ئـاوی لێ هەڵقوولا و ] وفجرنـا الارض عیونا.[ سەرتاپای ئاوی زەوی و ئاسمانیش بوون بەیەك و ] بماء منهمر [ ئنجـا حـەزرەتی نـوح رووی لـە باوەڕدارەکان کرد و فەرمووی ] ارکبوا بسم الله مجریها [ نەیفەرموو من و کەشـتییەکەم رزگارتـان دەکـات و نـاوی خودای هێنا کەمەبەستی رزگاربوون هەربەدەست خوداوەیە ، تاقیکردنەوەکانی خودا لەگەڵ ئەم لافاوە بۆحـەزرەتی نوح هێشتا درێژەی هەیە و بەردەوامە ، دەبینێت کوڕەکـەی لـە لێـواری خنکانـە و ژنکـەی تریـشی نایـەت و روو لەکوڕەکەی دەکات و پێی دەفەرمووێ ] یا بني ارکب معنا [ خودا کوڕەکەی لە کەشتییەکە نزیك کردەوە ، و هەرداوای لێدەکرد و پێی فەرموو ] ولاتکن مع الکفرین [ بەلام کوڕەکەی دەڵێت ناخنکێم و دەگەمـە نزیـك ئـەم شـاخە !!... کوڕەکەی بە کافری خنکا بەلام خودا بە حەزرەتی نوحی فەرمـــــــوو ] انه لیس من اهلك [ ئەوە کەس و کوڕی تۆ نییە بەڵکو سەرنشینانی کەشتییەکە کەس و نزیکی تۆن...

وەك باس دەکرێت بە دەیەها کیلۆمەتر ئاو بەرەو ئاسمان بەرز بۆتەوە و کەشتیەکەی نوح لە چاو شەپۆلی ئاوەکان زۆر زۆر بچووك بۆتەوە ، لەناو کەشتییەکەدا حەزرەتی نوح نزا دەکات و دەفەرمووێت : رب انزلني منلا مبارکـا ... کوردستان ولاتی پێغەمبەران و پاکییە تا ئەوکاتەش خراپی تێدا روونەدابوو و پاك و بێگەرد بوو ...ولاتێـك لـە قورئانی پیرۆزدا بە پیرۆز ناوبرێت شایانی ئەوەیە بیپارێزین و پارێزگاری لێبکەین.

خوداش دوعاکەی گیرا کـــــــــــــــرد و ] فستوی علی الجودي [ جودی چیاییێکە کەوتۆتە کوردستانی تورکیا بە فەرمانی خودای گەورە کەشتیەکەی حەزرەتی نوح لەسەر شاخی جودی وەستا .. لە سـالی 1980 چـەند زانایـەکی ئەمریکی و رۆژاوایی دوای ماندووبوونێکی زۆر و گەڕان توانیان شوێنی کەشتییەکەی نوح لەسەر ئەو شاخە ببیننەوە لەگەڵ چەند پارچەیەکی کەشتییەکە ... دەڵێن دوای پەنجا ساڵ پـاش ئـەم مـوعجیزە گەورەیـەی خـودا کـە بـۆ لەناوبردنی گەلی نوح ناردی حەزرەتی نوح ئەمری خودای بە جێ هێناو وەفاتی فەرموو...

چەند ژیان درێژ بێت هەر تەمەنت کورت ئەبێت ئەگەر تەمەنت سەد سـاڵ زیـاتریش بێـت هـەردەبێ تەمەنەکـەت لەدەست بدەیت، ئەوەتا حەزرەتی نوح دوای هەزار و پەنجا ساڵ لەتەمەنەکەی ئنجا تەمەنەکـەی بـەکۆتا هـات، کەوابێ ئێمە بەتەمای چەند ساڵین ؟ بۆچەند ساڵیش کۆبکەینەوە؟ دەگێڕنەوە رۆژێك لەرۆژان حەزرەتی نوح بـەلای ئافرەتێك رەت ئەبێت کەلەسەر گۆڕی کوڕەکەی ئەگرییێت، و حەزرەتی نوحیش دەچێتەلای و دڵـی ئەداتـەوە و پێـی دەڵێت : مەگری، ئافرەتەکەش دەڵێت : ئەی نوح نازانیت ئەو کـوڕەی مـن چـەندە شـیرین و چـەندە گـەنج بـوو ؟ حەزرەتی نوحیش لەتەمەنی کوڕەکەی پرسیار ئەکات و ئافرەتەکەش ئەڵێت : سێ سەد ساڵ بـوو !!!... حـەزرەتی نوحیش پێی ئەڵێ : ئەزانی پێش بەکۆتا هاتنی دنیا گەلانێك پەیدا ئەبن زۆرترین تەمەنیان لەنێوان حەفتا بـۆ هەشتا ساڵانە !!!..ئافرەتەکەش سەری بەرز ئەکاتەوە و روو لەحەزرەتی نوح ئـەکات و دەڵێـت : ئەمانـە خـانوو

ئەکەن ؟؟؟؟...
بۆچی و لە پێناو چی ئەم هەموو ئیدانە کردن و ئازاردانە؟
بۆ بێدەنگ نەبوون؟
بۆدەست نەگرتن بەکلاوەکەی تاوەکو با نەیبات؟
بەرپاکردنی چاکە و ئامۆژگاری کردنی خەڵکی پیرۆزترین کارە، چونکە رزگارکردنی مرۆڤە لەناخۆشییەکانی دنیا و قیامەت.
نەکەی بێزاربیت لەکاری ئامۆژگاری کردنی خەڵکی و بەرپاکردنی دینداری، ساردبوونەوە رووت تێنەکات و کوڵ نەدەیت و چۆك دانەدەیت ...نەڵێی دنیا بەمن ناگۆڕێت و کەسێك بەمن ئیسلاح نابێت، نەشڵێیت زۆرم کردو زۆریش ماندوو بووم، چونکە بەقەد حەزرەتی نوح ماندوونەبوویت و ئەزیەتت نەبینیوە.
ئامۆژگاری بەتەنها بە ) خگبە محاچرە ( نابێت ئەبێت هەموو هۆکاری بگریتە بەر و دەبێت تێکەڵ بەناخی کۆمەڵگابیت و بەشداری خۆشی و ناخۆشییەکانیان بکەین.
گەر تەمەنێك بۆ خواو کاری جوان و چاکەکردن بەسەرنەبەیت، بۆ هەر شتێکی تر سەرفی بکەیت ئەوا لەدەست چووە و بەفیڕۆ و زایە چووە.
ئەگەر بۆ خوای گەورە بسووڵحێین و بکەوینە خۆ ئەوا بێگومان هەموو دروستکراوەکانی خوای گەورە لەگەڵمان ئەبن و لەسەرئێمە دێنە وەلام.
گەلی نوح دەرگای وتوێژ و بیرکردنەوەیان لەخۆیان داخست، نەیانویست راستیەکان دان پێ بنێن، ئەوە بەهۆی رابووواردن و پلەو پایە و خۆشییەکانی دنیاوەبوو و، کەواتە بائێمەش چاو لەوان نەکەین.
ئەبێت زۆر رۆشنبیر بین و نابێ بە قسەی هەموو کەسێك بکەین، و خۆمان هیچ نەزانین ...چ رێبازێك بەرنامەی ژیانتە؟ چ کەسێك سەرمەشق و چاوساغتە؟ تەنها بەقسەی ئەوبکە، چونکە گەلی نوح بەقسەی پێغەمبەرەکەیان نەکرد و گوێڕایەڵی کاربەدەست و بەرژەوەند خوازیان کرد بۆیە لەناوچوون....

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ (14) فَأَنْجَيْنَاهُ وَأَصْحَابَ السَّفِينَةِ وَجَعَلْنَاهَا آيَةً لِلْعَالَمِينَ (15) العنكبوت..
وَأُوحِيَ إِلَى نُوحٍ أَنَّهُ لَنْ يُؤْمِنَ مِنْ قَوْمِكَ إِلَّا مَنْ قَدْ آمَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ (36) وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُوا إِنَّهُمْ مُغْرَقُونَ (37) وَيَصْنَعُ الْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِنْ قَوْمِهِ سَخِرُوا مِنْهُ قَالَ إِنْ تَسْخَرُوا مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنْكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ (38) فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَنْ يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُقِيمٌ (39)حَتَّى إِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِنْ كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَنْ سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ وَمَنْ آمَنَ وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلَّا قَلِيلٌ (40) وَقَالَ ارْكَبُوا فِيهَا بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَحِيمٌ (41) وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَى نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَبْ مَعَنَا وَلَا تَكُنْ مَعَ الْكَافِرِينَ (42) قَالَ سَآوِي إِلَى جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاءِ قَالَ لَا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِلَّا مَنْ رَحِمَ وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ (43) وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْدًا لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (44) وَنَادَى نُوحٌ رَبَّهُ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ابْنِي مِنْ أَهْلِي وَإِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ وَأَنْتَ أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ (45) قَالَ يَا نُوحُ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ فَلَا تَسْأَلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنِّي أَعِظُكَ أَنْ تَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ (46) هود.
إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ أَنْ أَنْذِرْ قَوْمَكَ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (1) قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُبِينٌ (2) أَنِ

اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ (3) يَغْفِرْ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ إِذَا جَاءَ لَا يُؤَخَّرُ لَوْ
كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (4) قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا (5) فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلَّا فِرَارًا (6) وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ
لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَارًا (7) ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا (8)
ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنْتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا (9) فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا (10) يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا
(11)وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهَارًا (12) مَا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا (13) وَقَدْ
خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا (14) أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَوَاتٍ طِبَاقًا (15) وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا
(16)وَاللَّهُ أَنْبَتَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا (17) ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا (18) وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا
(19)لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا (20) قَالَ نُوحٌ رَبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي وَاتَّبَعُوا مَنْ لَمْ يَزِدْهُ مَالُهُ وَوَلَدُهُ إِلَّا خَسَارًا (21)
وَمَكَرُوا مَكْرًا كُبَّارًا (22) وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا (23) وَقَدْ أَضَلُّوا
كَثِيرًا وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا (24) مِمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا لَهُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْصَارًا
(25)وَقَالَ نُوحٌ رَبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا (26) إِنَّكَ إِنْ تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا
كَفَّارًا (27) رَبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَنْ دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا (28)
نوح.

*　　　*　　　*

**پێغەمبەر هود سەلامی خودای لەسەر بێت:**

كَذَّبَتْ عَادٌ الْمُرْسَلِينَ (123) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ (124) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (125) فَاتَّقُوا اللَّهَ
وَأَطِيعُونِ (126) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ (127) أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ
(128)وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ (129) وَإِذَا بَطَشْتُمْ بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ (130) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (131)
وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُمْ بِمَا تَعْلَمُونَ (132) أَمَدَّكُمْ بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ (133) وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ (134) إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ
يَوْمٍ عَظِيمٍ (135) قَالُوا سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُنْ مِنَ الْوَاعِظِينَ (136) إِنْ هَذَا إِلَّا خُلُقُ الْأَوَّلِينَ (137) وَمَا
نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ (138) فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَاهُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ (139) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ
الرَّحِيمُ .(140) الشعراء..

گەلی عاد گەلێك بوون كە دوای سەد ساڵێك لە پاش گەلی نوح سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت پەیدابوون ، ئەم گەلەی عادە كەوتبوونە نێوان وڵاتانی یەمەن و عوممان و سعودیە .ئەم گەلە گوناح و تاوانیان لە رادەبەدەر زۆر و بێ ژماربوو بۆیە خوای گەورە پێغەمبەرێكی بۆ ناردن بە ناوی هود ، ئەم پێغەمبەر عەرەب بووە و ، لە مێژووی پێغەمبەرایەتیدا تەنها چوار پێغەمبەر عەرەب بووینە ئەبو زەڕی غەفاری دەفەرمووێت كە پێغەمبەر بۆی باس كردم و فەرمووی چەند پێغەمبەرێك هەن و لەناو ئەو كۆمەڵە پێغەمبەرانە تەنها چواریان عەرەبن كە ئەوانیش هود و شوعەیب و ساڵح پێغەمبەرەكەت، واتە پێغەمبەری ئێمەش عەرەب بووە لەگەڵ ئەو سێ پێغەمبەرەی كەباسمان كرد .. هەروەها گەلەكە بە ) احقاف ( ناسراو بووینە و قورئانیش ئاماژەی پێكردووە ] واذكر اخا عاد اذ انذر قومە بالأحقاف . [ ئەم ئایەتە باس لە براكەی عاد ئەكات كە ئەویش هود پێغەمبەرە سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت . بەڵام عاد و هود برای شیریی نین بەڵكو خودا بە برا ناویان دەبات. ناوچەی عاد خۆشترین و جوانترین و نایابترین شوێنی سەر زەوی بووە ، تابلێی دڵگیر وڕازاوە خۆش و جوان بووە و پڕبووە لە باخچە و سەوزایی و ئاوەدانی بەڵام

دواتر هەمووی بوو بە بیابان و لماوی و بـــــــە ) الاحقاف ( ناوبـانگی دەرکـرد، کەواتـە ئـەو بیابـاەن جـاران پارچەیەك بووە لە سەوزایی و رازاوەیی ...لەفەرموودەیەکی پێغەمبەری پێشەوادا هاتووە ) کـە قیامـەت دانایـەت تاوەکو ئەو بیابانە وەکو جارانی لێنەیەتەوە( ، هەربۆیەش زانایان بەدووری نازانن بەرزبوونەوەی ئاستی دەریاکان و توانەوەی بەستەڵەکەکانی بەفر ئەم رووداوە دروست بکەن، بـە پێی هەنـدێ توێژینـەوەی کەشناسـیش لـەماوەی ساڵانی داهاتوودا باران لەو ناوچەیە زیاد دەکات، کـە هۆیـەکن بـۆ گەڕانـەوەی شـوێنەکە بـۆ دۆخـی جـارانی و سەرهەڵدانەوەی سەوزایی و ئاوەدانیی!!!!...

4وێنی

شوێنی گەلی عاد لەسەر نەخشە

] الم تر کیف فعل ربك بعاد ارم ذات العماد التي لم یخلق مثلها في الـبلاد [ ، گەلی عاد گەلێکی زۆر بە توانـا و بەهێز و بەتین بووینە و لەدوای حەزرەتی ئادەم کەسێك نەبووە وەکو ئەوان گەورە و زەبەلاح و بەهێز بووبێت ، بۆ نموونە بچووکترین و کورتە باڵاترین کەسیان درێژییەکەی شەست مەتر بووە ، و هەندێکیان سەد مەتر بووینـە و گەورەترین بەردە شاخیان زۆر بە ئاسانی بە کۆڵ هەڵگرتووە ، خودای گەورە ئەم گەلەی بۆیە دروست کرد کە بتوانن ژیار و حەزارەتێك بێننە بوون و ئەوەتا لە شاخ خانوویـان دروسـت کـردووە. گەلەکـە بـەرەو هەڵـدێران چـوون و هەلاکەت رووی تێکردن و روویان نایە شیرك و فەساد ، بۆیە خودای گـەورە هـود پێغەمبـەری بـۆ رەوانـە کـردن ، پێغەمبەر لە زۆر فەرمایشتا باس لە هود پێغەمبەر دەکات و زۆر خۆشەویستی خـۆی بـۆ ئـەو پێغەمبـەرە دووپـات کردۆتەوە.

وشەی هود مانای ) نەرم و نیانی ( دەبەخشێت ، حەزرەتی هود زۆر بە نەرم ونیانی و حەکیمانە لەگەڵ گـەلی عـاد دەستی بە بانگەواز کرد و هۆشیاری دەکردنەوە ، باسی ناز و نیعمەتەکانی خودای بۆ دەکردن و باسی لە گەورەیی و رەحم و بەزەیی خوای بۆ کردن ، یەکەم شت کە داوای لێکردن پێی فەرموون ) قـال یـا قـومی اعبـدوا الله ( ئـەی گەلەکەم روو لە خودا بکەن و خودا بپەرستن و دەسبەرداری شیرك و تـاوان بن ... ئەم ئامۆژگارییانەی حەزرەتی هود بۆ ئێمەش و بۆ هەمووکەسێکی ئەم رۆژگارەیە وەك دەبینن هەزاران کەس روویان لە خراپە و خراپەکاری کـردووە و سەرپێچی فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەرەکەی دەکەن ] قال الملا الذین کفروا من قومه انا لنریك في سفاهة [ سەیر کە هێشتا بەگوێی هود پێغەمبەر ناکەن و بە ) سفاهە ( ناوی دەبەن ، کە بە مانای گێل و نەفام دێت .. بەلاّم ئەو هەر نەرم و نیان و لەسەر خۆ و ئارامگرە ] قال یا قـومي لـیس لـي بـسفاهة ولکـني رسـول مـن رب العـالمین ابلغکم رسالات ربي وانا لکم ناصح امین [ سەیرکە چەندە ژیرانە و ئاقلاّنە و بەبێ هەڵچوون بانگیان دەکات..

]او عجتم ان جاءکم ذکر من ربکم علی رجل منکم لینذرکم واذکر اذ جعلکم خلفاء من بعدي قوم نوح ... [ من نەزان و گێل و نیم من پێغەمبەری خودام و دوای گەلی نوح بۆ ئێوە هاتووم ، ئایا بیرتـان چوو کە گەلی نوح چییان بەسەر هات و چۆن نغرۆ بوون و ئاسەواریشـــیان نەما ؟

] وزادکم في الخلق بـسطة [ بەلاّم باش بزانن ئێوە لەگەلی نوح بە هێزتر و بە دەسەلاّتترن [ ... فاذکروا الاوالله [نیعمەت و بەخششەکانی خوایان بیر دێنێتەوە کە چۆن پێیداون و بەسەری داباراندوون ، ] اذ قال لهم اخوهم هود الا تتقـون [ هەروەها پێشـــــیان دەفەرموویێت من هیچ پاداشـــتێك لە ئێوە داواناکـــــەم و ] ان اجـري الا علـی رب العالمین.. [ هەروەها پێی فەرموون کە ئەو شتانەی دروستی ئەکەن تاسەر بۆتان دەمێنێتەوەو لە دەستی نادەن ؟

هەرچەندە خانوو و پەیکەری گەورە لە چیاکان دروست بکەن هەر دەبیٚ لە دەستی بدەن و جیٚی بهیٚڵن ، بەڕاستی گەلەکەم ئیٚوە تاوانی گەورە لە خۆتان ئەکەن و خەسارەتمەندیی هەر بۆ ئیٚوەیە و ئیتر بابەس بیٚ روو لە خوا بکەن .ئەوانیش لەبەرامبەردا پیٚی دەڵیٚن ئیٚمە گەلیٚکی بە هیٚز و بازووین و هیچ شتیٚك کارمان لیٚناکات و خەسارەتمەند نابین ..

بۆیە پیٚغەمبەر فەرموویەتی ) شیبتني هود و اخواتها ( واتە :سورەتی هود و ئەوانی تر پیریان کردووم، زانایان دەڵیٚن : ئایەتی ) فاستقم کما امرت ومن تاب معك ولا تگغوا انە بما تعملون بصير ( چونکە بەراستی گەلەکەی سەرسەخت بوون و گوێیان بە ئامۆژگارییەکانی نەدەدا.

حەزرەتی هود پیٚی فەرموون بابەس بیٚ ئیدی روو لە ئیستغفار و تەوبە بکەن و بگەڕیٚنەوە بۆلای خودا ئەوەتا گەورەترین هیٚزی پیٚ بەخشیون ، ئەوانیش وتیان ] قال یا هود ما جئتنا ببینة وما نحن بتارك الهتنا [ وتیان : ئیٚمە واز لە خوداکانی خۆمان ناهیٚنین و وازلەم قسانە بیٚنە ... چیت لە دەست دیٚت بیکە و باکمان نییە ، سەیرکە خودا چی بەسەر هیٚنان ؟ بۆ ماوەی سیٚ ساڵ بارانی بۆ نەباراندن و وشکە ساڵی رووی لەگەلی عاد کرد .... پاشان خودا سیٚ هەوری بۆ ناردن کە رەنگیان سوور و سپی و رەش بوون ، حەزرەتی هودیش فەرمووی کام هەور هەڵدەبژیٚرن تابچنە ژیٚرییەوە ؟ خۆیان داوای هەوری رەشیان کرد..

پاشان چوونە ژیٚرهەورە رەشەکەوە، کەچوونە ژیٚرییەوە رەشەبایٚکی زۆر بە هیٚز هەڵیکرد و ماوەی هەشت رۆژی خایاند ... بەر لە هەڵبژاردنی هەورە رەشەکە حەزرەتی هود پیٚی فەرموون ] فکیدونی جمیعا [ بەو واتایەی چیتان لە دەست دیٚت بیکەن و باکم نییە ، و پاشان فەرمووی ] انی توکلت علی الله. [ بایەکە هەڵی کرد بەلاٚم چ باییٚك ] بريح صرصر عاتية [ ئەوەندە بەهیٚزو زۆر زۆر ساردیش ] . ثمانية ايام حسوما فترى القوم فيها صرعا كأنهم اعجاز نخل خاوية [ وەکو دار ئەکەوتن و ئەشکان و لەناو دەچووادی الی ولیا فقد اژنتهره بالحرب... [

هەر کەسیٚك دژایەتی دۆستیٚکی من بکات ئەوا شەڕی لەگەڵ من بەرپاکردووە .کیٚ هەیە لەدەست خاڵقی بوونەوەر رزگاری بیٚت ؟؟ کیٚ هەیە بەدەسەلاٚتی خۆی بنازیٚت و لەدەستی نەچیٚت ؟؟ شەڕکردن لەگەڵ پەیامداران و خواناسان شەڕکردنە لەگەڵ خوای گەورە و میهرەبان، بۆیە خوای گەورە لەفەرموودەیەکی قودسیدا ئەفەرموویٚت ] من عادی الي وليا فقد اذنته بالحرب [ هەرکەسیٚك دژایەتی دۆستیٚکی من بکات ئەوە شەڕی لەگەڵ من بەرپا کردووە ... ئالیٚرەدا گەلی هود لەناو چوون و بە فەرمانی خودا حەزرەتی هود و ئەوباوەڕدارانەی لەگەڵی بوون، زۆرجار دەسەلاٚت و هیٚز دەبیٚتە مایەی گومڕایی و سەر لیٚشیٚوان و خۆلەبیر کردن و خوا لەبیر کردن !!!.....بۆناپرسیت کە کیٚ منی کرد بە خاوەن پارە و سامان ؟؟ یاخود کیٚ منی کرد بە خاوەن هیٚز و دەسەلاٚت ؟؟ گەر کەسیٚك وا بیربکاتەوە کە خۆی بە بازووی خۆی گەیشتۆتە ئەو دەسەلاٚت و هیٚزە و کەسانی بەرامبەر بەچاوی سووك و خوار خۆی سەیر ئەکات و بەبەردەوام حەز و ئارەزوو دەکات خەڵکانی لەخۆی نزمتر بکات بە کۆیلە و بەندە ..

گەلی عاد پەندییان لەگەلی نوح وەرنەگرت هەرچەندەی ماوەی نیٚوانیان زۆرنەبوو، بۆیە یەکیٚك لەو خاڵە بەهیٚزانەی کە مرۆڤ بەختەوەر ئەکات و کۆمەڵگاش دووچاری لەناوچوون نابیٚت، ئەوەیە کە گەلان و کەسانی پیٚش خۆمان لەبەر چاوبیٚت و بەبەردەوامیی ژیانیان بخویٚنینەوە و پەندیان لیٚوەربگرین، بەهەڵەی ئەواندا بچینەوەو، سوود لەچاکەکانیشیان وەربگرین .هەرلەبەرئەوەشە خوای گەورە جگە لەباسی گەلان لە قورئانی پیرۆزدا هەندیٚ شویٚنەواری ئەو گەلانەی بۆ هیٚشتووینەتەوە تاوەکو ئیٚمەش وابزانین کە ئەمڕۆی ئیٚمەش ئەبیٚتە دویٚنیٚی سبەی ...

هەر شارستانیەتێك گەر ڕەوشت پارێزی تێدا نەبێ و باوەڕ و ڕۆڵی نـەمێنێ بێگومـان نالـەباری رووی تێـدەكات و لاسەنگ ئەبێت و مێژووش گەواهیدەری ئەم حاڵەت و راســــــتیەن، ئالێرەدا گەلی هود لەناوچـوون و بەفـەرمانی خوای گەورە حەزرەتی هود و ئەو باوەڕدارانەی كەلەگەڵیدابوون رزگاریان بوو و لەناونەچوون..
ئەوەی لەم چیرۆك و بەسەرهاتەی گەلی هود تێگەیشتین ئەوەیە كە دەبێ گوێڕایەڵی پێغەمبەران بین ولەفـەرمانیان دەرنەچین هەرچەندەی گەلەكەی هود بەتواناو بـەهێز بـوون مـادام گوێڕایـەڵی پێغەمبەرەكـەیان نـەبوون، ئـەوا لەناوچوون.

ئەگەر ئێمەش بەهێزبین و خاوەن توانا و وزەبین ئەوا بێگومان تواناو هێزەكەمان دادمان نادات گەربێتوو لە پێناوی ئاییندا نەیخەینە گەڕ ئەگەر گەلی هود بەجەستە و بەدروستكردنی حەزارەت سـەركەوتووبن ئـەوا ئـەمڕۆ گـەلانی جیهان بە داهێنان و فەلەكناسی و نەوەوی و بواری جیۆلۆجی بەهێزن، بەڵام ئەگەر وەكو گەلی هود لووت بـەرزی و لەخۆبایی بوون روویان تێبكات ئەوا دەبێ باجی لەخۆباییی بوونەكە بدەن، كەئەویش لەناوچوونی حەزارەتەكەیە، چونكە ئەم جۆرە بەهرە و داهێنانە هەرهەمووی لەلایەن خواوەیەو هەرخۆیشی بەتوانایە لەسەندنەوەی ئەو جـۆرە نیعمەت و داهێنانە ..

وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ (50) يَا قَوْمِ لَا أَسْأَلُكُمْ
عَلَيْهِ أَجْرًا إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى الَّذِي فَطَرَنِي أَفَلَا تَعْقِلُونَ (51) وَيَا قَوْمِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاءَ
عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَى قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا مُجْرِمِينَ (52) قَالُوا يَا هُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِي آلِهَتِنَا
عَنْ قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ (53) إِنْ نَقُولُ إِلَّا اعْتَرَاكَ بَعْضُ آلِهَتِنَا بِسُوءٍ قَالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ
مِمَّا تُشْرِكُونَ (54) مِنْ دُونِهِ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنْظِرُونِ (55) إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمْ مَا مِنْ دَابَّةٍ إِلَّا هُوَ
آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (56) فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ مَا أُرْسِلْتُ بِهِ إِلَيْكُمْ وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّي قَوْمًا
غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّونَهُ شَيْئًا إِنَّ رَبِّي عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ (57) وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنَّا
وَنَجَّيْنَاهُمْ مِنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ (58) وَتِلْكَ عَادٌ جَحَدُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا رُسُلَهُ وَاتَّبَعُوا أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ (59)
وَأُتْبِعُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ أَلَا إِنَّ عَادًا كَفَرُوا رَبَّهُمْ أَلَا بُعْدًا لِعَادٍ قَوْمِ هُودٍ .. (60) هود.

* *

پێغەمبەر ساڵح سەلامی خودای لەسەر بێت :

كَذَّبَتْ ثَمُودُ الْمُرْسَلِينَ (141) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَالِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ (142) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (143) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (144) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ (145) أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا آَمِنِينَ (146)فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ (147) وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ (148) وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا فَارِهِينَ (149) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (150) وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ (151) الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ (152) قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مِنَ الْمُسَحَّرِينَ (153) مَا أَنْتَ إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُنَا فَأْتِ بِآَيَةٍ إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ (154) قَالَ هَذِهِ نَاقَةٌ لَهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَعْلُومٍ (155) وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ (156) فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا نَادِمِينَ (157)فَأَخَذَهُمُ الْعَذَابُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآَيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ (158) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ . (159) الشعراء...

ئێمە كە باس لە ژیانی پێغەمبەران دەكەین و تەنها تیشك دەخەینە سەر ژیانی بیست و پێنج پێغەمبەر ئەوا لای هەمووان روون و ئاشكرایە كە تەنها ئەم بیست و پێنج پێغەمبەرە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەناویان كراوە و پێنجیشیان ئولولعەزمن.. ئەمجارە باسی یەكێك لە نێردراوەكانی خودای گەورە دەكەین ، كە ئەویشیان حەزرەتی ساڵحە سەلامی خودای گەورەی لەسەر بێت.

گەلێك هەبوو نزیكەی پێنج سەد و هەشتا كیلۆمەتر لە مەدینەی پیرۆز دووربوون و بە گەلی ثمود ناسراو بوون ، وشەی ) ثمود ( بە مانای بێ ئاوی و وشكایی دێت ، تابڵێی گەلێكی سەرسەخت و كەللە رەق و بت پەرست بوون ، ئەم گەلە باش دەیانزانی كە بەر لەوان گەلێك هەبووە بەناوی عاد و دواتر بەهۆی تاوانەكانیان خودای گەورە هەمووی لەناو بردن و بوونیان لەسەر زەوی نەما. ناوی ئەو گەلە لە باپیرەیانەوە هاتبوو بە بەردەوامیی لە لووت بەرزی و بت پەرستیی دابوون و سەرپێچی بریارو راسپاردەكانی خودایان دەكرد ، هەربۆیە خودا حەزرەتی ساڵحی بۆناردن كە ئەم پێغەمبەرەش لە نەوەی باپیرە گەورەی بووە كە ) ثمود ( ە ، لەسورەتی الحجر بەرروونی باس لەو گەلە كراوە ، تابڵێی شوێنێكی خۆش و رازاوە و جوانیان هەبووە ، كەسەرتاپای شارەكە سەوزایی بووە ، خودا بۆیە باس لەم گەلە دەكات چونكە پەند و ئامۆژگارییان لە گەلانی پێش خۆیان وەرنەگرت و زیاتر لووت بەرزی رووی تێكردن، كە گەلی حەزرەتی نوح بوو، لای ئەوان روون و ئاشكرابوو كەچییان بەسەرهات.

خودا فەرموویەتی ] وإلی ثمود اخاهم صالحا [ كە واتە خودای گەورە برای پشتیانی بۆ ناردن كە ئەویش حەزرەتی ساڵحە سەلامی خودای گەورەی لەسەر بێ ، ] قال یا قومي اعبدوا الله مالكم من اله غیره ... [ پێغەمبەران خۆیان بە برای گەلەكانینا داناوە، براش مانای خۆشەویستی خەمخواردنە، نیشانەی دڵسۆزییە بۆ گەلەكانیان بۆیە لەقورئانی پیرۆزدا بە برا هاتوون.

حەزرەتی ساڵح سەلامی خودای لەسەربێت بە بەردەوام بیری دەهێنانەوە كە بەخشش و نیعمەتەكانتان هەر هی خودایە و هی خۆتان نییە ئەی كەوایە بۆچی ئەو خودایە ناپەرستن كە سەدان نیعمەت و رۆزی پێ بەخشیون بۆچی بتێكی بێ گیان ئەپەرستن ؟ دەی ئەگەر خواتان بیرچووە داوای ئیستغفارو تەوبە بكەن ] ثم توبوا الیە ان ربي

قريب مجــيب... ]
گەلی ) پمود ( ئەوەندە بــە هێزبووینــە تەنانــەت لــە نــاو چــیاو شــاخە بــەرزەکان کۆشــك و خــانووی جــوان و سەرسوڕهێنەریان دروست کردووە ] فتنحتون من الجبال بیوتــا [ ڕێگــاو بــانیــان دروســت دەکــرد شــارەکانیان وەکــو بەهەشت وابووە و هەموو شتێکی تیادابووە ، بۆیە حەزرەتی ساڵح ئامۆژگارییان دەکات کە شوکرانەی نیعمەتی خودا بکەن و لە خودا غافڵ نەبن وەگەرنا دووچاری سزای خودای گەورە دەبن و وەکو گەلانی پێشوو لەناو دەچن..
گەلەکەی کەوتنە خۆ و جۆرەها بوختانیان خستە پاڵ حەزرەتی ساڵح و بە ساحیر و شێت و درۆزن ناوزەدیان کرد ، ئەویش زۆر بەلەسەر خۆیی و نەرم و نیانی وەڵامی دەدانەوە و پێی دەفەرموون خراپەکانی من چین و دەنگ بکــەن و بۆم دەستنیشـــــــــان بکەن.
پێغەمبەر ساڵح پێی فەرموون ئەی ئەگەر من بەڵگەیەکی دروست و راست و رەوانم بۆ هێنــان ؟ ئــەوانیش وتیــان ] ماانت الا بشر مثلنا [ و یاخود ] فأتي بایت ان کنت من الصادقین [ خۆیان داوایان کرد کــە هەقیقــەت و راســتیان نیشان بدات ، حەزرەتی ساڵحیش پێی فەرموون ئێوە خۆتان داوای شتێك بکەن لە ئایاتەکانی خودای گەورە تاوەکو نیشانتان بدەم ؟...
وتیان ئەی ساڵح ئەم سێ بەردە گەورە و زلە لەسەر ئەم شاخە ئەبینیت ؟ داوا دەکەین گەورەترین وشتر لە ناو ئــەو سێ بەردە بێنیتە دەرەوە و رەنگی سپی و تووکن بێت و بەچکەیەکی دە مانگانەی لە سکییەوە بێت   !!!...
لێرەوە حەزرەتی ساڵح لە خودا دەپاڕێتەوە و نزا دەکات ، بە فەرمانی خودا هەموو شاخەکان دێنە لــەرزین و ئــەو وشترەی ئەوان داوایان کرد لەناو بەردەکان هاتــە دەرەوە !!. بــەڵام هــەر گــەلێك خۆیــان داوای موعجیزەیــان لــە پێغەمبەرەکانیان کردبێ و دواتر باوەڕیان بەو موعجیزەیە نەهێنابێت ئــەوا بــەر ســزای بــە ئێــشی خــوای گــەورە کەوتوون و لەناوچوون.
هەرچی خەسلەت و ویستی ئەو گەلەی حەزرەتی ساڵح بوو لە وشترەکە خودا نیشانی دان و ئنجا حەزرەتی ساڵح پێی فەرموون ] هڑە ناقە اللە [ ، بەڵام هەر باوەڕیان پێنەکردو و تیان ئەمە سیحرە و چۆن شتی وا دەبێــت ؟ ئــە مجارە وتیان با بۆماوەی چەند هەفتە و مانگێك وشترەکە لەناوماندا بمێنێتەوە بزانین چی بەسەر دێت ، چونکە لە کاتی هاتنە دەرەوەی وشترەکە حەزرەتی ساڵح ئاگاداری کردنەوە کە لە وشترەکە نزیك نەبنەوە.
ئەو ئاوەی لەلای گەلەکە هەبوو هەمووی وشترەکە دەیخواردەوە و بەشی ئەوانی نەدەکرد سکاڵای حاڵی خۆیان بردە لای حەزرەتی ساڵح کە وشترەکە ئاوەکەمانی هەمووی نۆش کردووە و بەشی ئێمە ناکات .. خودا وەحیی بۆ حەزرەتی ساڵح نارد کە ئاوەکە دابەش بکەن ڕۆژێك بۆ ئەوان و ڕۆژێکیش بۆ وشترەکە ، سەیر لەوەدابوو هــەر ڕۆژێــك نــۆرەی وشترەکە بووایە ئەو ڕۆژە بەقەد هەموو شارەکە شیری پێ ئەبەخشین ... گرفتی ئەو گەلە لەوەنەبووە کە پێویستیان بە موعجیزەیەکەتاوەکو باوەڕی پێ بهێنن، چونکە حەزرەتی ساڵح زۆر کەسێکی خۆشەویــست بــوو هــەروەها لــەلای گەلەکەیشی بەراستگۆ ناسراو بوو ...هەرناوەکەیشی خۆی لەخۆیدا پەیامێکە ) صالح ( لە ) صلح ( و لە ) اصلاح ( ە، وە هاتووە، دنیا پەرستی و ئارەزوو پەرستی دوو دەردی زۆر گەورەن ..دڵەکان ڕەش ئەکــەن و چــاوەکانیش کــوێر ئەکەن و دڵەکانیش کز ئەکەن و ئە یمرێنن .
.کە بەچکەکەی دانا ئەویش هەروەکو خۆی بوو بەهەمان قەبارە و خەسڵەت ، سەردەستەی گەلەکەی ساڵح کەوتنــە بیر کەوتنەوە و تیان با وشترەکە بکوژین و لەناوی بەرین ، کێیان هەڵبژارد ] کذبت ثمود بطغواها إذ بعث اشقاها [ لەناو خۆیان خراپترین و نەگریسترین پیاویان بۆ پیلانەکە دەستنیشان کرد .. پێغەمبەر سەلات و ســەلامی خــودای

لەسەربێت بە ئیمامی عەلی دەفەرمووێت دەزانیت خراپترین پیاو کێیە ؟ دەڵێ نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ، حەزرەت دەفەرمووێت : ئەوکەسەی وشترەکەی ساڵح پێغەمبەری کوشت و ئەو کەسەش کەتۆ دەکوژێت و خوێن لەسەرت دەهێنێت
.

بەڵام ئەو پیاوە خراپە چۆن وشترەکەی کوشت ؟ لە رادەبەدەر عەرەقی پێدراو تەواو سەرخۆش و مەست کرا و ئنجا وشترەکەی کوشت . کەئەو کارەی کرد حەزرەتی ساڵح لەو شوێنە نەبوو کە گەڕایەوە بینی گەلەکەی لە خۆشیدان و گۆشتی وشترەکە ئەبرژێنن و ئەیخۆن !!! وتیان ئەممەمان کرد و چیت لەتوانادایە بیکە و بە گاڵتە پێکردنەوە ئەم قسانەیان بە حەزرەتی ساڵح ئەووت ، بەمەش نەوەستان لە چەند هۆزێك نۆ پیاویان کۆکردەوە بۆ ئەوەی حەزرەتی ساڵح لە ناو بەرن ...

وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ (61) قَالُوا يَا صَالِحُ قَدْ كُنْتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَذَا أَتَنْهَانَا أَنْ نَعْبُدَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ (62) قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كُنْتُ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي وَآتَانِي مِنْهُ رَحْمَةً فَمَنْ يَنْصُرُنِي مِنَ اللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُ فَمَا تَزِيدُونَنِي غَيْرَ تَخْسِيرٍ (63) وَيَا قَوْمِ هَذِهِ نَاقَةُ اللَّهِ لَكُمْ آيَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ قَرِيبٌ (64) فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُوا فِي دَارِكُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ ذَلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ (65) فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَالِحًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنَّا وَمِنْ خِزْيِ يَوْمِئِذٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ (66) وَأَخَذَ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ (67) كَأَنْ لَمْ يَغْنَوْا فِيهَا أَلَا إِنَّ ثَمُودَ كَفَرُوا رَبَّهُمْ أَلَا بُعْدًا لِثَمُودَ(68) هود.

لەناو ئەو هۆزانە ئافرەتێك هەبوو تا بڵێی لەش فرۆش و بێ ڕەوشت بوو و چەند کچێکی هەبوو بە نۆ پیاوەکەی وت ئەوەی ساڵح پێغەمبەرم بۆ بکوژێت یەکێك لە کچەکانمی پێشکەش ئەکەم بەبێ بەرامبەر تەنها بۆ رابواردن ، هاتنە لای حەزرەتی ساڵح لە ماڵەکەی خۆی و پێیان وت : تۆ بە سزای خوداکەت دەمانترسێنیت دەی کەوایە ئەگەر راست ئەکەیت کوا سزای خوداکەت ، بۆیە دەستبەجێ فریشتەکانی خودا ئەو کۆمەڵە پیاوەیان بەرد باران کرد و لە ناویان بردن و حەزرەتی ساڵحیان رزگارکرد ، دواتر حەزرەتی ساڵح ئاگاداری گەلەکەی کردەوە و پێی فەرموون کە بۆماوەی سێ رۆژ لە ماڵەکانتان نەیەنە دەرەوە و چاوەڕێی سزای بە ئێشی خودا بکەن کە بۆتان دەنێرێت. حەزرەتی ساڵح لەگەڵ ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵیدابوون لە شاردوورکەوتنەوە ، بۆبەیانی خەڵکە لەماڵ هاتنە دەرەوە و هەرهەموویان رەنگ زەرد رووخساری داپۆشیبوون ، بۆ رۆژی دووەم رەنگیان سوور هەڵگەڕا و بۆ رۆژی سێیەمیش رووخساریان رەش هەڵگەڕا...

دواتر زەوی لەرزەیکی توند سەری هەڵدا کە ماوەی هەشت رۆژی خایاند و هەرهەموویان لەسەر ئەژنۆ کەوتن و جووڵەیان لێبڕا و کەسێك نەیتوانی هەنگاوێك بچێتە پێشەوە...

پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت ] فأخذتهم الصاعقة فكانوا كهشيم محتضر [ دەنگێکی ئەوەندە گەورە و بە ترس کە لەگەڵ دەنگەکە هەرهەموویان سنگیان شەق بوو و کەوتن ] .. فدمدم عليهم ربهم بذنبهم فسواها [ شوێن و جێگاکانیان وێران بوو و خاپووربوو و بە ویستی خودا باوەڕدارەکان و حەزرەتی ساڵح رزگاریان بوو و هەرئەوان بەسەر موشریك و خوانەناس و بت پەرستەکان زاڵ بوون...

گەلی ساڵح تائێستاش لەگەڵدابێت شوێنەوارییان ماوە و لەولاتی عەرەبستانی سعودیە وەکو خۆی ماوەتەوە، دروستکردنی شارستانی ئەرکی سەرشانی مرۆڤەکانە لەسەرزەوی .بەڵام نەك بە لەدەستدانی بەهاکان و نەناسینی

خاوەن نیعمەت و بەخششەکان، ئاگاداربە ماڵ و سامان و دەسەلأتداریێتی فریوت نەداو خوای خۆت لەبیر نەکـەیت و بەردەوام بیر لە نیعمەتەکانی خوای گەورە بکەوە، ماڵ و سامان و پارە و پول بۆئەوەیە ببێـت بەخزمـەتکاری تـۆ نەوەك تۆ ببیت بەخزمەتکاری سامان و پارەو پولەکە، شتێکی وانەکەی بەهۆی سامانەکەتەوە پەیوەندیت لەگـەڵ پەروەردگارەکەت بپچرێت.!!!

*

*

پێغەمبەر ئیبراهیم سەلامی خودای گەورەی لەسەربێت:

وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَاهِيمَ (69) إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا تَعْبُدُونَ (70) قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَـاكِفِينَ (71)
قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ (72) أَوْ يَنْفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ (73) قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آَبَاءَنَا كَذَلِكَ يَفْعَلُونَ (74) قَـالَ
أَفَرَأَيْتُمْ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ (75) أَنْتُمْ وَآَبَاؤُكُمُ الْأَقْدَمُونَ (76) فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِي إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ (77) الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ
يَهْدِينِ (78) وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ (79) وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ (80) وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ (81) وَالَّـذِي
أَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ (82) رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ (83) وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِـي
الْآَخِرِينَ (84) وَاجْعَلْنِي مِنْ وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ (85) وَاغْفِرْ لِأَبِي إِنَّهُ كَانَ مِنَ الضَّالِّينَ (86) وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ
.(87)الشعراء...

پێغەمبەرێکی بەهێز و ئۆقرە گر و خۆراگر ، بە هێز بەو مانایەی کە بە هێز بووە بەرامبەر عیبادەتی خودای گەورە و بە ئەمەك و دڵسۆز بووە بۆ شەرع و یاسای خوداکەی ، ئەوەندە کەسێکی راستگۆ و دیندار و لـە خـواترس بـووە و خودا کردوویەتیە خۆشەویســــــــــتی خـۆی ) خلیـل الله ( ، ئەم پێغەمبەرە بـە تـەنها هـەرخۆی رووبـەرووی هەموو ئەزیەت و ئازارێکی دنیا بۆتەوە و کۆڵی نەداوە بێ باکانەو چاونەترسانە بەرەنگاری هەموو دەسەلأتدارێکی سەردەمی خۆی بۆتەوە و داوای لێکردوون دەسبەرداری بت پەرستن بن و روو لە خودا بکەن و تەنانەت لە گەورەترین پاشای ئەو سەردەمە نەترساوە کە نەمرودی ناو بووە.

خودای گەورە فەرموویەتی ] ان اولی الناس بإبراهيم للذين اتبعوه [ ، ئەم حەزرەتی ئیبراهیمە سـەرتـاپای ژیـانی قدوە و پەند و عیبرەتە بۆ هەموولایەك ، لە منالی هەر سـەر مەشـق و قدوەیـە لـە گـەنجێتی و پیربـوون و تـا ئەوکاتەی ئەبێت بە باوك هەر سەرمەشقی مرۆڤەکانە، وەك زانیمان کە حەزرەتی نوح لە کاتی سەرهەڵدانی زریان و تۆفانەکە لە خوای گەورە پاڕایەوە و فەرمووی ] وانزلني منزلا مباركا [ و خودا نزاکەی گیرا کردو لە پیرۆزتـرین خاك کەشتیەکەی وەستاند کە لەسەر کێوی جودی بوو، پێغەمبەر ئیبراهیم سەلامی خـودای لەسـەربێت لـەو خاکـە پیرۆزە هاتە بوون و فەرمان و راسپاردەکانی خودای گەورەی بە هەموو کەس دەگەیاند، ناوی ئیبراهیم لە دوو وشـە پێکهاتووە لە کوردەواری ئەوتریٚ ) برایم( ، ) برا ( ، ) یم ( واتا ) برای من ( یاخود ) برا ( ، ) هیم ( و ) هیم ( بە واتای زانست دێت بەزاری کرمانجی سەروو، بۆیە بەدوور نازانرێت کە حەزرەتی ئیبراهیم لەکوردستانەوە لەدایك بووبێ، ناوی باوکیشی ) ئازەر( ە، کە پاڵپشتی ئەم قسەیە دەکات بەڵام نەزانراوە بەچ زمانێك قـسەی کـردووە، یان کورد بووە یاخود هەرنەتەوەیەکی تر، گرنگ ئەوەیە چی کردووە و فێری چیمان ئەکات.

خودای گەورە ئەم پێغەمبەرەی بە خۆشەویستێکی لە رادەبەدەرو نزیـك لـە خـۆی ناوبـــــــــــردووە ] واتخذ الله ابراهيم خليــــلا[ ، بۆیە یەکەم سیفەتی ئەم پێغەمبەرە ) خلیل ( بـووە . هـەروەها ئـەم ئیبراهیمـە بـە تـەنها ئوممەتێك بووە ] إنّ ابراهيم امة قانتا لله حنيفا ولم يكن من المشركين [ ، بەو مانایەی تاعەت و عیبادەتی ئـەم

پێغەمبەرە بەرامبەر ئومەتێك بووە، سیفەتێكی تری حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خودای لەسەر بێت وەفاداری بوو بۆ پەیامەكەی خودا ] وإبراهيم الّذي وفىّ [ بەوەفا بـووە بەرامبـەر جێبـەجێكردنی بڕیارەكـانی خـودا و پـەیمان و راسپاردەكانی بە جێ دەهێنا.

هەروەها یەكێكی تر لە سیفەتەكانی حەزرەتی ئیبراهیم راستگۆیی بووە ] واذكر في الكتاب ابراهيم انه كان صديقا نبيا [ زۆر راستگۆ بووە و بەرلەوەی ببێت بە پێغەمبەر راستگۆ بووە ) صديقا ( صديق بە مانای راستگۆ دێـت و بـە هیچ شێوەیەك درۆی نەكردووە و پاك بووە.

سیفەتی ئەم پێغەمبەرە زۆرن و بێ شومارن هەروەها خودا فەرموویەتی ئەم پێغەمبەرە كەسێكی نەرم و نیـان و زۆر ئارامگر و سنگ فراوان بووە، لەهەمان كاتیش بەردەوام بۆلای خودا گەڕاوەبووە و ئیستغفاری كردووەولالاوەتـەوە ] إنّ إبراهيم لحليم اواه منيبٌ ... [ خودا فەرموویەتی ئەگەر كەسێك چاو لەو پێغەمبەرە نەكات و وەكو ئـەو نـەبێت ئەوا گومڕاو سەرلێـشێواوو سـەرگەردانە، بزانـە خـوای گـەورە مـەقامی ئـەو پێغەمبـەرەی چـەندە بـەرز و بڵنـد كردووەتەنانەت لە نوێژەكان لە كاتی خوێندنی لە تەحیاتەكان هەر دەبێ ناوی بهێنیت وەگەرنا نوێژەكەت بەتاڵە )اللهم صلي على محمد وعلى ال محمد كما صليت على ابراهيم وعلى ال ابراهيم( ، شـۆرەت پەیـدا كـردن بـەجێ هێشتنی ئاكار و خەسڵەتی جوانە، حەزرەتی ئیبراهیمیش لای خوای گەورە بە هەموو ئاكارە جوانەكان ناسراو بـوو، ئاخۆ من و تۆش لای ئەو خوایە گەورەیە چ شۆرەتێكمان هەیە.

باوكی پێغەمبەر ئیبراهیم كە ئازەری ناوبوو تـابڵێی پیاوێكی موشریك و بـت پەرسـت بـوو بەبـەردەوام حـەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت ئامۆژگاری باوكی دەكرد كەلەبەرچی بت دەپەرسـتێت كـە هـیچ سـوود و قازا نجێكی ئەوتۆوی بۆتۆ نییەو تەنانەت توانای جووڵە و قسەكردنیشی نییە ] يا أبتي إني قد جاءني من العلم مالم يأتيك فاتبعني اهديك صراطا سويا [ باوكە گیان هەندێ زانیاریم وەرگرتووە و، لە خـوداوە بـۆم هـاتووە و بۆتۆ نەهاتووە بەدوای من بكەوە رێگایەكی راست و رەوان دوور لەشیرك دەدۆزیتەوە، بزانە چەندە بە نەرم و نیانی و لەسەر خۆییەوە ئامۆژگاری باوكی دەكات بەبێ ئەوەی هەڵبچێت و تووڕەبـوون رووی تێبكـات، چـەندە زیـرەك و زیتەڵە كە زانست دەخاتە پێش ناوی خۆیەوە و داوا دەكات كە باوكی دوای زانستەكەی بكەوێت، باوكیشی دەیەوێت بزانێ زانست و زانیاریی كوڕەكەی چییەو داوای لێدەكات . حەزرەتی ئیبراهیم سـەلامی خـودای لەسـەر بێـت پێـی دەفەرمووێت ] لاتعبد الشيطان إنّ الشيطان كان للرحمن عصيا [ ئەی باوكـە گیـان شـەیتان مەپەرستە و بـەدوای شەیتان مەكەوە، باوكیشی وەڵامی دەداتەوە ] أراغبٌ انت عن الهتي يا أبراهيم لان لم تنتهي لارجمنك وهجرني مليا [باوكیشی پێی دەڵێت : گەر واز لەم قسانە نەهێنیت بەرد بارانت ئەكەم و هەرنامەوێت بشتبینمەوە ، ئیبراهیمـی سیانزە ساڵان چ وەڵامێكی باوكی ئەداتەوە؟ پێی دەفەرمووێ :سلامٌ عليك ، واتـا تۆ لەسەر دەستی منـدا سـەلامەت ئەبیت و زیانت پێناگات.

ئنجا حەزرەتی ئیبراهیم بە ئازەری باوكی ئەڵێت :مـن لـەئێوە دوور ئەكەومـەوە كەمەبەسـتی گەلەكەیـەتی نـەك بەتەنها باوكی چونكە باوكیشی خستە ناوگەلەكەیەوە چونكە ئەویش وەكو ئەوانی تر بت پەرست و موشریك بـوو، ئەم حەزرەتی ئیبراهیمە ئەوەندە حەلیم و خەمخۆربووە و تەنانەت لەرۆژی قیامەتیشدا داوا لەخوای گەورە دەكـات كە رەحم بەباوكی بكات و دەفەرمووێت : ئەی خودایە خۆت فەرمووتە لە نزیكەكانی تۆ خۆش دەبم دەی ئەوەباوكمەو بیخە ژێر رەحمەتی خۆتەوە، خودای گەورەش دەفەرمووێ :نەخێر ئەی ئیبراهیم من لەدنیا مۆڵەتم پێدان و بەگوێی تۆیان نەكرد و ئەمڕۆ لێبووردەیی من ئەوانە ناگرێتەوە چونكە رێگەی تاریكایی و شەیتانیان گرتەبەر و پشتیان لە

شەرع و بەرنامەکەی من کرد، و منیش بەهەشتم لەوانە قەدەغەکردووە .
خودای گەورە ئەوەندە حەزرەتی ئیبراهیمی خۆش ویستووە و وای کرد هەموو مەلەکوتەکانی ئاسمان بەچاو ببینێت کە زۆربەی زاناکانیش لەسەر ئەوڕایەن کەتاکە کەسێك بەر لە محمّد صلى الله عليه و سلّم ئاسمانەکانی بینیبێت، ئەوکەسە حەزرەتی ئیبراهیم بووە ، موشریکەکان لەسەر تاون و گوناهەکانیان بەردەوامن کەئەویش تاوانی گوێنەدانە بەحەزرەتی ئیبراهیم وراسپاردە وبڕیارەکانی خودا کەبۆی ناردوون، ڕۆژێك لەرۆژان بۆئاهەنگ و بۆنەی خۆیان موشریکەکان دەچنە دەرەوەی شارو داوا لەحەزرەتی ئیبراهیمش دەکەن بچێت لەگەڵیان، بەڵام حەزرەتی ئیبراهیم پێیان دەڵێت : من نایەم وئـــــــــازارم هەیە ] انی سقیم [ ناڵێت من نەخۆشم بەڵکو دەڵێ : من بە ئازارم، واتە ) بە ئازارە بۆ حاڵیان.(
حەزرەتی ئیبراهیم درۆناکات و راست ئەکات چونکە دڵی بۆ ئەوان بە ئازارە کەسەرپێچی خودا دەکەن وڕێگای کوێرایی دەگرنەبەر، و پێشتر پێی وتن کەڕۆژێك دادێت شار لەوبتانە خاڵی دەکەمەوە و پاکی دەکەمەوە، بەڵام موشریك و بت پەرستەکان ئەو قسەیەی ئیبراهیمیان بیر نەماوە، کەشار چۆڵ بوو و کەسی تیانەما خودا وەحیی بۆدەنێرێت کەبتەکانیان بشکێنێت کەخۆیان دروستیان کردووەو هەرخۆیشیان ئەیپەرستن...
هەمووبتەکان ئەشکێنێت تەنها گەورەکەیان نەبێت کەبەردەوام کڕنووشیان بۆدەبردوقوربانیان بۆ دەکرد، حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خودای لەسەربێت تەوروئەوکەرەستانەی کەبتەکانی پێ شکاندووە دەخاتە سەرشانێکی بتەگەورەکەودەچێتەوەماڵەوەو، دەخەوێت، کەبت پەرستەکان دەگەڕێنەوە شارو دیمەنی بتە شکێنراوەکان دەبینن شۆك دەیانگرێت و دۆش دادەمێنن.
لەیەکتری دەپرسن دەبێ کێ سووکایەتی بە خوداکانی ئێمەی کردبێ ؟ دەکەوێتە بیریان خۆمێرد منداڵێك لەگەڵ ئێمە نەهات ولەشارمایەوە کەئەویش ئیبراهیمی ناوە، دەیگرن و لەناو هەمووخەڵکدا دەیگێڕن، و ئەویش زۆر بێ باکانەو چاونەترسانە دەفەرموویێت ] حسبي الله ونعم الوكيل [ و ڕووی تێدەکەن وپرسیاری لێدەکەن ] اانت فعلت هذا بألهتنا [ ئەویش چاونەترسانە ڕوویان تێدەکات و ] قال بل فعله كبيرهم فسألوه فارجوا الى انفسهم [ و دەی لێی بپرسن باوەڵامتان بداتەوە، تۆسەیری ئەم قسەیەی ئیبراهیم بکە چ وەڵامێکیان ئەداتەوەکەلەوکاتە بێ دەنگ دەبن !!!!.... ئەکەونە ژێر ژێر پرسیاری خۆیان، بەڵام جارێکی تر خۆیان بەڕاست زانی !! چونکە بەرژەوەندییان لەوەدایە کە خۆیان بەدەستی خۆیان خودایەك بۆخۆیان دروست بکەن و بازرگانی پێوەبکەن!!!...
گەنجێکی پانزەساڵ شارێك لێی کۆبۆتەوە لە چاوەڕوانی دان بەڵکو بیهێنن و ببینن، کاتێك ئەیهێنن هەرهەموویان بەیەك دەنگ هوتاف لێدەدەن و هاوار دەکەن بیکوژن...بیسووتێنن...لەناوی بەرن ...ئەویش بەمتمانەیەکی زۆرەوە بەخوای گەورەناترسێت و باکی لەکەسێك نییە و زۆر ئازایانە و سەربەرزانە بەناو ئاپۆڕای خەڵکەکەدادەڕوات، کەسێك نییە لەو هەموو خەڵکە پشتی بگرێت و پارێزگاری لێبکات و پشتیوانی بێت ...کەسێك ناڵێت ئازادی بکەن و لێی خۆش بن و کەسێکیش نایەتە گۆڕەپانەکە و بەرەنگاری موشریکەکان بێتەوە و پارێزگاری لەحەزرەتی ئیبراهیم بکات...
بەڵام ئەگەر کەسێك بەبەردەوام پشت بەخوای گەورە ببەستێت و زیکری بکات ئەوا بێگومان خوای گەورە پارێزگاری لێدەکات.

لێرەوە حەزرەتی ئیبراهیم تەنها پشت بەخوای گەورە ئەبەستێت و ئەفەرموویێت ] حسبي الله ونعم الوكيل [ واتا

خواى گەورە بەسە بۆئەوەى بەهانام بێت و سەرم بخات و لەسەرم بــەوەڵام بێــت و هتــد ...بۆچــى ) حــسبى الله ( هاتووە و ناوێكى تر نەهاتووە؟ چونكە ) حسبي الله ( تەعبیر و گوزارشت لەهەموو ناوەجوانــەكانى خــواى گــەورە دەكات وەكو خواى گەورە دەفەرمووێت ] هو الخالق الباريء المصور له الاسماء الحسنى [ .... دەى تۆش خواى گــەورە بكە بە وەكیلى خۆت و پشتى پىٚ ببەستە ...ئایا رازیت خواى گەورە بكەیت بە وەكیلى خۆت ؟ ئەگەر وەڵامەكەت بــە بەڵىٚ بێت ئەوا بێگومان كەسێكى بەختەوەریت و دڵیشت ئاسوودە دەبێت و چــۆك دامــەدە بەرامبــەر بــە گرفتــەكان، ئەگەر كەسێك خواى هەبێت باكى چییە ..گەر كەسێك خواى گەورە پشت و پەناى بێت كەواتــە تــرس و دڵــەڕاوكێى بۆچییە ..بۆیە خواى گەورە و میهرەبان یارو یاوەرت بێت بەستە..

حەزرەتى ئیبراهیم پێیان دەڵێت : چۆن دەبێت كە خودایەك بپەرستن قسەنەكات و جووڵەى نەبێت ؟ ئــەم وەڵامــەى بۆئەوەیە كەئاقڵانە بجووڵێن و بزانن كىٚ دروستى كردوون..

تووڕەدەبن و دەست وپێى بەستراوەو دەیــانووت :بیــسووتێنن و بیــبرژێنن، هەنــدێكیش دەیــانووت : بەمەنجــەنیق بــەردبارانى بكــەن، دەســتیان كــرد بەچــەپڵەڕێزان كــەئیبراهیم دەســووتێنرێت، ئیــبراهیم دەهێــنن و لەچواردەورییەوەئاگرێكى لەرادەبەدەر گەورەدەكەنەوە وبەو ئومێدەن كە حــەزرەتى ئیــبراهیم بــسووتێت و ببرژێــت، لێرەوەفریشتەى باران بارین داوا لەخوداگەورە دەكات رێگەى پێبدات باران ببارێنێت و خــوداش پێــى دەفــەرمووێت نەخێر ئەمە لەدەسەڵاتى مندایەو هەرخۆم رزگارى ئەكــەم، لەولایــشەوە ســەرجەم فریــشتەكانى خــودا دەگــرین و نزادەكەن كە حەزرەتى ئیبراهیم رزگارى بێت.

موشریكەكان چەندین رۆژە خەریكى كردنەوەى ئەو ئاگرە گەورەن و لەچاوەڕوانى ئەوەدان بەكەمترین ماوە ئیــبراهیم بسووتێنێت و بیبرژێنێت، بەڵام ویستى خوداوایە نابێت ئیبراهیمى خۆشەویستى بسووتێت، خودا فەرمان بە ئاگرەكە دەكات ] یانار كني بردا وسلاما على إبراهیم [ ئەى ئاگر ساردبە و ئیبراهیم سەلامەت بێت، بەڵام نەوەك زۆر ساردو لەتاو ساردییەكەت ئیبراهیم رەق بێتەوە، بەڵام ساردییەك زەرەر بەجەستەى نەگەیــەنێت .ئاڵەوكاتــەدا ئیــبراهیم بەویستى خودا ناسووتێت وهەموو كۆت و زنجیرەكانى دەست وپێى ئەپسێن !!!.... لێــرەوە خــواى گــەورە دەیــەوێت سەرنجمان بۆئەوە رابكێشێت گەر هەموو دنیا بەجارێك لێت كۆببێتەوە و بیانەوێت ئەزیەت و ئــازارت بــدەن، ئــەوا ناتوانن ئەزیەتت بدەن و لەناوت ببەن.

خۆ خواى گەورە دەیتوانى بەبەرچاوى هەرهەموویان حەزرەتى ئیبراهیم بۆ ئاسمان بەرز بكاتەوە یــاخود بــارانێكى بەگوڕ ببارێنێت بۆ ئەوەى ئاگرە گەورەكە بكوژێتەوە، بەڵام خواى گەورە لێرەوە فێرمان ئەكات لــە رێــى حــەزرەتى ئیبراهیمەوە هەرچەندەى ناخۆشى تەنگى پىٚ هەڵچنین و لەناو ناخۆشیدا بین ئەوا خواى گــەورە ئــەوا زۆر ئاســانە خواى گەورە رزگارت بكات و دەرت بهێنێت، بەڵام دەبىٚ تۆش متمانەى ئیبراهیمت هەبێت بە پەروەردگارتەوە.

راستەوخۆ لەئاگرەكە دێتە دەرەوە، بۆیە لەكۆتایى تەمەنیدا پرسیار لەحەزرەتى ئیبراهیم دەكەن كەخۆشترین رۆژلاى تۆ كەى بووە؟ دەفەرمووێ ئەوكاتەبوو كەسىٚ رۆژلەناو ئاگرە گەورەكە دابــووم، چــونكە بــەردەوام خــودا خــۆراك و خواردن و خواردنەوەى بۆدەناردم !!!!...

دواى سىٚ رۆژلەناوئاگرە گەورەكە حەزرەتى ئیبراهیم بەبەرچاوى هەموو كەسێك دێتەدەرەوەو دەســتەكانى لــەكۆت و زنجیر خاڵین و تۆزوخۆڵەكانى سەرشانى پــاك دەكاتــەوە، لێرەبەتــەنها تاكــە كەسێك بــاوەڕى پێــدەهێنێت كــە ئەویشـــــــــــیان حەزرەتـــــى ) لوگ ( پێغەمبـــــــــــــــەرە ]فـآمَن لـه لـوط [ ، رووداوەكــە گەیــشتە نەمرودى ستەمكار و بۆیان گێڕاوە، و بانگى حەزرەتى ئیبراهیم دەكات و لەگەڵیدادەكەوێتە گفتوگۆ كەوەسفێكى ئەم

خوایەی خۆتم بۆ بکە کەدەبیپەرستی بزانم چ خودایەکە..؟؟؟
حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی خودای من مردووزیندوو دەکاتەوە، نەمرود وتی :منیش دەتـوانم !!!! دووبەنـدکراوی هێنا یەکێکیانی کوشت و ئەوەی تری خستەوە بەندیخانە و تی : کەواتە منیش توانام هەیە مردوو زیندووبکەمەوە، حەزرەتی ئیبراهیم گاڵتەی بەعەقڵی نەمرود هات و وەڵامی نەدایەوە.
ئەمجارە حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی خوای گـەورە خـۆر لـە رۆژهەڵاتـەوە دەگەیەنێتـە خـۆراوا، دەی تـۆ بتوانـە بەپێچەوانەوە خۆر بهێنیتە رۆژهەڵات .. نەمرود هیچی بۆ نەکراو لەئاست ئەم داوایەی حـەزرەتی ئیـبراهیم سـەری شۆڕکرد ] فبهت الّذي كفر [ ، نەمرود فەرمانی کرد دەری بکەنـە دەرەوە و ناشـبێت لـە وشـارە بمـێنێ، حـەزرەتی ئیبراهیم سارای ئامۆزای هێناو گواستیەوە و پاشان لەگەڵ ساراو حەزرەتی لوگ کەبرازای حەزرەتی ئیبراهیم بوو شار بەجێ دەهێڵن و بەرەو شام دەکەونە رێ، لەکاتی رۆیـشتنیا حـەزرەتی ئیـبراهیم دەفـەرموێ ] إنـي ذاهـب الى ربـي سيهدين [ بەومانایەی لەرێی خوا لەشاردەرکرامە دەرو هەرلەرێی خواش رێگادەگرمە بەر بۆ هیدایەتدانی خەڵکی.
دەگاتە شام ، کۆمەڵەگەلێك ئەبینێت هەندێکیان مانگ ئەپەرسـتن و هەنـدێکیان ئەسـتێرە و هەندێکیـشیان بـت ئەپەرستن، ئەویش پێیان دەڵێت : بۆ شتی گـەورەتر نـاپەرسـتن واتەبۆئەسـتێرەی گـەورەتر نـاپەرسـتن ئـەوانیش دەیانووت :راست دەکات، بەرەبەرە تاگەیشتە ئەورادەیەی کەبۆ خـودا نـاپەرسـتن کەخودایـەکی تـاك و تەنهایـەو هەرئەویش ئەم هەمووگەردوون و ئەستێرەیەی دروست کردووە، وتیان بەخوا ئەمە گاڵتەمان پێدەکات و وتیان دەبێت لەم شارە دەربکرێتەدەرەوە، وبڕیارەکەیان هێنایە جێ و حەزرەتی ئیبراهیم لە شام دوورخرایەوە، حەزرەتی ئیبراهیم روو لەهەر شارێك دەکات بەپەرۆشەوە روو لە خەڵکەکە دەکات و لە راسپاردە و بڕیارەکانی خوای گەورە ئاگاداریيان دەکاتەوە کەچی ئەو بەبەردەوام دووچاری ئەزیەت و شاربەدەر کردن دێتەوە!!!..
ئەمجارەبەرەو میسر رێگای گرتەبەر، حەزرەتی ساراش کە خێزانی ئیبراهیم پێغەمبەرە نموونەی نەبووە لەجوانیدا و لە دوای دایکە حەوا جوانترین ئافرەتی سەرزەوی بووە .پاشای میسر بەم هەواڵە دەزانێت جوانترین ئـافرەت رووی لەمیسر کردووە داوای دەکات و دەڵێت بیهێنن، پێش ئەوەی بیانبەن بـۆلای پاشـا، حـەزرەتی ئیـبراهیم بەسـارای خێزانی دەفەرمووێت :بەم پاشایە ئەڵێم کەمن برای تۆم ، واتە برای ئیمانی چـونکە هـەرمن و تـۆ ئیمانـدارین، بەرلەبانگکردنی سارا دەستنوێژێك دەشوات و لەخوا دەپاڕێتەوە کە خوائەو مەلیکەی بەسـەر زاڵ نـەکات، سـەیری رەوشت و ئەخلاقی بەرزی ئەم ئافرەتەبکەن کە چەندە باوەڕدارە و دژی ئەوەیە کەسێکی بێگانە دەستدرێژی بکاتـە سەر ، جوانیی و پاکیی ئافرەت لەوەدایە کە شەرەف و کەرامەتی خۆی لەدەست نەدات و بەپاکیی و بێگەردی بژیێت و بمرێت..
کە سارای خێزانی حەزرەتی ئیبراهیم دەچێتە لای ژوورەوە پاشاکە سەری سوڕدەمێنێت و یەکسەر پـەلاماری دەدات و ساراش هاواری خودادەکات و دەڵێت خودایە فریام کەوەن دەستبەجێ پاشا لە شوێنی خۆی دەستەکانی رەق ئـەبن، و هاوار دەکات بیکوژن....
ساراش دوعادەکات تاوەکو نەیکوژن و لەخودا ئەپاڕێتەوە دەستەکانی چاك ببنەوەو، چەندجارێك دوعا دەکات ئنجا دەستەکانی مەلیکەکە چاك ئەبنەوە و پاشا بڕیاردەدات دەری بکەنەدەرەوە و دەڵێت ئەمە ئافرەت نییەو شـەیتانە و هەندێك زێڕو پولیشی پێبدەن لەگەڵ ئافرەتێکی خزمەتکار بەڵکو دوعاکانی کارم لێنەکات...
خزمەتکارەکەش کێیە ؟ ئەویش هاجەرە خانە کە بەبڕیاری مەلیك بوو بە خزمەتکاری ئیبراهیم و سارای خێزانـی .
سارا بۆماوەی هەشتا ساڵ لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیم مایەوە و منداڵیان نەبوو و رۆژێك لە رۆژان ئەم پێغەمبەرە دڵی

سارای خێزانی نەهێشاند، ساراش روو لەحەزرەتی ئیبراهیم ئەکات و پێی ئەڵێت ئەی ئیبراهیم ژن بهێنەو بۆ ئەم مەبەستە هاجەرە شیاوترین کەستە تاببێت بە خێزانت چونکە خۆت ئەزانیت ماوەی هەشتا ساڵە منالْمان نییەولەتەمەنیش رۆیشتووین، حەزرەتی ئیبراهیم بەگوێی ئەکات و هاجەرەدەکات بەخێزانی خۆی .تۆ ژیانی ئەم پێغەمبەرە بخوێنەوە رۆژێك لە رۆژان ئاخێکی بۆ منالْ نەبوونی ژنەکەی نەخواردو رۆژێك دڵی ژنەکەی نەشکاند کەبڵێت بۆ منالْت نابێت و من دەمەوێ ژن بهێنم !!...چەندین پیاوی ئەم رۆژگارەمان بینیوە کەژنەکەی مندالْی نەبووەراستەوخۆ هەستاوە شیرازەی خێزانیی پچڕاندووە و ژنەکەی تەلاق داوە !!یاخود بەبێ پرسی ژنەکەی چووە ژنێکی تری هێناوە و یاخود پەنا دەباتە بەر ناشوکری و نارازی بوون بە قەدەری خودا، چونکە خودا خۆی ئارەزووی لێبێت منالْ دەبەخشێ هەروەها ئارەزووشی نەبێت نایبەخشێت، یاخود بیبەخشێت بەویستی ئەو کوڕ دەبێت یاخود کچ دەبێت.

پاش ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم کە هاجەرە ئەگوازێتەوە خوا فەرمانیان پێدەکات کە دەبێ بەرەو مەککە بڕۆن و ئەو شوێنە ئاوەدان بکەنەوە، لەوکاتەدا مەککەچۆنە؟ زەوییێکی وشك و چۆلاْیی .ئەوکات مەککەناوێکی تری لێبووە کە پێی دەووترا بەککە، لەوکاتە حەزرەتی ئیسماعیل بچووك بوو و بە پێیان کەوتنەڕێ، هاجەرە هیچ پرسیارێکی لەحەزرەتی ئیبراهیم نەکرد کەبۆکوێ دەڕۆیت و بۆ کوێمان ئەبەیت، چونکە دەیزانی ئەمە بڕیارێکی خودایەو دەبێ بەجێی بگەیەنن و نابێ پشتگوێی بخەن.

زۆر رۆیشتن تاگەیشتن بە بەککە، و حەزرەتی ئیبراهیم جێی هێشتن و تەنانەت شەوێکیش لایان نەمایەوە، و لێرەوە هاجەرە سەیری ئەو وشکاییەو دوور لە ئاوەدانییەدەکات و سەری سوڕدەمێنێت و روو لەحەزرەتی ئیبراهیم دەکات ئایا خودا فەرمانی پێکردووی بێینە ئێرەو تۆ جێمان بهێڵی ؟ حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی بەڵێ ئەمە فەرمانی خودایە، ئنجا هاجەرەی خێزانی وتی : بێگومان خودا دەمانپارێزی و چاودێریمان ئەکات، چونکە بەڕێزەکەم کاتێك گوێت لە فەرمانەکانی پەروەردگارت دەبێت نابێ بڵێیت جارێ نا !!.. یاخود بڵێیت دواتر خۆم پۆشتە ئەکەم و جارێ گەنجم، هاجەرە ئاسا ملکەچیی فەرمانەکانی خوای گەورە بە چونکە دەرگای هەموو خۆشیی و بەختەوەرییەك تەنها لای خوای گەورە و میهرەبانە.

حەزرەتی ئیبراهیم لەشوێنێك جێی هێشتن کە هیچ شتی لێ نەبوو ] بواد غير ذي زرع [ هیچ ئاوەدانی وسەوزایی و ژیانی لێنەبوو، کەمێك خواردنی بۆ بەجێ هێشتن کەتەنها بایی دوورۆژی دەکردن، بەلاْم ئایا کام لەئێمە بۆی هەیە نەك تەنیا شەوێك بەڵکو چەند مانگ و چەندین ساڵ جورئەت بکات وەکو حەزرەتی ئیبراهیم ژن و منالْەکەی لە بیابانێکی وشك و بێ ئاوەدانی جێ بهێڵێ ؟ بێگومان کەسێك ئەو جورئەت و توانایەی نییە، چونکە ئەم پێغەمبەرە ئەوەندە باوەڕی بە خوای گەورە هەبووە تەنانەت لای زۆر روون و ئاشکرابوو کەخودا هەرخۆی پارێزگارو چاودێری ژن و منالْەکەیەتی، ئەی چ ئافرەتێك ئەو غیرەت و هێزو خۆڕاگرییەی هاجەرەی خێزانی حەزرەتی ئیبراهیمی هەیە؟ بەڵێ غیرەت غیرەتێکی پڕاو پڕ و خۆڕاگر بەرامبەر بەم بیابانە وشك و بێ درەخت و بێ سەوزاییە، لێرەوە حەزرەتی ئیبراهیم لەبیر نەکەیت، ئاخۆ چ هەستێك دایگرتووە .خێزانی و ئیسماعیلی تاقانەی لە بیابانێکی وشك بەجێ دەهێڵێت و دڵی چی بکات و چەندە بە ئازار بێت، بەلاْم ئەزانێت کە خوای گەورە و میهرەبان بەسۆزو میهرەبانترە لەو بۆخێزان و منالْەکەی.

وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا الْبَلَدَ آَمِنًا وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الْأَصْنَامَ (35) رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ فَمَنْ تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (36) رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنْتُ مِنْ ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِنْدَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ

رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُمْ مِنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ (37) رَبَّنَا إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُ وَمَا يَخْفَى عَلَى اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ (38) الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى الْكِبَرِ إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ الدُّعَاءِ (39) رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ (40) رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ .(41) ابراهيم.

شەویان بەسەردا دێت و ئیسماعیل زۆر دەگرێیت و هیچیان لانییەو حەزرەتی هاجەر هەڵدەستێتە سەرپێ و لەنێوان دووشاخ کە ئێستاکە بۆتە شوێنی سەفا و مەروە، لەو شاخ بۆ ئەو شاخ دەڕوات بەڵکو ئاوەدانییەکی بەرچاو بکەوێت و تاوەکو بەهۆیەوە خۆراکێك بۆ ئیسماعیل پەیدا بکات بەڵکو ژیر بێتەوە و گریانەکەی بوەستێت، بێ تاقەتی رووی تێدەکات ئەوەندەی بەرەو شاخەکان لەلایەك و بۆلای ئیسماعیل لەلایەك رابکات، ئا لەم کاتەداو بەبڕیاری خودای هەموو جیهان و لەژێر پێیە ناسکەکانی ئیسماعیلی کۆرپەلە ئاوێك هەڵدەقووڵێت و فوارە دەکات.

بڕوانە بڕیاری خوای گەورە بۆ ئەم دووکەسە و بەنووکە باڵێکی حەزرەتی جبریلی ئەمین ئاوی زەمزەم لەم بیابانە وشکەی مەککە و لەژێرپێی ئیسماعیلی کۆرپە ئاوی زەمزەم هەڵدەقووڵێت، بەلاَم چ ئاوێك گەر بیخۆیتەوە تاوەکو چەند رۆژێك هەست بەبرسێتی ناکەیت .لەوکاتەوە ئەو ئاوەی زەمزەمە هەر هەڵدەقووڵێت و کۆتایی نایەت و رەنگ و بۆنیشی وەکوخۆی دەمێنێت، لەوکاتەشدا گەلێك لە یەمەن هەبوون و رووبارێکیان هەبوو، لەنێوانی رووبارەکە بەربەستێك هەبوو کەبەو هۆیەوە خەمیان لەمەترسی و دڵەراوکێ نەبوو، بەویست و فەرمانی خودای گەورە بەربەستەکە دەڕووخێت و گەلەکە لەبەر بێ ئاوی و دەستنەکەوتنی ئاوی پێویست بەرەو مەککە پەراگەندە و ئاوارە دەبن و لەنزیك ئەوشوێنەی هاجەرو ئیسماعیلی لێ نیشتەجێ یە نزیك بوونەوە و وتیان : ڕێگەمان بدە لێرە بمێنینەوە و دا بمەزرێین.

هاجەرەش ڕێگەی پێدان و وتی بەمەرجێك دەمەوێت ئیسماعیلی کوڕم فێری زمانی عەرەبیی بکەن، ئیسماعیلیش لەناو ئەوخەڵکە ئاوارەیە مایەوە وفێری زمانی عەرەبیی دەبێت، پێغەمبەر ئیبراهیم دوعا دەکات و لەخوا دەپاڕێتەوە [ ربي اجعل هذا البلد امنا وارزق اهلها من كل الثمرات [ هێشتا بینای کەعبەی دانەمەزراندووە نزا بۆ ئاوەدانی ئەو شوێنە دەکات، خودای گەورەش نزاکانی حەزرەتی ئیبراهیم گیرا دەکات، هەروەها فەرمووشی ] ربنا اني اسكنت من ذريتي بواد غير ذي زرع عند بيتك المحرم [ حەزرەتی ئیبراهیم بەفەرمانی خوای گەورە گەڕایەوە مەککە و فەرمانی پێکرد کە بینای کەعبە بکات ئەوکاتەی تەنها بنکەکانی کەعبە بەنزمی لەوشوێنە هەبوو کەخودا پێشتر نیشانی دابوو، حەزرەتی ئیبراهیم کەگەڕایەوە شوێنەکەی هاجەر و حەزرەتی ئیسماعیل تەمەنی حەزرەتی ئیسماعیل لەشەش ساڵان تێپەڕی کردبوو .کەگەڕایەوە شوێنەکە شەوی دواتر لەلای ئەوان خەونی بینی بەلاَم خەونێکی پڕ وەحیی لەلایەن خوداوە و لە خەونەکەیا فریشتەکان فەرمانیان پێکرد کەدەبێ بەیانی سەری ئیسماعیلی کوڕت ببڕیت و ئەمە فەرمانی خودایەو دەبێت جێبەجێ ی بکەیت.

سەیری ئەم تاقیکردنەوە گەورەیە بکە کە چۆن باوکێك جورئەت دەکات رۆڵە جوانەکەی بۆ خوای گەورە بکات بە قوربانی کە ئەوباوکە بەدرێژایی تەمەنی ئەم رۆڵەیەی بووە، کاتێك خەونەکە بۆ ئیسماعیلی کوڕی ئەگێڕێتەوە ئەویش ئەڵێ ] یا ابتي افعل ماتؤمر ستجدني انشاءالله من الصابرين [ سەیری ئیمان و باوەڕە بەهێزو پتەوەکەی ئەم رۆڵە چاونەترسە بکە چۆن بەباوکە پیرەکەی دەڵێت خودا چ بڕیارێکی بۆ دەرکردوویت وابکە !!!... ئنجا دەڵێ : باوکە گیان تۆ بڕیارەکەی خودا جێبەجێ بکە و منیش ئارامگر دەبم، تۆ بێنە بەرچاوی خۆت کام باوك لەم رۆژگارەدا ملکەچی بڕیارەکانی خودایە و کام رۆڵەش ئامادەیە لەرێگەی خودای گەورە گیانی خۆی ببەخشێت، ئەمە

هەرهەمووی تاقیکردنەوەی خودای گەورەن بۆ بەندەکانی، لەوکاتەی حەزرەتی ئیبراهیم خەریکە رۆڵەکەی سەر ببڕێت، چەقۆ بەملی رۆڵەکەی دادەهێنێت بە فەرمانی خوا نایبڕێت دواتر دەچێت تیژتری دەکات هەر نایبڕێ بە بەرد دادەهێنێت بەردەکە دەبڕێت کەچی ملی ئیسماعیلی نەوجەوان نابڕێت!!!...

لەوکاتەی ئیسماعیل لەژێر چەقۆکەی باوکیدایە شەیتانی لەعین لە ئیسماعیل نزیك دەبێتەوە و دەیەوێت بیترسێنێت بەوبیانووەی کەبڕیارەکەی خودا نەچێتەسەر لەوکاتەدا حەزرەتی ئیسماعیل حەوت بەرد لەسەرزەوی هەڵدەگرێت و ئاڕاستەی شەیتانی دەکات، بۆیە لەوکاتەوە تائێستاش رەجم کردنی شەیتان لەوشوێنەی ئیبراهیم و ئیسماعیل بوو بەواجبێکی فەریزەی حەج .حەزرەتی ئیبراهیم گەرەکییەتی بڕیارەکەی خودای گەورە بگەیەنێتە جێی خۆی .خودا پێی دەفەرمووێ بابەس بێت و رۆڵەکەت سەرمەبڕە و لەبری ئەو قوربانییە بەرانێك لەئاسمانەوە بە دیاریی بۆ حەزرەتی ئیبراهیم و خەڵکەکەدێت و سەری دەبڕێت و لەوکاتەوە جەژنی قوربان سەرهەڵدەدات ] وفديناه بزبح عقيم وسلام على ابراهيم كژلك نجزي المحسنين [ ئەمە تەنها بۆ ئیبراهیم نییە، بەڵکو خودا دەفەرمووێت هەرکەسێك چاکە بکات ئێمە پاداشتی ئەدەینەوە کەئەمەش مزگێنییێکە بۆ هەموو چاکەکارێك .فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانْظُرْ مَاذَا تَرَى قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ (102) فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ (103) وَنَادَيْنَاهُ أَنْ يَا إِبْرَاهِيمُ (104) قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (105) إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ (106) وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ (107) وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ (108)سَلَامٌ عَلَى إِبْرَاهِيمَ (109) كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (110) إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ (111) وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِنَ الصَّالِحِينَ (112) وَبَارَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَى إِسْحَاقَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِنَفْسِهِ مُبِينٌ (113) وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَى مُوسَى وَهَارُونَ (114) وَنَجَّيْنَاهُمَا وَقَوْمَهُمَا مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ (115) وَنَصَرْنَاهُمْ فَكَانُوا هُمُ الْغَالِبِينَ .(116) الصافات...

دوای ئەم رووداوە خودا راستەوخۆ مزگێنییێکی تر بە حەزرەتی ئیبراهیم دەدات ئەویش ] وبشرناه بإسحق نبيا [ ، سەرسامی روو لە حەزرەتی ئیبراهیم دەکات کەتازە چۆن هاجەرە منداڵی ئەبێت؟ خۆ لەتەمەن دەرچووە، بەڵام خودا مزگێنی بۆ ئەنێرێ کە لەسارای خێزانت ئیسحاقت پێئەبەخشین، ئەوکاتە سارا لە فەلەستینە و تەمەنی لە هەشتا ساڵان نزیك بۆتەوە، حەزرەتی ئیبراهیم زۆردڵی خۆش دەبێت و سوپاسی خوای گەورە دەکات چونکە مزگێنێکی دیکەی پێ بەخشی کە پێغەمبەرێکی تر دەبێتە کوڕی ئیسـحاق کە ئەویش یەعقوب پێغەمبەرە سەلامی خودای لەسەربێت، بۆیە سارا نامرێت تاوەکو یەعقوبی کوڕی ئیسحاق دەبینێت .

بەم مزگێنی و مژدەیە هەموو ئاوات و حەز و ئومێدێکی سارا دێتەدی چونکە تەمەنی گەیشتۆتە نزیك هەشتا ساڵان لەسۆزی منداڵ بێ بەشە و نەك هەرخەمی خۆی نییە بەڵکو لەخەمی حەزرەتی ئیبراهیم دایە کەوەکو هەموو باوکێکی ئەم دنیایە منداڵی خۆی ببینێت.

ئەمجارە پێغەمبەر ئەگەڕێتەوە بۆ فەلەستین بۆلای سارای خێزانی و ئەم مزگێنییەی پێدەدات و ساراش پێکەنین دەیگرێت و گاڵتەی پێدێت کەچۆن پیرژەنێکی وەك من منداڵی دەبێت ؟؟ !!!

وَلَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى قَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ فَمَا لَبِثَ أَنْ جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ (69) فَلَمَّا رَأَى أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لَا تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمِ لُوطٍ (70) وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِنْ وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ (71) قَالَتْ يَا وَيْلَتَى أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ وَهَذَا بَعْلِي شَيْخًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ (72) قَالُوا أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ رَحْمَتُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ إِنَّهُ حَمِيدٌ مَجِيدٌ (73) فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ

إِبْرَاهِيمَ الرَّوْعُ وَجَاءَتْهُ الْبُشْرَى يُجَادِلُنَا فِي قَوْمِ لُوطٍ (74) إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُنِيبٌ ... هود.
ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێت ] وامرأته قائمةٌ فضحكت فبشــرناها بإسحاق ومن وراء اسحاق يعقوب [ پاشــان خودای گەورە دەفەرمووێت ] وإذابتلى ابراهيم ربه بكلمات فأتمهن [ ویستی خودا وابوو کەئەم حـەزرەتی ئیبراهیمـە بەهەموو شتێك تاقی بکاتەوە بە ناخۆشی و خۆشی ئەزیەت ببینێ و ئاوارەبوون، کەچی ئـەو هـەر سوپاسـگوزارە و شوکری نیعمەتەکانی خوا دەکات کەبەسەری باراندوویەتی، بۆیە خودای گـەورە بـە خـەلیل و خۆشەویـستی خـۆی هەڵیبژاردووەو هەرخوداخۆی فەرموویەتی ] قال إني جاعلك للناس إماما [ بۆ کردی بە پێشەواو پێشەنگیی خەڵك ؟ چونکەبەدرێژایی تەمەنی لەبەردەم هەموو ناخۆشی و ئەزیەتێك سەبروئارامیی گـرت و هـەموو بڕیارەکـانی خـوای گەورەی بەجیٚ گەیاند.

ئەگەر باوك ئیبراهیم ئاسا مامەڵە لەگەڵ خاوخێزانی بکات و خەمی هیدایەت دانی مناڵەکانی بێت، بێگومان خێر و خۆشی و رەحمەتی خوا بەسەریاندا ئەڕژێت، چەندین باوك هەیـە ئـەناڵێنیٚ بەدەسـت مناڵەکەوەبـەهۆی خرا پـی پەروەردەکردنی مناڵەکانیان چونکە رۆژێك لە رۆژان خەمیان لەمناڵـەکانیان نـەخواردووە و ڕایـان نـەهێناون لـە پەرستش و چوونە مزگەوت و قورئان خوێندن، کەکاتێکیش گەورە ئەبن نەك بەقسەی باوکیان ناکەن بەڵکو دەبـن بە مایەی ئەزیەتیش بۆ باوکیان .لێرە خاڵێکی گرنگ هەیە :کە ئەویشیان ڕۆڵی دایکە، چونکە ئەوەندەی هاجـەرە لەگەڵ ئیسماعیلدابووەباوکی لەگەڵیدانەبووە، بۆیە 90% پەروەردەی مناڵ بـۆلای دایکـی ئەگەڕێتـەوە، چـونکە رۆژانە دایك زیاتر هەڵس و کەوت لەگەڵ مناڵ ئەکات و خاڵی لاواز و بەهێزی ئەزانێت، بۆیە تەنانەت ئەو مناڵەی کە لەدنیا پەیڕەوی قورئان ئەکات لە قیامەتتدا دایك و باوکی ئەکەن سەر کورسییێك و تـاجێکی پـڕ لـە زێـڕ و ئاڵتون ئەکەن سەری دایك و باوکی و ئاهەنگی بۆ ئـەگێڕن ... مانـدووبوون لەگـەڵ جـوان پـەروەردەکردنی منـاڵ زەڕەیەك بەفیڕۆ ناچێت و بەرکەی لەدنیا و قیامەت بەدەست دەهێنیت و سەرفراز ئەبیت.

ئەی چ گە نجێك لەتوانای داهەیەوەکو تەمەنی لاوێتی حەزرەتی ئیبراهیم بێت و بتوانێت بەخوێندنەوەی ئایەتێکی قورئان و زیندووکردنەوەی سوونەتێکی پێغەمبەری ئیسلام، بەرەنگاری کوفری ئەم رۆژگارە ببێتەوە؟..

کەسەیری ئافرەتێکی حیجاب لەبەر و بالاپۆش دەکەین لە بازاڕەکان وشوێنە گشتییەکان دڵمان خۆش بێـت چـونکە ئەو خۆدا پۆشینەو حیجابەی لەبەریدایە دروشم و هێمایەکن بۆ ئیسلام، بادایك و خوشـکا نمان ئـاوا وەکـو سـارای خێزانی حەزرەتی ئیبراهیم رووبەڕووی زاڵمان وستەم کاران ببنەوەخۆ چەکی ئەوان تەنها گریان نییە چەکی دەستی ئەوان ئەو دەستەیە کەبۆ بارەگای خودا بەرزی ئەکەنەوە.

وەکو ئەو نزایانەی سارا کەلەوکاتەی پاشایەکی داوێن پیس هێرشی بۆدەهێنیٚ چۆن بەهۆی نزاکانی حەزرەتی سارا دەستەکانی ڕەق ئەبن با دایك و خوشکا نمان ئابەو شێوەیە بن.ئەگەر کچێك تەمـەننا دەکـات گـە نجێکی موسـڵمان بچێتە خوازبێنی ئەوا بادڵنیابێـت تەمەننایەکـەی ڕێگەیەکـە بۆدانـانی بناغەیـەکی ئیمـانی و زینـدووراگرتنی ئیسلامەتی.

جارێکی تر خوا فەرمان بە حەزرەتی ئیبراهیم دەکاتەوە کەبگەڕێتەوە بۆ مەککە و مۆڵەتت تـەواوکاتی گەڕانـەوەت هاتووە بۆ مەککە، بۆچی بگەڕێتەوە بۆ مەککە کە پێشتریش لەویٚ بوو؟ ئایالەبەر سەلامەتی گیانی هاجەرەی خێزانی و ئیسماعیلی کوڕیەتی ؟ نەخێر...

بۆ ئەوەیە بینای کەعبە بنیات بنێت، بەلام بۆکیٚ ؟ بۆهەموو خەڵك بەهەموو شێوە و رووخسارێك کە خودا دروسـتی کردوون، بۆ ئەوەی موسڵمانان لەسەرانسەری هەموو دنیا رووی تێبکەن و باوەشی پێبکەن و لە گوناهو تـاوان پـاك

ببنەوە.

]وإذ يرفع ابراهيم القواعد من البيت [ لەگەڵ حەزرەتی ئیسماعیل دەکەونە خۆ بۆ دروستکردن وبنیاتنانی ماڵی خودا کەئەویش کەعبەیە، زانایان لەبارەی ) قواعد ( دەڵێن : پێشتر کەعبە بینا کرابوو ئاسەواری لەسەر زەوی هەبووە و لەسەر بناغەی کۆن بینای نوێ دەستی پێکرد و بەرزکرایەوە.

حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل دەستیان بەدروستکردنی دیوارەکەکرد کە پێشتر وتمان بەرلەدروستکردنی دیوارەکە کەعبە قاعیدەی خۆی لەسەر زەوی هەبووە، دیوارەکە دروست دەکەن تاوەکو دەگاتەبالای حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خودای لەسەربێت،هیچ شتێکیان پێ نییە تاوەکو بینای کەعبە زیاتر بەرز بکەن و داوا لە ئیسماعیل دەکات بەردێکی بۆ بێنێت، ئەویش بەردێك بۆباوکی دەهێنێت و سەردەکەوێت سوبحانەللاّ یەکسەر شوێن پێیە پیرۆزەکانی لەسەر بەردەکە دەردەچێ کە ئێستاش لەنزیك کەعبە دانراوە و ئەوانەی چوونەتە عومرەو حەج بینیویانە کە پێی دەڵێن) مقام ابراهیم.(

چەندین جارلافاو لەمەککەی داوەو دووجار کەعبە رووخاوە کەچی شوێن پێ وپەنجەکانی حەزرەتی ئیبراهیم هەرماوە و نەفەوتاوە، ئەمەبۆچی ؟ بۆئەوەیە کەشوێن پێی ئەم حەزرەتی ئیبراهیمە، لەم دنیایە دیارە و ون نابێت چونکە ئەوەندە پەرۆشی بانگەوازی ڕێی خودابووە و بۆئەم مەبەستەش ئێمە فێردەکات کەچاو لەوبکەین وشوێن دەست و هەنگاوەکانمان دیاربێت بۆ بانگکردنی ئەم خەڵکە بۆ ڕێی هیدات و وازهێنان لەگوناهو تاوان.

بەهۆی ئەوبەردەوە کەنزیکەی دوانزە مەترێك بەرزە حەزرەتی ئیبراهیم بە هاوکاری ئیسماعیلی کوڕی توانی بینای کەعبە تەواو بکەن، بەلاّم لای دیوارێکی کەعبە بۆشایی و کەلەبەرێك هەیە .ئەو دووپێغەمبەرە ئەوەندە گەڕان وسووڕانەوە نەیانتوانی بەردێك بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکە بدۆزنەوە !!!..حەزرەتی ئیسماعیل بەردێکی سپی وزۆر جوان و درەوشاوەی بەرچاو ئەکەوێت و بانگی باوکی ئەکات و دەڵێ :باوکە گیان ئەم بەردە سپییە چییە؟با بەوبەردەوە بۆشاییەکە پڕبکەینەوە، حەزرەتی ئیبراهیمیش بەکوڕەکەی دەفەرموێت : ئەمە بەردی بەهەشتە و حەزرەتی جبریل بۆی هێناوین.

بەوبەردە کەلێنەکە دائەپۆشن و کە ئەکاتە ) الحجر الاسود( ، کەعبە یەکێکە لەموعجیزاتە هەرەگەورەکانی خوای گەورە کەتاکو ئێستاش لەسەرزەوی ماوە چەندین جار لافاوبردوویەتی بەلاّم نەفەوتاوە، شتێکی زۆر سەیرە نەلەئاگردا دەسووتێت نەلەئاویش نقوم دەبێت !!!..ئەم بەردەش جاران سپی بووە بەلاّم بەهۆی تاوان و گوناهەکانی مرۆڤ ڕەش بووە، هەروەها پێغەمبەری پێشەوا سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت دەفەرموێت ) حجر الاسود یمین الله علی الارض ( واتە ئەم بەردە ڕەشە لای ڕاستی خوای گەورەیە لەسەر زەوی ، و دەبێت هەمووکەسێك ماچی بکات.

کەبینای کەعبەش تەاو بوو حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل لە خودا پاڕانەوە ]ربنا واجعلنا مسلمین لك ومن ذریتینا امة مسلمة لك وأرینا مناسکنا وتب علینا [ تۆ سەیری ئەم نزایە جوان وناوازەیە بکە دوای ئەو هەموو ئارەق ڕشتن و ماندووبوونە ئنجا دەفەرمون خوایە بەموسڵمان قەبوڵمان بکە، چونکە گەورەترین نیعمەت نیعمەتی هیدایەتە!!

جگەلەوەش دوعا بۆنەوەی دوای خۆیادەکەن کەئەوانیش وەکو ئەوان بن، ئەم ئایینەی ئێمە ئایینێکی پڕبەرەکەت و پڕهیدایەت و مایەی ڕزگاربوون و ئیسلاّحە بۆ هەموو خەڵك، ئاینێکە فێری برایەتی ودادپەروەریی و خۆشویستنی یەکترمان دەکات فێرمان دەکات کەڕێزی یەکتر بگرین و کەسێك بەبێ تاوان نەکوژین وتەنانەت ئەزیەتی کەسێکی غەیرە موسڵمانیش نەدەین.

خوداش فەرموویەتی ] وإذ جعلنا البيت مثـــــابة للناس وأمنا [ لەوکاتەوەبەبڕیاری خودای گـەورە مەککـە بۆتـە شوێنی ئارامی و ئاسایش، هەمووجیهان رووبەڕووی بوومەلەرزە و فەوتان دەبێتەوە تەنها مەککە و مەدینە نەبێت کە ئەمە بڕیاری خودایە تـاوەکو رۆژی قیامەت، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەخودا پاڕایەوە و دوعای کرد فـەرمووی خودایە چۆن بەهۆی نزاکەی حەزرەتی ئیبراهیم مەککەت پاراست ئـەوامنیش دوعـا دەکـەم کەمەدینـە بپارێزیـت و ئەمینی بکەیت، زانستی ئەو سەردەمەش سەلماندوویەتی کە هەموودنیا دەمار و رەگی گڕکان و بوومەلـەرزەی تیایـە تەنها دوو شوێن نەبێت کە ئەوانیش مەککە و مەدینەی پیرۆزن، زانستی نویٙ دەریخستووە کـە ڕووکردنـە کەعبـەی پیرۆز و کڕنووش بردن رووە و کەعبە دەبێتە خاڵی کردنی لاشەی مرۆڤ لە هەموو لەرە و ) شحات ( ی، ئـەلیکترۆنی کە بەهۆی مۆبایلەوە ئەلیکترۆنیات و کار و ماندووبوون تووشی مرۆڤ ئەبێت چونکە کەعبە چەقی وشکانی زەوییە و زانستی نوێش ئەم راستی و هەقیقەتەی سەلماندووە.

)مثابة ( ماناى چییە؟ مانای ئەوە ئەگەیەنیٙ واتە هەرکەسیٙ بچێت بۆ حەج و عومرە واتـە بـۆ سـەردانی کەعبـە ناگاتەوە ماڵەوە جارێکی تر بەدڵ و بەچاو بۆ دیداری ئەو کەعبەیەدەگرێیت و تەمەننا دەکات جارێکی تر بچێتەوە دیداری کەعبەی پیرۆز.دوای تەواوبوونی دوعاکەیان خودای گەورە فەرمانی بە حـەزرەتی ئیـبراهیم کـرد کـەبانگی خەڵکان بکات بۆ سەردانیکردنی ئەم کەعبەیە، ئەویش فەرمووی جا خودایە دەنگی مـن چـۆن دەگـات بـەو هـەموو خەڵکە؟ خوداش پێی فەرموو ئەی ئیبراهیم بـانگ کردن لەسەرتۆ و وەڵامدانەوەش لەسەرمن، حەزرەتی ئیـبراهیمیش بانگی خەڵك ئەکات و لەوساوە تـائێستاش لەگەڵدابیٙ ئەم خەڵکە بەرەوئەو بانگەوازەی حەزرەتی ئیبراهیم دەچن و دەڵێن ) لبيك اللهم لبيك لبيك لاشـــريك لك.( بـائێمەش وەکو ئەو پێغەمبەرە شەووڕۆژ بخەینە سەر یـەکترو کـۆڵ نەدەین بابەردەوام لەژێر فەرمانی خوادابین و ماندووبین و بگـــــەڕێین بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم ئایینـەژیانی ئـەم حەزرەتی ئیبراهیمە پڕبووە لەئاوەدانی و پڕبووە لەسەبر وئارامی و پڕبووە لەبانگەواز کـردن لەگـەڵ گەلەکـەی، بائێمەش وەکو ئەو پێغەمبەرەبین و شەونخوونی بکەین و کۆڵ نەدەین لە بانگکردنی ئەم خەڵکە بۆ ئیسلامەتی و بۆ تەبایی و برایەتی و پێکەوەژیان باوەکوحەزرەتی ئیبراهیم جگـە لـەخودا لـە کەسـی ترنەترسـین، پێغەمبـەرمان لەڕادەبەدەر حەزرەتی ئیبراهیمی خۆشویستووە و ناوی هێناوە تەنانـەت کـوڕی یەکـەمی بـەناوی ئەوپێغەمبـەرەوە کردووە، هەروەك پێغەمبەری ئازیز سەلات وسەلامی خوای گـەورەی لەسـەربێت دەفـەرمووێت لەئاسمانـدا لەشـەوی ئیسراو میعراج حەزرەتی ئیبراهیمم بینـی پـشتی دابـووە ) بیـت المعمـور ( و پرسـیارم لەفریـشتەکان کـرد و وتم ئەمەکێییە؟ وتیان ئەمە حەزرەتی ئیبراهیمی باوکی پێغەمبەرانە...

ئنجا پێغەمبەری پێشەوا دەفەرمووێت چوومە لای و سەلامم لێکرد و پێی فەرمووم : ئەی موحەممەد زەوی بەهەشـت خاڵییە و بەئوممەتەکەت رابگەیەنە بەتەسبیحات بۆخۆیان بیچێنن، ئنجا فەرمووی ) إذ رأيت ابراهيم أقرب الناس إليه شبها صاحبكم ( واتە نزیکترین کەس کەشێوەی لەمن بکات حەزرەتی ئیبراهیمە، ئینشائەڵلا لەبەهەشتدا خوای گەورە بەلیقا و دیدەنی حەزرەتی ئیبراهیم و سەرجەم پێغەمبەران شادمان دەکات و کۆمان دەکاتەوە..

وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (127) رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُسْلِمَةً لَكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (128) رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (129) وَمَنْ يَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَنْ سَفِهَ نَفْسَهُ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ (130) إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ (131) وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا

وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ (132) أَمْ كُنْتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنْ بَعْدِي قَالُوا نَعْبُدُ إِلَهَكَ وَإِلَهَ
آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ (133) تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُمْ مَا
كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ (134) وَقَالُوا كُونُوا هُودًا أَوْ نَصَارَى تَهْتَدُوا قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا
كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ (135) قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ
وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ (136) فَإِنْ
آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنْتُمْ بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوْا وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (137) صِبْغَةَ
اللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُ عَابِدُونَ (138) قُلْ أَتُحَاجُّونَنَا فِي اللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ
أَعْمَالُكُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُخْلِصُونَ (139) أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطَ كَانُوا هُودًا أَوْ نَصَارَى
قُلْ أَأَنْتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللَّهُ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ كَتَمَ شَهَادَةً عِنْدَهُ مِنَ اللَّهِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ (140) البقرة.
وَلَقَدْ آتَيْنَا إِبْرَاهِيمَ رُشْدَهُ مِنْ قَبْلُ وَكُنَّا بِهِ عَالِمِينَ (51) إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا هَذِهِ التَّمَاثِيلُ الَّتِي أَنْتُمْ لَهَا
عَاكِفُونَ (52) قَالُوا وَجَدْنَا آبَاءَنَا لَهَا عَابِدِينَ (53) قَالَ لَقَدْ كُنْتُمْ أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ (54) قَالُوا
أَجِئْتَنَا بِالْحَقِّ أَمْ أَنْتَ مِنَ اللَّاعِبِينَ (55) قَالَ بَلْ رَبُّكُمْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا عَلَى ذَلِكُمْ مِنَ
الشَّاهِدِينَ (56) وَتَاللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُمْ بَعْدَ أَنْ تُوَلُّوا مُدْبِرِينَ (57) فَجَعَلَهُمْ جُذَاذًا إِلَّا كَبِيرًا لَهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ
يَرْجِعُونَ (58) قَالُوا مَنْ فَعَلَ هَذَا بِآلِهَتِنَا إِنَّهُ لَمِنَ الظَّالِمِينَ (59) قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ (60)
قَالُوا فَأْتُوا بِهِ عَلَى أَعْيُنِ النَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ (61) قَالُوا أَأَنْتَ فَعَلْتَ هَذَا بِآلِهَتِنَا يَا إِبْرَاهِيمُ (62) قَالَ بَلْ فَعَلَهُ
كَبِيرُهُمْ هَذَا فَاسْأَلُوهُمْ إِنْ كَانُوا يَنْطِقُونَ (63) فَرَجَعُوا إِلَى أَنْفُسِهِمْ فَقَالُوا إِنَّكُمْ أَنْتُمُ الظَّالِمُونَ (64) ثُمَّ نُكِسُوا عَلَى
رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَؤُلَاءِ يَنْطِقُونَ (65) قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنْفَعُكُمْ شَيْئًا وَلَا يَضُرُّكُمْ (66) أُفٍّ لَكُمْ
وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ (67) قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانْصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ (68) قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي
بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ (69) وَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَخْسَرِينَ (70) وَنَجَّيْنَاهُ وَلُوطًا إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا
فِيهَا لِلْعَالَمِينَ ...(71) الانبياء .

* *

**پێغەمبەر لوط سەلامی خوای لەسەربێت :**

كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ (160) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ (161) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (162) فَاتَّقُوا اللَّهَ
وَأَطِيعُونِ (163) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ (164) أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ
(165)وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ (166) قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا لُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ
الْمُخْرَجِينَ (167) قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُمْ مِنَ الْقَالِينَ (168) رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ (169) فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ
(170)إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ (171) ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ (172) وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ مَطَرًا فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنْذَرِينَ
(173)إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ .(174) الشعراء...

پێغەمبەران بۆ ئەوەهاتوون ژیان ببەخشن و ژیانیش جوان بکەن و، لەم میانەیەشدا پەیامی خوای گەورە بەهەموو خەڵکان بگەیەنن و هەوڵ و ماندووبوون بکێشن، هیدایەت دانی خەڵکان یەکەم ئامانجی پێغەمبەرانی خوای گەورەیەو هەموویان یەك دروشمیان هەڵگرتبوو ئەویش ) والله یدعوکم الی دار السلام ( و هیچ شتێکی تریان لەگەڵەکانیان داوانەکردووە جگە لەگەڕانەوە بۆلای خوای گەورە و واز هێنان لەشیرك و تاوان و سەرەڕۆیی و سەرپێچییەکان نەبێت.

سەیری ژیانی پێغەمبەری پێشەوا بکە لەسەرەتای هاتنە خوارەوەی وەحیی و پەیامی ئاسمان لەلایەن خواوە ڕۆژێك لەڕۆژان پشوویکی نەدا تاوەکو ئەمری خوای بەجێهێناو وەفاتی فەرموو، پێغەمبەرانی تریش هەروەهائەوەتا حەزرەتی نوح بەدرێژایی نۆسەد و پەنجا ساڵ خەریکی بانگەواز بوو لەناو گەلەکەی کەچی دوانزە کەسێك باوەڕی پێ ئەهێنن و دەسبەرداری شیرك و تاوان ئەبن و بۆلای خوای گەورە ئەگەڕێنەوە و ڕوو لەتۆبە و ئیستغفار ئەکەن، ئەرکی سەرشانی ئێمەش لەدوای ئەو هەموو پێغەمبەرانە بەهەمان شێوە بانگکردنی خەڵکانە بۆ هیدایەت وەرگرتن و هۆشیارکردنەوەیان ئەگەرتۆ مامۆستای قوتابخانەیت یاخود زانکۆ ئەرکی سەرشانتە ئەم پەیامە بەقوتابییەکانت بگەیەنیت و ڕێنماییان پێببەخشیت ... ئەگەر گەنجێك یاخود قوتابیێك نوێژناکات بەلام خاوەنی ڕەوشت و ئاکارێکی جوانە، ئەوا بەنەرم و نیانییەوە قسەی لەگەڵ بکە کەبۆچی نوێژ ناکەیت چونکە نەکردنی نوێژ سەرپێچی کردنە لەبڕیار و فەرمانەکانی خوای گەورەیە، یاخود خزمێکت سەرقاڵی کار و کردەوەی خراپ و قێزەونە خۆتی لێ نزیك بکەرەوە و ئامۆژگاری بکە چونکە خێرێکی گەورەت پێدەگات، ئەگەر بەگوێی کردی و ماڵ و مناڵ و نەوەی دوای خۆیشی وایان کرد ئەوا خێر و چاکە بۆتۆی بانگخواز و ئامۆژگاری بەخش دەنووسرێت.

یاخود خوشکێکی هاوڕێت نوێژناکات و بالاپۆش نییەتۆ دەتوانی لێی بچیتە پێشەوەو پێی بڵێی خوشکەکەم بۆ حیجاب ناپۆشیت ؟ خۆبڕیاری خوای گەورەیە، دەزانی ئەگەر بەگوێی تۆی کرد چەندە خێر و چاکەت بۆ ئەنووسرێت، یان مامۆستا لەقوتابخانە هەردەم خوای گەورەی لەیاد بێت و وانەکات قوتابییەکانی ئەزیەت بدات وەکو ئەو مامۆستایەی قوتابییەکی بچکۆڵەی هەیە، ئەو قوتابیە بچکۆڵەیە بەردەوام لەچکی لەسەردایە و خۆی داپۆشیوە، هەمووڕۆژێك مامۆستاکەی پێی دەڵێت بەیانی بەولەچکەوە نەیەیتە قوتابخانە و سەرپۆشەکەی سەرت داکەنە.

بەلام قوتابییە ئاقڵ و ژیرەکە هیچ بەگوێی مامۆستاکەی ناکات و هەر بەوشێوەیە دێتە قوتابخانە، دواجار مامۆستاکەی تووڕەبوون ڕووی تێئەکات و پێی دەڵێت : نەمووت بەم شێوەیە نەتبینم؟ قوتابیە ژیرەکەش پێی دەڵێت :مامۆستا گیان ئەمە بڕیاری خوای گەورەیە، کەتۆش بڕیارم بەسەردائەسەپێنیت نازانم بەگوێی تۆ بکە م و بەگوێی خوای گەورە بکەم ؟؟؟ !!!!!شتی وامەحاڵە و ناتوانم لەچکەکەم فڕێدەم...

سەیرکەن لەوکاتەدا مامۆستاکەی تەزووێك سەرتاپای گیانی ئەگرێتەوە و ئەلەرزێ کە ئەم مناڵە ژیرە چ وەڵامێکی دایەوە و پرسیارێك لەناخی دڵیەوە هەڵئەقوڵێ کەبۆچی منیش لەچك نەکەم و سەرپێچی لەفەرمانی خوای گەورە بکەم ؟ !!!بەهۆی ئەو مناڵەوە مامۆستاکەشی خۆی پۆشتەکرد، کەمناڵێك بەم شێوەیە وەڵامێکی بەوشێوە جوان و لەجێیە بداتەوە مامۆستاکەی ئەی بۆچی ئێمەش وانەبین و نەبین بەمایەی هیداتدانی دەوروبەرمان ؟....

یەکێك لەو پێغەمبەرانەی لەتەمەنی مناڵیدا باوەڕی بە پێغەمبەر ئیبراهیم هێنابێت حەزرەتی لوت بووە سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت، وەك وتمان کە حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت لەناو ئاگرە گەورەکە بەبەرچاوی هەموو خەڵکەوە دێتە دەرەوە، ئالەو کاتەدا حەزرەتی لوت باوەڕ بەحەزرەتی ئیبراهیمی مامی ئەهێنێت، ئەم پێغەمبەرە لەتەمەنی مناڵیدا باوکی دەمرێت و لای باپیرەی کە ئازەر بووە واتە باوکی پێغەمبەر ئیبراهیم گۆش ئەکرێ و بەخێو ئەکرێت، حەزرەتی لوت بیست و حەوت جار ناوی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە واتە لە چواردە سورەت ئاماژە بەناوەکەی کراوە، وەکو ئاماژەمان پێدا کەحەزرەتی ئیبراهیم گەلەکەی جێهێشت و بەرەو فەلەستین لەوێشەوە بۆ مەککە کەوتە ڕێ بەمەبەستی بانگەواز کردن و بانگکردنی خەڵکان بۆ یەکتاپەرستی، حەزرەتی لوت لەناو گەلەکەی مایەوە تائەوکاتەی پێرائەگات و گەورە ئەبێت.

کە گەورە بوو خوای گەورە فەرمانی پێکرد بەرەو ( کۆچ بکات کەئێستاکە دەریای مردووی پێدەڵێن، سەدوم

حەزرەتی لوتیش فەرمانەکەی خوای گەورە بەجێ دەگەیەنێت و بە پشتیوانی خوای گەورە ڕوو لەسـەدوم دەکـات کـە ئێستاکە ولاّتی ئوردەنی پێدەڵێن و فەرمووی ] إنی مهاجر الی ربّی[ ، هەتا بڵێی گەلێکی بەدڕەوشت و سەرسەخت و کەللە ڕەق و داوێن پیس بوون، ئە گەلە بەدرێژایی شەوو ڕۆژ سەرقاڵی نێربازی بوون و وازیـان لەئافرەتـەکانیان هێنابوو!!!!..

لەم شارەی سەدومە تەنها ماڵێك باوەڕیان بەخوای گەورە هەبوو جگە لەوماڵە هیچ باوەڕدارێکی تر نەبووکەئەویش ماڵی حەزرەتی لوت بوو لەگەڵ دووکچە باوەڕدارەکەی بەلاّم خێزانەکەی باوەڕی پێنەهێنا و بـەبێ بـاوەڕی مایـەوە وەکو خوای گەورە فەرموویەتی ) فخانتاهما ( مەبەستی خیانەتی هەردوو ژنەکەی حەزرەتی نوح و حەزرەتی لوتـە کە باوەڕیان بە پیاوەکانیان نەهێنا و خیانەتیان لێکردن کە ئەویش خیانەتی بیروباوەڕ و عەقیدەبوو، حـەزرەتی لوت و دووکچەکەی هەتا بڵێی باوەڕداربوون بەلاّم وەنەبێ دەستە و دامێن دابنیشن بەردەوام خەریکی بانگەواز بوون لەگەڵ خەڵکی سەدوم، ئەوشارە بەناوبانگترین شاری بازرگانی بوو هەرچی کەشتی و بەلەم و کاروانـچی هەبووایـە ڕوویان تێدەکرد بۆ کڕین و فرۆشتنی کەل و پەل و خواردن و خواردنەوە، خوای گــــــەورە دەفـەرمووێت ] ولوگـا إژڤال لقومه اتأتون الفاحشه ما سبقكم بها من أحد [ پێیان دەفەرمووێت :ئێوە تاوان و گوناهی وا ئەکەن کەسـێك بەرلەئێوە ئەو تاوان و داوێن پیسیەی نەکردووە، ئێوە بۆ پەنا دەبەنە بەر نێربـازی و پـشت لـە ئافرەتـەکانتان ئەکەن ؟ نێربازییەکان لەڕادەبەدەر لە زیادەڕۆییدابوو...

هەر کەسێك وەکو ئەوگەلەی سەدوم بکات تاڕۆژی قیامەت بەر نەفرەتی خوای گەورە ئەکەوێت و لەگـەڵ ئـەوانیش حەشر ئەکرێت، چونکە ئەوەی فێری ئەم کارە پیسە ببێت ئەستەمە تاوەکو مردن واز بهێنێت وەکو لەڕۆژاوا و زۆربەی ولاّتان پیاوی بەسالاّچوو هەیە لەسەر ئەوکارە لەڕادەبەدەر بێ شەرعییە بەردەوامە و نەیتوانیوە وازی لێ بهێنێت.

تەنانەت وای لێهات گەلی سەدوم بەبەرچاوی هـەموو کەسـێکەوە و بەئاشـکرا کـاری نێـر بازییـان دەکـرد، وەکـو لەوسەردەمەش باوە و ) شذوذ جنسي ( پێدەووترێت :بەومانایەی بەزاندنی سـنووری سـێکس و زیادەڕۆییـەکی بـێ سنوور لەوکردارەی سێکسیە، هۆکـاری سـەرهەڵدانی نەخۆشـی ترسـناکی ئایـدز 60% بـەهۆی ئـەو کارەوەیـە و نەخۆشییەکی تر بەم دواییانە پەیدابوو کە لەئایدز پیستر و خێراترە ئەویش لـەدەرەنجامی ئـەوکردارە سێکـسی و جووت بوونەی نێر لەگەڵ نێرە، خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بەڕوونی باسی لەخراپی و ڕەوشت نزمی ئەو گەلەی کردووە، وەکو ) فاسقون و کافرون و مجرمون و کاذبون و مســــرفون ( و هتـد ...هـەروەها حـەزرەتی لـوت پێـی فەرموون ] بل أنتم قوم عادون [ بەو مانایەی ئێوە تەعەددا لەخۆتـان و لەشەخسیەت و نەسەبی خۆتان ئەکەن، خۆ خوای گەورە زۆر لای ئاسان بوو ئەم گەلە بەدڕەوشتەلەناو ببات، بەلاّم ویستی نییە زوورلـەناویان بـەرێت بـەڵکو جارێ پێویستییان بە مۆڵەت هەیە و پێغەمبـەرێکیش پێویـست دەکـات بـۆ هۆشـیارکردنەوەیان جگەلـەوەی ئـەو پێغەمبەرە لە ڕۆژی قیامەتا دەبێت بەگەواهیدەر بەسەر تاوان و گوناهەکانیان، شتێکی تر جگە لەوکارە ئەوگەلەی سەدومە دزی و چەتەشیان تێدابوو و ڕێگەیان لەکاروانچییان دەگرت و شـتیان لێئەسـەندن جگـە لـەوەش شـەوانە یانەیان هەبووە بۆ مەی خواردنەوە و رابواردن، هەروەها بە کۆمەڵ بەرامبەر بەیەکتری بەڕووتی و بەبێ جل وبەرگ دادەنیشتن و گاڵتەیان بەیەکتری ئەکرد و گاڵتەشیان بە پێغەمبەران ئەکرد ] كذبت قومُ لوطٍ المرسلين.[

بەلاّم حەزرەتی لوت خۆی بەبرای ئەوان ئەژمێرێت و لە پاشەڕۆژیان ئەترسێت و پێیــــان دەفەرمووێت ] إنـی لكـم رسولٌ أمين[ ، پێشیان ئەفەرمووێت لەخوا بترسن و بەگوێم بکەن و من هیچ پاداشتێکم لـە ئێـوە ناوێـت، بەگاڵتـە پێکردنەوە بە حەزرەتی لوتیان ئەووت : ئەی کەوایە با خوداکەت سزای خۆیمان بۆبنێرێت تاوەکو بزانین چ جـۆرە

سزایەکە !!!..کەواتە هەرکاتێك میللەتان گەیشتنە ئەو ئاستەی خۆیان داوای سزای خوای گەورە بکەن و بێ منەت بن، ئەوا کاری پێغەمبەران بەفەرمانی خوای گەورە ئەوەستێنرێت و بەر سزای بەئێشی خوای گەورە ئەکەون.

حەزرەتی لوتیش پێی فەرموون کەوایە چاوەڕێی توندترین سزای خوای گەورە بکەن کە خۆتان بە گاڵتە پێکردنەوە داوای ئەکەن، ئەو گەلە پێشتر سزای گەلی نوح و و ئیبراهیمیان بینیبوو بەلاّم گوێیان پێنەدەدا و گاڵتەیان پێدەهات، گەیشتە ئەو ڕادەیەی یەك ڕابوون و کۆك بوون لەسەر دەرکردنی حەزرەتی لوت لەشارەکەیان و دەیانووت : ئەمە دەربکەنە دەرەوە چونکە لەخەڵکە خاوێن و پاکەکانە و زیان لەئێمە دەدات!!!..

پێیان ووت : لان لم تنته لتكوون من المخرجين، حەزرەتی لوت کەسێك لەشارەکەیان شك نابات داڵدەی بدات و پشتی بگرێت و بەغەریبێك خۆی دێتە بەرچاو، ماوەیەك بەبێ دەنگی لەناویان مایەوەو ئنجا پێی فەرموون ] قال إني من عملکـــــم من القالين[ ، پێی فەرموون من ڕەفزی ئەو کردەوەی ئێوەدەکەم و بەهیچ شێوەیەك پێی ڕازی نیم و لەدژی ئەوەستم، بەلاّم ئەم وتانەی حەزرەتی لوت هیچ سوودێکی نەبوو و گاڵتەیان پێدەهات.

حەزرەتی لوت وازی لێنەهێنان تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی فەرمووی ] ربّي نجيني و أهلي مما يعملون [ ، دواتر فـــــەرمووی ] فقال انصُرني على القوم الفاسدين [ حەزرەتی لوت زۆر لەخوای گەورە پاڕایەوە و لاڵایەوەو خوای گەورە ش نزاکانی گیراکردو سەری خست، خوای گەورە سێ فریشتەی ناردن بۆلای حەزرەتی ئیبراهیم، کە ئەوانیش جبریل و عزرەئیل و میکائیل بوون، و مژدەیان پێدا کەژنەکەت منالّی ئەبێت کەئەویش حەزرەتی ئیسحاق پێغەمبەرە سەلامی خوای گەورەی لێبێت، دواتر حەزرەتی ئیبراهیم پێی فەرموون بۆکوێ ئەڕۆن ؟ هەرسێ فریشتەکەی خوای گەورە کەلەسەرشێوەی سێ گەنج هاتن بۆلای حەزرەتی ئیبراهیم فەرموویان بۆلای تاوانبارترین گەل دەچین و خوای گەورە ئێمەی بۆئەوان ناردووە، وتیان بۆ گەلی سەدوم ئەڕۆین و لەناویان ئەبەین، حەزرەتی ئیبراهیم پێی فەرموون خۆ حەزرەتی لوت لەناو ئەوگەلەیە ...چۆن وادەبێت ؟ فەرموویان ئەمە بڕیار و فەرمانی خوای گەورەیە، فەرمووی ئەی ئەگەر سێ سەد باوەڕداریان تێدابوو؟ فەرموویان لەناویان نابەین، پێی فەرموون ئەی ئەگەر ژمارەی باوەڕدارەکان چل کەس بوون ؟ وتیان لەناویان نابەین، پێی فەرموون ئەی ئەگەر سێ کەسی تیادابوو؟ وتیان لەناویان ئەبەین، پێی فەرموون بەلاّم حەزرەتی لوت و سێ کچەکەیان تێدایە، فەرموویان باش ئەزانین و خۆمان پارێزگاری ئەوانین و نایەڵین لەناو بچن ومەترسە تەنها گەلەکەی و ژنەکەی لەناوئەبەین کە گوێڕایەڵیی حەزرەتی لوت نەبووە و پشتی تێکردووە.

هەرسێ فریشتەی خوای گەورە لەسەرشێوەی سێ گەنجی تابڵێی جوان بەرەو سەدوم ئەکەونە ڕێ، کەدەگەنە ناو گەلەکەوە هەرهەمووداوێن پیسەکان ڕێگایان لێئەگرن و لەهەوڵی ئەوەدان دەستدرێژی بکەنە سەریان، کچێکی حەزرەتی لوت ئەو سێ گەنجە زۆر جوانە ئەبینێت و بەڕاکردن دێتەوە بۆلای باوکی و پێی ڕادەگەیەنێ کەسێ گەنجی زۆر جوان و غەریب ڕوویان لەشارەکەمان کردووە وتاوەکو پیاوە بەدڕەوشتەکان دەستدرێژییان نەکردوونەتە سەر فریایان بکەوە !!!..حەزرەتی لوتیش دەگاتە شوێنەکە و نازانێت کە ئەمان فریشتەن و خوای گەور ە ناردوونی بۆلای ئەو گەلە داوێن پیس و نێربازە، بەلاّم ئەوسێ فریشتەیە باش دەزانن کەئەمە حەزرەتی لوتە و پێغەمبەری خودایە.

حەزرەتی لوت لە فریشتەکان نزیك دەبێتەوەو پێیان ئەفەرمووێت بۆ هاتوونەتە ئەم شارە ئەی نازانن ئەمانە هەرهەموویان دزو جەردەن و نێربازن و داوێن پیسی ئەکەن؟ ئەمان باش دەزانن بەلاّم چاوەڕێی دواین گەواهیدانی پێغەمبەر )لوت( ن، لەسەر گەلەکە بەر لەوەی لەناویان ببەن، ئەوان دەڵێن مەحاڵە بڕۆین و ئێمە میوانی تۆین،

لەگەڵ حەزرەتی لوت دەچنە ماڵەوە و کەخێزانی حەزرەتی لوت چاوی پێیان ئەکەوێت و بە نهێنییەوە دەچێت بانگی داوێن پیسەکان ئەکات کەسێ گەنجی زۆر جوان لەماڵەکەی ئێمەن و خێراکەن، ئەو داوێن پیسانە بەڕاکردن بەرەو ماڵی حەزرەتی لوت ڕادەکـــەن، ] وجاء أهلُ المدينةِ يستبشرون [ مزگێنییان بەیەکتردەدا کەسێ گەنجی زۆر جـوان گەیشتوونەتەماڵی لوت و فریایان بکەون !!!!..هەرهەموویان بەڕاکردن بەرەو ماڵی حەزرەتی لوت ڕایـان ئـەکرد و تەنانەت کارەکانیان جێدەهێشت.

خەڵکە داوێن پیسەکە چواردەوری ماڵەکەی حەزرەتی لوتیان گرتووە و تەمەننای ئەوەدەکەن کە دەستدرێژی بکەنـە سەر ئەوسێ گەنجە زۆر جوانە بەلاَم نازانن کە ئەو سێ گەنجە جوانە فریشتەی خـوای گـەورەن و بـۆ لـەناوبردنی ئەمان هاتوون و لەماڵەکەی حەزرەتی لوت میوانن.

حەزرەتی لوت لەماڵەکەی دێتە دەرەوە و سەیر دەکات بەدرێژایی ڕێگا و کۆڵانەکان ماڵەکـەی دەوردراوە و هەرچـی داوێن پیس هەیە لەچواردەوری ماڵەکەی کۆبوونەتەوە!!!!...

پێیان دەڵێت ئەی گەلی سەدوم لەخوای گەورە بترسـن و دووربکەونـەوە تـاوەکو سـزای سـەخت و بەئێـشی خـوای گەورەتـان بۆنەهاتووە، پێیان ئەفەرمووێت ] أليس منكم رجلٌ رشيد [ ئێوە پیاوێکتان تێدانییە خاوەن غیرەت بێت و پیاوەتی هەبێت؟ بۆ واز ناهێنن؟ و دوورکەونەوە، حەزرەتی لوت ئـەیووت ) یـاقوم هـؤلاو بنـاتی (..... هتـد ... مەبەستی کچەکانی شارەکەی وەکو کدووکچەکەی خۆی وان، ئـەی ئـەوەتا ئـەو هـەموو کـچە چییە لـەلاتان؟ بـۆ هاوسەرگیریی پێك ناهێنن؟ لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت سزای خوا بۆ هەرگەل و کەسێك بێ هودە نییە گەر مرۆڤەکان نەگەنە ئاستی شیاوی سزا وەرگرتن، ئەو خوای بالاَدەست سزایان نادات...

ئەوانیش بەدەنگ هەڵبڕین و گاڵتە پێکردنەوە دەیانووت :نازانیت کە ئێمە پێویستیمان بە ئافرەت نییە و لەسـەر ئەم کارە ڕاهاتووین؟ حەزرەتی لوت ترس دایگرت و گەڕایـەوە لای سـێ گەنجـە جوانەکـەی کـە لـەماڵی ئـەون و فریشتەی خوان و ئەو نایانناسێت، پێی فەرموون هەرچـۆنێك بێـت دەبـێ خۆتـان لەدەسـت ئـەو داوێـن پیـسانە ڕزگاربکەن، لێرەوە حەزرەتی جبریل دێتە وەلاَم و پێی دەفەرمووێت : ئەی لوت ئێمە فریـشتەین و نێـردراوی خـوای گەورەین، حەزرەتی جبریل لەژوورەوە دێتە دەرەوە و دەسـتێك بۆنـاو خەڵکەکـە ئەوەشـێنێت کەلـەنزیك ماڵەکـەی حەزرەتی لوت گردبوونەتەوە، ڕاستەوخۆ هەرهەموویان کوێر ئەبن و دەستبەجێ هاوار ئەکەن و پـڕ دەمیـان دەڵـێن لوت جادووی لێمان کرد و چاومان کوێربوو!!!!!...

هەرهەموویان بەکوێریی بەدوای ماڵەکانی خۆیاندا ئەگەڕان و دەستیان لـەزەوی دیوارەکـان دەدا تـاوەکو بگەنـەوە ماڵەکەی خۆیان !!!..کەواتە دەرەنجامی داوێن پیسی و چاوپیسی و ژیان پیسی کردن گەر دەرەنجامی ئەمە نەبێت ئەوا لەمە خراپترە، تا ئەو کاتەی کوێربوون هێشتا دەڵێن وازناهێنین و بەیانی دێینەوە، هەڕەشەیان لە حەزرەتی لوت کرد کەبەیانی ئەتکوژین و لەناوت ئەبەین، حەزرەتی جبریل بە حەزرەتی لوتی فەرموو ] انّ موعدهم الصبح [ بەیانی ڕۆژی لەناوچوونیانە و خۆت و دوو کچەکەت زوو لەشار بڕۆنە دەرەوە و ئاوڕ لەدواوە مەدەنەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت ] الا ال لوط نجيناه بسحر [ تەنها لوت و دووکچەکەیمان ڕزگار کـردن لەبـەیانییێکی زۆر زوودا، دوای دەرچوونی حەزرەتی لوت و دووکچەکەی لەناو سەدوم زەوی لەرزەیەکی توند ڕوویدا و گـەلی سـەدوم کەوتنـە سـەر ئەژنۆ، وەك پێشتریش وتمان حەزرەتی جبریل شـەش سـەد بـاڵی هەیـە هـەرباڵێکی بکاتـەوە ڕۆژهـەلاَت و ڕۆژاوا دائەپۆشێت، نوکە بـاڵێکی لەزەوییەکـەدا و بـەرزی کـردەوە و لەوکاتـە ترسـناکەدا هـەموویان کـوێرن و تـەنها لەهاوارکردندان، پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت : تەنانەت دەنگی سەگ و کەڵەشـێرەکانیان

گەیشتە گوێی فریشتەکانی خوا لەئاسمانەکان، چونکە لەڕادەبەدەر لەلایەن حەزرەتی جبریل شارەکەیان بەهەموو کۆشك وتەلار و خانووەکانەوە بەرز کرایەوە، ئنجا وەریگێڕایە ئەو دیوییەوە و خەڵکەکەی کەوتنە سەرزەوی و ئەوشارەی کەبەرزی کردبۆوە بۆ ئاسمان دای بەزەویدا، ئنجا خوای گەورە بەردبارانی کردن و هەر تاوانبارە و بەردێکی خۆی بەرکەوت ولەناوچوون.دوای ئەمانیش لە ولاتی ئیتالیا گەلێك پەیدابوون وەکو گەلی سەدوم رەفتاریان دەکرد تاوەکو خوای گەورە هەرهەمووی کردن بەبەرد کەئێستاش شێوە و لاشەی بەردینیان ماوە، چونکە نێربازییان دەکرد وەکو گەلی سەدوم.

ڕۆژێك دادێت ئەو ئەوروپایەش بەدەردی گەلی سەدوم دەچن و لەزەوی رۆدەچن، بەهۆی بەکارهێنانی ئەم رەوشتە پیسە زۆربەی ولاتانی ئەوروپی و لەلایەن پەرلەمانەکانیانەوە بڕیاری مارەبڕینی پیاو لەگەڵ پیاو دراو کڵێسەکانیشیان ڕێی بەم کارە نەشیاوو پیسەداوە، ئەی ئەوەتە نییە خوای گەورە نەخۆشی ئایدزی بۆناردوون و چەندە بەدەست ئەونەخۆشییەگرفتار و کوشندەن بەبێ ئەوەی بتوانن چارەسەرێکی بۆبدۆزنەوە، ئەم بەسەرهات و چیرۆکەی حەزرەتی لوت بۆ ئەوەیە کەئێمە بەخۆمان دابچینەوە و سنوورەکانی سێکس نەبەزێنین و زیادەرۆیی نەکەین لەم کارە چونکە خوای گەورە ئەم گەلەی کرد بە پەندو عیبرەتێك بۆ گەلانی دواتریش، بێگومان ئەم نەخۆشیی و ئەم دەردو عیللەتە رووبکاتە هەرخێزانێك و هەرکۆمەڵگەیەك و ولات و نەتەوەیەك ئەوا دەرووخێن وشیرازەی خێزان لەدەست ئەدەن و سزای خوای گەورەیان بۆ دێتە خوارەوە و لەقیامەتیش دەبێت چاوەڕێی سزایەکی زۆر توندتر بکەن خوای گەورە هەمووڵایەکمان بپارێزێت و هیدایەتیش بەهەمووڵایەکمان ببەخشێت....

شوێن و میحرابی حەزرەتی لوت سەلامی خوای لێبێت

* *

پێغەمبەر ئەیوب / سەلامی خودای لەسەربێت.

وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ (83) فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِنْ ضُرٍّ وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُمْ مَعَهُمْ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنَا وَذِكْرَى لِلْعَابِدِينَ ...(84) الانبياء.

پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموویێت : ئەگەر خودا کەسێکی خۆش بوویێت ئەوا بە نەخۆشی یاخود بە گرفت و بە نەبوونی و دەستکورتی و دەرد و بەلا بەسەری دەکاتەوە و تاقی دەکاتەوە ، ئەوەتا کەسێکی تابیعی دوای چەند مانگێك لە پێکهێنانی خێزان و ماڵ ، ژنەکەی داوای تەلاقی لێدەکات ، هاوەڵەکەش دەڵێت شتی

وانابێت و مەحاڵە ، ژنەکەیشی پێی ئەڵێ ماوەی چەند مانگێکە لای تۆم هێشتا نەمبینیوە دووچاری نەخۆشێك و بەلایەك ببیت ، کەواتە رەنگە خودا تۆی خۆش نەوێت بۆیە داوای جیابوونەوە لە تۆ ئەکەم ...

یەکێك لەو پێغەمبەرانەی بۆتە رەمزی ئەو خۆشەویستییە پێغەمبەر ئەیوبە سەلامی خودای لەسەربێ، ئەیوبێکی ئارامگر و بە حەیا و ئەدەب لەبەر دەم تاقیکردنەوەی خوادا ، ئەیوبێك کەشەرم دەکات لە ئاست نەخۆشییەکەی دەنگ هەڵبڕێت ، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ شەکوای حاڵی خۆی بۆلای خوای گەورە بەرز بکاتەوە و بڵێ ) انما اشكوا بثي و حزني الى الله ( گرنگییەکەی لەوەدایە شەکوای حاڵی خۆت بۆ خوا بەرز کەیتەوە و بەس بەلام ژیرانە و ئاقڵانە نەك بە ناشوکری و رازی نەبوون بەقەدەری کردگاری هەموو جیهان.

حەزرەتی ئەیوب نەوەی ئیبراهیمە و لە ئیسحاق پێغەمبەرە ، هەموو پێغەمبەران رەچەڵەکیان بۆ پێغەمبەر ئیسحاق دەگەڕێتەوە تەنها پێغەمبەری ئێمە نەبێت کە رەچەڵەکی بۆ ئیسماعیل پێغەمبەر دەگەڕێتەوە..

حەزرەتی ئەیوب بە سێ پشت ئەگات بە ئیسحاق پێغەمبەر و خوای گەورە ئەم ئەیوب پێغەمبەرەی بۆ ) حوران ( نارد کە کەوتۆتە شام ، خوای بالادەست هەموو شتێکی لەماڵ و منداڵ و سامان و جوانی پێ بەخشیبوو و تەنانەت چواردە مناڵی هەبووە ، و دوو ژنیشی هەبووە و خاوەن سامانێکی ئێجگار زۆربووە . هیچ کەم و کوڕێیکی نەبووە و پارەیەکی ئێجگار زۆری هەبووە و خەڵکان بۆ وەرگرتنی پارە و کۆمەکیی لەو پێغەمبەرە ڕیزیان گرتووە ، بازرگانێکی ناوداربوو و خزمەتکاری ئێجگار زۆری هەبووە ، بەلام بەخشش و نیعمەتی خوا تاسەر بۆ کەس نییە ، بەلام پێغەمبەر ئەیوب هیچ تاوان و گوناهێکی نەبووە و ناشوکری نیعمەتەکانی خوای نەکرد .. بەلام خودا خۆشی ویست و زیاتر ویستی وابوو تاقی بکاتەوە ، بۆیە لە کاتێکی زوودا هەر چواردە منداڵی مردن و جەرگی سووتا ... بەلام کام کەس لەئێمە ئەو توانایەی هەیە وەکو حەزرەتی ئەیوب بەرامبەر بە لەدەستدانی چواردە مناڵەکەی سەبرو ئارامیی هەبێت و زیاتر شوکرانەی خودابکات و فرمێسکێك لەچاوییەوە نەیەت ؟

ئەوەندەی نەبرد هیچی نەما و سەروەت و سامانەکەیشی لە دەست چوو ، تەنانەت مێگەل و مەڕ و ماڵاتی ئەوەندە زۆری هەبووە کەچی دانەیەکیشی نەما و زەوییێکی کشتوکاڵیشی نەما ، بەلام هێشتا تاقیکردنەوەکانی خوا بۆ ئەیوب ماویەتی و کۆتایی نەهاتووە ، تاوای لێهات دووچاری نەخۆشییێك بوو گۆشت لەلەش و قەدو بالای وەك گەلا هەڵئەوەری!!!

یەکەمجار نەخۆشیەکە پێستی پیرۆزی گرتەوە و رزی و شەقار شەقار بوو ئاوو کێمی لێدەهات و خوێنی لێ ئەتکا ، هەژدە ساڵ ئەم نەخۆشیە بەرۆکی پێغەمبەر ئەیوبی بەرنەدا و رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر بە ئێش و توندتر دەبوو...

ژنێکی مرد و تەنها ژنێکی مایەوە و جێی نەهێشت و جار جارەش دوو هاوەڵی سەردانیان ئەکرد و لە دوورەوە قسەیان لەگەڵ دەکرد ، تەنانەت لە ناو خەڵك وا بلاو بۆوە کە کەسێك لە ئەیوب نزیك بێتەوە هەمان نەخۆشی روو لە ئەویش دەکات!!!

لێرەوە پرسیارێك دێتە ئاراوە کە ئایا ئافرەتێك لەم رۆژگارەدا هەیە هاوتای خێزانەکەی حەزرەتی ئەیوب بێت ونموونەی ئەوی هەبێت و بەدرێژایی هەژدە ساڵ لەنەخۆش کەوتنی مێردەکەی ئۆقرە بگرێت و بەدیارییەوە دابنیشێت و خزمەتی بکات و بۆ ماوەی خولەکێکیش لێی دانەبڕێت؟ کێ هەیە بەدرێژایی هەژدە ساڵ لەجێگاکەی بکەوێت و ئنجا شوکری خودا بکات لەسەر ئەوبەلاو موسیبەتەی بەسەری هاتووە؟ یاخود لەگەڵ نەخۆشیەکەشی ئنجا رێز و خۆشەویستی بۆ خێزانەکەی دەربڕێت و فەرماۆشی نەکات و زیاتر دڵی خێزانەکەی بداتەوە و هێشتا لەسەر نەخۆشییەکەی خۆی رووبکاتە خێزانەکەی وبڵێ ژنەکەم سەبر وئارامیت هەبێت

حەزرەتی ئەیوب لەجێگا کەوتووە و تەواو بێتاقەتی رووی تێکردووە و بەو هۆیەوە کەس نەدوێرا بچێتەلای تەنها دووبرادەرەکەی نەبێت ، بەلاَم لەو کاتەدا دڵسۆزترین و دڵنەواترین کەس بۆ ئەیوب علیە السلام خێزانەکەی بوو ، رۆژێك لە رۆژان ئەو ژنە ئۆفێکی نەکردو بەردەوام خزمەتی دەکرد و بە دیارییەوە دادەنیشت.

تەنانەت پێغەمبەر ئەیوب گەیشتە ئەو رادەیەی بەیەکجارەکی کەوتە ناو جێگا و جەستەی پیرۆزی وشك بوو و توانای دانیشتن و نان خواردنی نەما ، سەیری ئەم پێغەمبەرە ئارامگرە بکە وشەیەکی ناشوکرانەی لەدەم دەرنەچوو و هەر دەیووت : الحمدلله ، تەنانەت داوای شیفای نەدەکرد چونکە دەیزانی ئەم بەلاَ و دەردە تاقیکردنەوەیەکی خودایە بۆ ئەو...

دەردو بەلاَکەی ئەیوب درێژەی کێشاو ژنەکەی پێی وت : بۆ دوعا ناکەی بۆ داوای شیفا لەخودا ناکەیت ئەی تۆ پێغەمبەر نیت خۆ نزای تۆ گیرایە؟؟؟ .. پێغەمبەر ئەیوبیش رووی لە خێزانەکەی کرد و فەرمووی : چەند ساڵ لە نازو نیعمەتدا بووین ؟ خێزانەکەی وتی : هەشتا ساڵ .. فەرمووی چەند ساڵە لەناو جێگا کەوتووم و نەخۆشم ؟ وتی : هەژدە ساڵ ، فەرمووی کەواتە هێشتا نەگەیشتۆتە شەست ساڵی تەمەنی پڕ لەناز و نیعمەتەکانم ... تاوەکو داوای شیفا لە خودا بکەم و سەبر بگرە هێشتا زووە ، دواتر خێزانەکەی حەوسەڵەی نامێنێت و بێزار بوونی خۆی دەخاتە روو...

زۆرجار دوعا ئەکرێت بۆلابردنی نەخۆشییێك یاخود ناخۆشییێك، بەلاَم وەلاَمدانەوەی لای خوای گەورە دوا ئەکەوێت و لەدنیادا گیرای ناکات و بەو هۆیەوە کەسی داواکار بێ ئومێد دەبێت و سەبری نامێنێ، باش بزانین هەرکەسێ نەخۆش بێ و نزا بکات ئەوا نزاکەی لای خوای گەورە قەبوڵە چ لەدنیا بێت یاخود لە قیامەت، و هەرکەسێکیش نەخۆش بێت لای خوای گەورە و میهرەبان خۆشەویستە، هەرکەسێکیش نەخۆش بێت و ئارامگربێت و ناشوکری نەکات، و گەر چاك بێتەوە، ئەوا گوناهەکانی وەکو گەلاَی دار هەڵئەوەرێت و خوێن و گۆشتەکانی جەستەشی لەجاران پاکتر و چاکتر شوێنی خۆی ئەگرێتەوە، تەنانەت ئەگەرهاتوو مردیش ئەوا بەبێ گوناهو تاوان سەرئەنێتەوەو بەدیداری پەروەردگاری شاد ئەبێت.

زۆرجاری واش هەیە خوای گەورە نزاکانمان دوا دەخات بۆتاقیکردنەوەمان یاخود وەکو پێغەمبەری ئازیز دەفەرمووێت :کاتێ بەندەیەك لەخوای گەورە ئەپارێتەوە خوای گەورەش وەلاَمی ناداتەوە و فریشتەکانیش ئەڵێن : ئەی خوایە بۆ وەلاَمی نادەیتەوە؟ خوای گەورەش دەفەرمووێت : پێم خۆشە گوێم لە دەنگی بێت و نزاو لاَلاَنەوە و موناجاتم بکات چونکە زۆرم خۆش ئەوێت، دواتر زیاتری ئەدەمێ و زیاتریش پێی دەبەخشم...

پێویستە بیرمان نەچێت دنیا بۆ تاقیکردنەوەی ئێمە هاتۆتە بوون، بەهەموو شێوازێك تاقیی ئەکرێینەوە )خۆشی و ناخۆشیی ( و بە ) سوپاس و ئارامگری ( سەردەکەوین و بەر رەحمەت و بەخششی خاوی گەورە و میهرەبان ئەکەوین.

پێغەمبەر ئەیوبیش رووی تێدەکات کە شەرت بێ سەد دارت لێبدەم لە بەرامبەر ئەو دڕکاندنەت ، پێغەمبەری پێشەوا دەفەرمووێت ئەوکەسە لای خودا خۆشەویستە کەرازی بێت بە بوون و نەبوون و بەرابردوو و ئاینده و یەقینی هەبێت کە لەهەموو کات و ساتێك خودا رەقیبە بەسەریەوە و لێی بێ ئاگا نابێت.

پێغەمبەر ئەیوب هیچ شتێکی نەما پێی بژێێت و هەموو دەرگایەکی لێداخرا ، تەنانەت ژنەکەی جووتیاری بۆ خەڵك ئەکرد بە مەبەستی کۆکردنەوەی خۆراك و پارە بۆ حەزرەتی ئەیوب ئەوەیشیان نەما ... ئەم ژنە هەر کۆڵی نەدا ، رۆژێك لەرۆژان خواردن دێنێتە پێش پێغەمبەر ئەیوب و حەزرەتی ئەیوبیش رووی تێدەکاو لە چۆنیەتی پەیداکردنی خواردنەکە پرسیاری لێدەکات ، ئەویش دەڵێ پەیدام کردووە و ئەم دیاردەیە چەند هەفتەیەك

دەخایەنێت ، دیسان حەزرەتی ئەیوب لە چۆنیەتی دەستکەوتنی خواردنەکە پرسیار دەکاتەوە و خێزانەکەیشی نهێنی پەیداکردنی خواردنەکە باس دەکات ، کە کەزییەکانی قژی بڕیوە و فرۆشتوویەتی تاوەکو خواردن بۆ ئەو پەیدا بکات ، خێزانی پێغەمبەر ئەیوب قژێکی زۆر درێژی هەبووە وکردوویەتی بە کەزی و بەسەر سەرییەوە ئالآندوویەتی ، بەم هەواڵە حەزرەتی ئەیوب دڵگران دەبێت کە چۆن قژی ئەو خێزانەی کەوتۆتە بەر دەستی کڕیارێك بەمەبەستی پەیدا کردنی خۆراك بۆ ئەو!!!...

جوانیی ئافرەت یەکێکە لەنیعمەتەکانی پەروەردگار، یەکێك لەو جوانیانەش قژەکەیەتی ...مافی خۆیەتی جوانی بکات و بیڕازێنێتەوە و دڵی پێ خۆش بێت، بەڵام ئاخۆ بەکارهێنانی ئەم جوانییە و دەرخستنی بۆ هەموو کەسێکە و لەهەمووکاتێکیش؟ بۆخوای گەورە فەرمانی کردووە کەئافرەت دەبێت قژی دا پۆشێت؟ تۆ بڵێی ئەم فەرمانە زیان بە جوانیی ئافرەتەکەوە بگەیەنێت؟ یاخود لەخۆشەویستیی و ڕێز ڕاگرتنی ئافرەتەکەوەیە؟ بێگومان پەروەدگاری مەزن فەرمانی بەکارێك کردبێت بۆ ئێمە، جێبەجێکردنی مایەی بەختەوەریمانە لە دنیا و لەدواڕۆژ ....کەواتە نەکەی ئەم فەرمانە پشتگوێ بخەیت و بەسووکیی بزانیت، بزانە خێزانەکەی حەزرەتی ئەیوب بەکوێ ئەگات؟!!!!!

ئا لێرەدا حەزرەتی ئەیوب سەری بۆ ئاسمان بەرز دەکاتەوە و دەفەرمووێ ] ربی انی مسنی الچر وانت ارحم الراحمین [ ئەم نزایەی حەزرەتی ئەیوب دوای هەژدە ساڵ بۆ نەخۆشییەکەی نییە بۆ ئەو موسیبەتە نییە کە بەسەری هاتووە ، بۆ لە دەستدانی ژنەکەی و چواردە منالْ و سەروەت و سامان و نازو نیعمەت و بازرگانییەکەی و خزمەتکارەکانی نییە ، بەڵکو بۆ خستنە دەرەوەی قژی خێزانەکەیەتی و خەم و خەفەتی لەوە خوارد ، تەنانەت دوعای نەکرد خودایە بابەس بێت ئەم نەخۆشیە و بەتەنها ئەو نزایەی کرد...

ئەم خەم و خەفەتەی ئەیوب بۆ نەوەکانی دوای خۆیەتی کەترسی لەوە هەیە ڕۆژگارێك دابێت خوشکان و ئافرەتان سەرپۆش نەبن و قژیان بەدەرەوە بێت کە هۆکارێکە بۆ ) فیتنة و فەساد ( کە لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆمان تێیکەوتووین

.

ئەوەتا خودا بە پێغەمبەرمان رادەگەیەنێ ) واذکر عبدنا ایوب ( ناڵێ پێغەمبەرەکەم بەڵکو بەبەندە ناوی دەبات ، بۆ ئەوەی خەڵکان پەند و عیبرەت لە سەبر و ئارامگریی ئەو وەربگرن ..

بەڵێ دوای نزاکەی ئەیوب خودا فەرمووی ) فستجبنا لە ( بەبێ دواکەوتن وەڵامی دایەوە و نزاکەی گیرا کرد ، و ڕاستەوخۆ خودا فەرمانی بە حەزرەتی ئەیوب کرد ) بڕۆ بۆ شوێنێك پێیەکانت لە زەوییەکە بدە و ئاوێك دێتە دەرەوە و دەستبەجێ لە نەخۆشییەکەت ڕزگارت دەبێت ، و فەرمانی خودای بە جێ هێنا و وایکرد ، ئاوەکە دوو جۆر بوو ) مغتسل و شراب ( بۆ خۆشۆردن و خواردنەوە کە شیفای بە حەزرەتی ئەیوب بەخشی.

لەگەڵ خۆشۆردن نەخۆشیەکانی جەستەی نەماو چاك بۆوە لەکاتی خواردنەوەی ئاوەکەش هەموو لەشی چاك بۆوە ..

پاشان خودای گەورە کوللەیەکی ئێجگار زۆری بۆلای پێغەمبەر ئەیوب نارد بەڵام چ کوللەیەك کە هەمووی زێڕ بوون و هەرهەموو کوللەکان جەستەی حەزرەتی ئەیوبییان دا پۆشت چونکە لە کاتی خۆشۆردن بە ئاوەکە جەستەی ڕووت بوو، پێغەمبەر دەفەرمووێت پاشان ئەیوب پێغەمبەر کوللە زێڕەکان کۆ دەکاتەوە و دەییات و خوداش پێی دەفەرمووێ : ئەی ئەیوب بەس نییە نیعمەتی زۆرم پێبەخشیوی ؟ پێغەمبەر ئەیوبیش دەفەرمووێ : جا خودای گەورە کەسێك هەیە لە ناز و نیعمەتەکانی تۆ تێر بێت ؟؟؟ پاشان بەرەو ماڵ گەڕایەوە و خێزانەکەی بەمە ئاگادارنییە و وەکو جاران گەنج بۆوە و نەخۆشی لە ڕووخسار و لەشی نەما ، لەژوورەکەی جارانی دادەنیشێت و خێزانەکەی دێتەوە ماڵەوە و دەچێتە ژوورەوە و چاوی پێدەکەوێت و دەگەڕێتەوە دواوە و ئەترسێت و پرسیاری لێدەکات کە کوا ئەو پیاوەی لەو

جێگایە سالأنێکە کەوتووە و نەخۆشی بەرۆکی بەر نەداوە ؟ حەزرەتی ئەیوبیش دەفەرمووێ : کێیە ئەو کەسە ؟ خێزانەکەیشی دەفەرمووێ : لە کاتی لاوێتیدا شکڵ و شێوەی هەرلەتۆ دەچوو !!!!
پێغەمبەر ئەیوبیش پێدەکەنێ و دەڵێ من ئەیوبم !!! ئەوکاتە کە حەزرەتی ئەیوب دووچاری نەخۆشیکە بوو تەمەنی هەشتا سالأن بوو ، دوای چاك بوونەوەی خوای گەورە تەمەنی گەڕاندەوە تافی لاوێتی .. ئیبن عەبباس لە پێغەمبەر دەگێڕێتەوە کە بەویست و فەرمانی خودای گەورە خێزانەکەی حەزرەتی ئەیوبیش وەکو ئەو هاتەوە تەمەنی لاوێتی !!!
هەروەها ناز و نیعمەت و سامانەکەی بۆ گەڕایەوە ، کەبەخششی خودا بوون ئەویش کوللە ئاڵتوونیەکان کە لە کاتی خۆشۆردن بە ئاوەکە لەلایەن خوداوە بە دیاری بۆی هات ، بۆئەوەی سوێندەکەی لەسەر نەکەوێت کە بە خێزانەکەی وت دەبێ سەد دارت لێبدەم بەفەرمانی خودا سوێندو شەرتەکەی هێنایە جێ کە خودا فەرمانی پێکرد لە بری سەد دار سەد پووشو پەلأشی داری لێبدات نەوەکو ئازاری پێ بگات ... لەریوایەتێتدا هاتووە کە حەزرەتی ئەیوب پاش ئەو هەموو تاقیکردنەوەی خوای گەورە بەرامبەری و لەبەرامبەر سەبر و ئارامییەکەی خوای گەورە بیست و شەش کوڕی پێ بەخشی و یەکێك لەکوڕەکانی بوو بە پێغەمبەرکە ئەویشیان حەزرەتی ) ذوالکفل ( بووە سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت، بۆیە بەم نازناوە ناسراوبووە چونکە کەفالەتی هەمووکەسێکی کردووە و تەنانەت لەشەونوێژەکان و رۆژووەکاندا بۆتە کەفیلی خودی خۆی و خەریکی بانگەواز و چاکسازی بووە لەناو گەلەکەیدا.
ئەم هەموو نیعمەت و بەخششەی خوایە بۆچی؟ چونکە حەزرەتی ئەیوب زۆر ئارامگر و لەسەرخۆبوو بەرامبەر بەنەخۆشییەکەی و رۆژێك لەرۆژان ناشوکری خوای گەورەی نەکردو هێشتا ئیستغفار و تەسبیحاتی خوای دەکرد.

*هەرکەسێ نەخۆش و دەردە دارە، هەرکەس بێ بەشە لە نازو نیعمەتی دنیا و خوای گەورە بەشتێك لەشتەکان تاقیی کردۆتەوە، خەیاڵ نەکەیت خوای گەورە رقی لێتە، پێغەمبەر سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت دەفەرموێت ] إذا أحب الله عبدا ابتلاه [ گەر خوای گەورە کەسێکی خۆش بوێت ئەوا تاقیی دەکاتەوە.
*سەروەت و سامان و ماڵی دنیا موڵکی ئێمەنین و رۆژێك دادێت بەجێی دەهێڵین و لەدەستی ئەدەین، چونکە ئەوەی لەبەردەستماندایە هەرهەمووی موڵکی پەروەردگارە و هیچی هی ئێمەنییە، گرنگ ئەوەیە لە پێناوی خوای گەورە سەرفی بکەین و بەفیڕۆی نەدەین و وانەکەین سڵ لەحەرام و حەلأڵ نەکەینەوە.
*گەر دڵنیابووی رزقەکەت کەسێك نایخوات و کەسێکیش دەستکاری ناکات و کار و کردەوەکەت بۆ کەسێك نییە، ئەوکات لەبەندایەتی دنیا ودینار دەردەچێت و بەندەیەکی راستەقینەی خوای خۆی دەبێت و بەختەوەر و سەرفراز ئەبێت.

*                    *                    *

**پێغەمبەر یونس سەلامی خودای لەسەر بێت:**

**وَذَا النُّونِ إِذْ ذَهَبَ مُغَاضِبًا فَظَنَّ أَنْ لَنْ نَقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ (87) فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ..(88) الانبياء.**

**هەر کاتێك باسی پێغەمبەرێك دەکرێت ئەوا دەبێ بزانین کەسایەتی ئەو پێغەمبەرە تەواوە و نوقسانی نییە بەرامبەر بەو پەیامەی خوای گەورە بۆی ناردووە تاوەکو ئەویش بەخەڵکی بگەیەنێت، جگەلەوەی سەرجەم پێغەمبەران مەعسومن لەگوناح و دوای پێغەمبەران هیچ خەلیفە و جێ نشینێك مەعسوم نین لەگوناح و تاوان، ئەگەر خەڵکان کەسێك بکەن بەبەرز و لوتکە ئەوا مەرج نییە ئەو کەسە مەعسوم بێت لەگوناح، چونکە مرۆڤەکان و پیاوچاکان و پێشەواکان هەرهەموویان لەدەرەوەی ئەو مەعسومەدان، و یەکێکی تر لەسیفەتی پێغەمبەران پێشەنگییە و پێویستە هەموومان بیانکەین بە قودوە و پێشەنگ و سەرمەشقی، جگە لەوەش مرۆڤ دەکرێت بە پێشەنگ وەك ئەوەی گوێ بۆ راسپاردەکانی بگریت و بەگوێی ئامۆژگارییەکانی بکەیت، بەلام دەبێ پێش خەڵکانی تر خۆی جێبەجێی بکات و پەیڕەوی بکات، لەوکاتەدا تۆبۆت هەیە بڕیارو راسپاردەکانی بەجێ بگەیەنیت، بۆنموونە :لەقوتابخانەیەك و لەپۆلێکدا مامۆستایەك بۆ ماوەی مانگێك قوتابیەکانی بخاتە ژێر چاودێرییەوە و پێیان بڵێت کامتان ئاقڵ و ژیربێت دەیکەم بە چاودێر وپێشەنگ بەسەر قوتابییەکانی تری پۆل، دەبینیت سەرجەم قوتابیانی پۆلەکە و هەرکەسە و لەشوێنی خۆی دەبێت بەپەپوولەیەك و بەبێ دەنگی و ئاقلانە لەسەر کورسییەکەی دادەنیشێت .کەواتە مامۆستاکە کارێکی باشی کرد و قوتابیەکان گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکەی بوون، ئەی ئەگەر قوتابییێکی پۆلەکە بەپێشەنگ و چاوێر هەڵبژێردرا و قوتابیەکانی تر بەگوێیان کرد ئەوا ئەویش بەهۆیەوە خێرێکی دەست دەکەوێت وداوی مردنیش ئەو مامۆستا و قوتابیە خێریان پێ ئەگات، بەلام ئەگەر کەسێك خۆی بەپێشەنگ بزانێت و زار و زمانێکی خراپ و جنێوئاسای هەبێت و تۆ بەگوێی بکەیت و وەکو ئەو بکەیت ئەواوەکو ئەو خراپەت بۆحیسابە سەرباری گوناهی زیاتر بۆئەو، بۆنموونە :ئەگەر منالێك لەباوکییەوە فێری جنێوو قسەی ناشیرین بێت ئەوا گوناهەکە بۆ باوکەکەی و بۆخۆیشی ئەگەڕێتەوە.بشزانین لەدوای مرۆڤ دووشت بەجێدەمێنن ئەوانیش ) صدقة جارية و سيئة جارية ( ن، خراپەکەش روون و دیارە وەکو ئەوەی کچێك لەبازاڕدا جل وبەرگی خراپی پۆشیبێت و لەشی بەدەرەوەبێت و کچێکی تر چاو لەوبکات و مۆڵەت لەباوکی وەربگرێت کەڕێگەی بدات جلی هاوتای ئەو بپۆشێت، باوکەکەی ڕێگەی بدات ئەوادەقات گوناهی زۆرتر بۆکچکەی یەکەم ئەنووسرێت کەکچەکەی دووەم چاوی لێکردووە و جلی وەکو ئەوی پۆشیوە، یاخوددایکێك لەماڵەوە بەشێوەیەکی خراپ منداڵەکەی پەروەردە بکات ئەوا دوای مردنی دایکەکە دەهەندە گوناهوخراپە بۆ دایکەکە ئەچێت.**

**بالێرەوە بڕیاربدەین لەسەرەتای تەمەنمانەوە ببین بە پێشەنگ و قودوە بۆ خەڵکان و وابکەین هەموولایەکمان ) صدقة جارية ( کە بکەینەسەرمەشقی ژیانمان لەجووڵە وهاتن وچوونمان و هەڵس و کەوتمان بەرامبەر بەخەڵکان بەڵکو بەهۆی ئێمەوە هیدایەت روویان تێبکات و دوای مردن و دەرچوونمان لەم دنیایە خێر و چاکەمان بۆبێت لەبری خراپە.**

**لێرەوەش سەیربکە پێغەمبەری ئازیزمان یەکەم شت کە هەڵیبژارد پێشەنگ و قودوە بوو، وەکوهەڵبژاردنی پێشەوا ئەبوبەکری راستگۆ لەشوێنی خۆی تاوەکو ببێت بە ڕێنمایی بەخش بە هاوەڵان و یارانی پێغەمبەر، جگەلەوەی**

پێغەمبەری پێشەوا دوعای کرد و فەرمووی خوایە ئیسلام بەیەکێك لەم دوو عومەرە سەربخەیت کە ئەوانیش ئیمامی عومەر و ئەبو جەهل بوون، دوعاکەی هاتە جێ و بەهۆی ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای گەورەی لێبێت ئیسلام سەرکەوت و بووبەئایینی فەرمی هەموو جیهان لەچاو ئایینەکانی تر، بۆچی خودا هیدایەتی عومـەری داو، بووبە پێشەنگ و قودوەی موسڵمانان؟ چونکە ڕۆژێك لەڕۆژان پەنای نەبردبووە بەر خراپەکاری و زیناو حەرام خواردن و کەسێکی پاك بوو.

هەروەها ) صهیب الرومي ( گە نجێکی جوان و دەوڵەمەند، لـەوڵاتێکی دوورهـاتوو بـۆ مەککـە و مەدینـە بـوو بـە پێشەنگی هاوەڵەکان، ولەولایشەوە )بلال بن ربـاح ( کەسێکی حەبەشی و بەندەی ژێر دەستی ئوممەییەی سـتەمکار دەبێت بە پێشەنگی بەندەکان !!...جگەلەوەی ئەم پێغەمبەرە هـاوەڵێکی ڕەوانـەی شـارێك دەکـرد بـۆ بانگـەواز و بانگکردنی خەڵکی دواتر ئەم هاوەڵە بە سێ هەزار کەسەوە دەهاتەوە خزمەت پێغەمبەری پێشەوا سەلات و سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت، ئێمەش هەرکەسە و لەڕاستەخۆی بابیێت بە قودوە و پێشەنگ بە نموونەی ڕەوشتی جوانی و بەجل وبەرگی و بەئاکار و ڕەفتاری، با لەکۆلێژ و لەقوتابخانـە و لەفەرمانگـە بـبین بـە نموونـە وپێـشەنگی کەسانی دەوروبەرمان و گوفتار شیرین بین و ڕەفتار باش بین، یاخود لەماڵەوە باوکێکی ڕیش سپی وپشت چـەماوەی نەخوێندەوار بۆتە مایەی بەرەکەت بۆ ماڵەکـەی بـە پـەروەردەکردنی منداڵـەکانی، کەمنداڵەکـە خـاوەن ڕەوشـت و پەروەردەیەکی جوان بێت، ئەوا وەك پێغەمبەری ئیسلام فەرموویەتی لە ڕۆژی دوایی ئەم منداڵە دەبێت بـە ) صـدقة جارية ( بۆ ئەوباوکە و لە ئازار و ناڕەحەتیەکانی ڕۆژی قیامەت ڕزگاریی دەبێت .

 بالێرەوەش ژیان وبەسەرهاتی گەورەترین و پێشەنگترین پێغەمبەری خوا بخوێنینەوە کەئەویش حەزرەتی ) یونس (د، سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت.

لەشوێنێکدا بە ناوی نەینەوا کە کەوتۆتە باکووری عێراق گەلێك هەبوون بـە بـەردەوامی خەریــــــکی شـیرك و تاوان و گوناح بوون ، هەندێ لە زانایان دەڵێن ژمارەی ئەو گەلە سەد هەزار کەسێك بووە و هەندێـــــکی تـریش دەڵێن زیاد لە سەد هەزار کەس بووینە و نزیکەی سەد و حەفتا هەزار کەسێك بوون ، خـوای گـەورە بـۆ ڕێنمـایی و هیدایەتی ئەم گەلە پێغەمبەرێك دەنێرێت بە ناوی یونـــس عليه السلام ، وەك فـــــــەرموویەتی ] وارسلناه الى مائة الف او يزيدون. [

حەزرەتی یونس سەلامی خوای لەسەر چەندین ساڵ لەناو ئەو گەلە مایەوە و بە هەموو شێوەیەك بانگەوازی لەگەڵ کردن ، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو چونکە گەلەکەی نەینەوا زۆر سەرەڕۆ و سەرسەخت بوون و گەیشتە ئەو ڕادەیـەی ڕووبەڕووی حەزرەتی یونس بوونەوە و گێرایان کرد . لێرەدا حەزرەتی یونس زۆر خەمبار و بێ تاقەت دەبێت و خودا وەحی بۆنارد و پێی فەرموو ئاگاداری گەلەکەت بکەوە ئەگەر تا سێ ڕۆژی تر باوەڕ نەهێنن ئـەوا تونـدترین و بـە ئێش ترین سزاتـان بۆ دەنێرێت.

حەزرەتی یونس هەموو خەڵکەکەی کۆکردەوە و ئاگادار کردنەوەکەی خودای پێ ڕاگەیانـدن و گوێیـان لێ نـەگرت و دوایی جێی هێشـــــتن ] فاذالنون اذ ذهب مغاضبا .. [ لەگەلەکەی تووڕە بوو و ڕێی دەریای گرتە بەر ... دوای سـێ ڕۆژ لە ئاگادار کردنەوەکەی یونس سەلامی خودای لەسەر هەورێکی ڕەش سەرتاپای ناوچەی گەلەکەی گرتەوە بەڵام چ هەورێکی ڕەش و ترسناك ، وتیان خۆ بڕیارەکەی هاتە جێ!!!..

چاکسازان نابێ بەئاسانی واز لە ئامۆژگاری دەوروبەریان بێنن، مەرج لە بەرابیدا خـەڵکان بـەگوێت بکـەن بگـرە زۆرجار دژایەتیشت ئەکەن و گاڵتەت پێ ئەکەن، یەکێ لەو نەخۆشییانەی کە ) بەنی ئیسرائیل( ی، لەناوبرد وەکو

پێغەمبەری پێشەوا ئەفەرمووێت ) ئەمڕۆ فەرمانیان بە چاکە ئەکرد و بەیانیش پشتگوێیان ئەخست و وازیان لێدەهێنا ( !!!..کەواتە نابێت کەسێك دەستەوسان دابنیشێت لەوکاتەی هەڵگری پەیامی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەیەتی، و بەدیار ئەوخەڵکەوە دابنیشێت و سەیریان بکات و بڵێت چیان بەسەردێت ونایەت ئارەزووی خۆیانە .سەیرکە حەزرەتی یونس بەبێ پرسی خوای گەورە گەلەکەی جێ هێشت و دواتر ەکەوێتە ناوسکی نەهەنگێکەوە، بۆیە لەفەرموودەی پێغەمبەری خۆشەویستدا هاتووە ) یا ئەوەتا فەرمان بەچاکە ئەکەننەهی لەخراپە ئەکەن، یا ئەوەتا خوای گەورە سزای بە ئێشیان بۆدەنێرێت و بەو هۆیەوە لەناودەچن.

ئەمڕۆش هۆکاری ئەنجامدانی ئەو کارە گرنگ و پیرۆزانە زۆر ئاسانە و دەتوانی لەڕێی هۆکارەکانی بینین و بیستن سوود و کەڵك بە خەڵکان بگەیەنیت و دەتوانیت لەبواری راگەیاندن وەکو ئینتەرنێت و دەنگ و ڕەنگ و تەنانەت بەجل و بەرگیشتەوە دەتوانیت چاکەیەك بڵاو بکەیتەوە وسوودێك بەو خەڵکە بگەیەنیت، کەئەمەش ئەرکیی سەرشانی هەموو کەسێك و بانگخوازێکە.

فەرمانڕەواکانی نەینەوا هەموو خەڵکەکەیان کۆکردەوە و ترسان و وتیان با بەکۆمەڵ تۆبە بکەین و ئیستغفار بکەین ، چونکە هەواڵی لەناو چوونی گەلانی پێشی خۆیان دەزانی وەکو گەلی عاد و گەلی لوت .. هەر هەموو خەڵکەکە بە لێشاو روویان لە چۆڵەوانی کرد و جل وبەرگی بەریان بەراوژوور کرد و لە پڕمەی گریانیاندا ، کە لە بیابان و چۆڵەوانییەکە بە کۆمەڵ دەستیان بە تۆبە کرد خودای گەورەش تۆبەکەی قەبووڵ کردن و گیرای کرد و هەورە رەشکەش نەماو رۆیشت، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کاربەدەستان و کەسانی خاوەن بڕیار کاریگەرییان لەسەر میللەتەکەیان هەیە، بەخۆداچوونەوە و هەڵوێستە بۆهەڵەکان و مومارەسەی خراپ لەژیان سەرەتای سەرکەوتنە، داننان بەهەڵە و تاوان و پەشیمان بوونەوە نیشانەی گەورەیی و دڵسۆزییە بۆ میللەت، هەر نەتەوەیەکیش لەو ئاستەدا نەبێت گوناهو تاوان ئەنجام بدات و دەسبەرداری نەبێت و چاو لە سەرکردە و دەسەڵاتدارەکان بکات ئەوا خوای گەورەش بەوهۆیەوە دەرووی خێریان لێناکاتەوە و بەبەردەوامی دەسەڵاتداری ستەمکار فەرمانڕەوایەتییان بەسەردا ئەکات و دەیانچەوسێنێتەوە، تێبینییێکی گرنگ لەم ڕووداوەدا هەیە ئەویش ئەوەیە :هەرکاتێك گوناهو تاوان لەدەستی ئێمە ڕوویدا هەرلەوشوێنەی کە هەڵەو گوناهو تاوانەکەمان تێیدا ئەنجام داوە ئەوا پێویستە دەستبەجێ تۆبە بکەین و داوای لێخۆشبوون لەخوای گەورە بکەین و بۆکاتێکی تری دوانەخەین.

حەزرەتی یونس سەلامی خودای لەسەر لەناویان نەماوە و لەو بڕوایە دایە گەلەکەی نغرۆ بوون و هەرهەموویان بەر سزای خودا کەوتوون ، پاشان حەزرەتی یونس بەرەو کەشتێکی گەورە کەوتە ڕێ ، کەشتیە زەبەللاحەکە گەشتیار و خەڵکێکی زۆری هەڵگرتبوو لەوکاتەشدا باوبۆران و شەپۆلێکی گەورە هەڵیکرد و خەریك کەشتییەکە نقومی دەریا بێت، لەترسی نقوم بوونی کەشتیەکە تاخمی کەشتیەکە بڕیاریاندا هەندێك لەکەل و پەلەکانی سەر کەشتیەکە بخەنە دەریاوە و فڕێی بدەن.

ئەمجارە وتیان سوودی نییە و با هەندێ لەسەر نشینەکان هەڵبدەینە ناو دەریاوە ، کۆمەڵێك داریان هێناو ناوی هەرهەموو سەرنشینەکانیان لەسەر نووسی و کردیان بە تیرو پشك تاوەکو یەکێك هەڵبدەنە دەریاوە و یەکەم دار راکێشرا ناوی حەزرەتی یونس دەرچوو کە دەبێ فڕێ بدرێتە دەریاوە.

لەوکاتەدا یەکێك حەزرەتی یونس ئەناسێتەوە و دەڵێ ئەمە پێغەمبەرە و کەسێکی ساڵحە با لەناومان بمێنێتەوە ، بە گوێی دەکەن و دیسان دەست دەکەنەوە بە تیر و پشك بۆ جارێکی تر هەرناوی حەزرەتی یونس دەردەچێتەوە !!! و جاری سێیەمیش بە هەمان شێوە کە لە کەشتییەکە دەرئەکرێت لەیەکەم هەنگاوی کەوتنە ناو ئاوەکەوە ئەکەوێتە

دەمی ماسێکی گەورە ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت خودای گـەورە راسـتەوخۆ فـەرمانی بــە ماسـییە گەورەکە کرد کە نەگۆشتەکەی برزێنێت نە ئێسقانەکانیشی ورد بکات و بەڵکـــــــــو بیهێڵەوە لەلای خۆت.

هەندێك لە زانایان دەڵێن سێ رۆژ لە ناو سکی نەهەنگەکە مایەوە و لەوشوێنە حەزرەتی یونس هەستی بە تاریکیی کرد و پێیەکانی جووڵاند و کڕنووشێکی بۆ خودا بردو فەرمووی خودایە لە شوێنێك کڕنووش بۆ گەورەیی تۆ دەبەم کە تائێستا کەسێك لە شوێنێکی ئاوا کڕنووشی بۆت نەبردووە.. گەنجەکان تکایە لەیادتان نەچـێت لەهـەر شـوێنێك بوون ئەتوانن خواپەرستی بکەن، دەتوانی بەلاشە و بەچاوو دڵ و هەست و بیر کڕنـووش بۆخـوای گـەورە ببـەیت و پەرستشەکەت بەجێ بگەیەنیت، هیچ کاتێ سڵ نەکەیتەوە و شەرم نـەتگرێت ونـەڵێیت :شـەرم دەکـەم لەوشـوێنە عیبادەتەکەم بەجێ بگەیەنم، نەخێر بۆتۆ زۆر ئاسایی بێت شوێنەکە بەکار بهێنیت بەمەبەستی یاد و زیکرکردنـی خوای گەورە، کاتی دەست بەتاڵی مەهێڵە و بەفیڕۆی مەدە و دڵەکەت بەخوای گەورەوە ببەستە...

حەزرەتی یونس هەستی بە هەڵەکەی خۆی کرد کە نەدەبووایە جێی هێشتبان بەر لە سێ رۆژەکـە و بۆیـە لـە نـاو ســـــکی نەهەنگەکە یەکسەر پەشیمانی ڕووی تێکردو سەری بردە کڕنووش بۆ خودا بـەڵکو لێـی خـۆش ببێـت لـە بەرامبەر ئەو هەڵەیەی کە کردی ، لەوکاتە حەزرەتی یونس گوێی لە چپە چپی ماسـییەکانی نـاو دەریـا دەبێـت و خوداش وەحی بۆ دەنێرێ کە ئەم هەموو مەخلوقاتەی دەریا تەسبیحاتی من دەکەن.

دەستبەجێ حەزرەتی یونسیش لەناو سکی نەهەنگەکەدا دەست دەکات بە تەسبیحاتی خودا و دەفەرمووێت ] لااله الا انت سبحانك اني كنت من الظالمين . [ بەدرێژایی ئەو سێ رۆژە و لەناو سکی نەهەنگەکە هەر ئـەو نزایـە دەکـات و دەلاڵێتەوە بەڵکو خودا لێی خۆش ببێت ، پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت ] فاســــتجبنا له و نجيناه من الغـم و كژلك ننجي المؤمنين [ و دواتر بەفەرمانی خودا نەهەنگەکە لەدەمی یـونس پێغەمبــەری فڕێدایــە دەرەوە و کەوتــە نزیك بیابان.

زۆر کەس وائەزانن تەنها ئەمە بۆ پێغەمبەرانە بەپێچەوانەوە هەرلەبەر ئەمەیە بەشێوەی ) عملی ( کرداری خــوای گەورە چۆنیەتی سەرکەوتن و رزگاربوون و هتد ....بۆ پێغەمبەران ئەهێنێت و بــەو هۆیــەوەش دڵــەکانمان ئــاودێر دەکات...

بەسەرهاتێك:

پیاوێك باسی خۆی گێڕایەوە و وتی : لەساڵی1988 ی زایینــی پێـشمەرگەبووم لەگـەڵ پۆلێـك لەهاوەڵـەکانم لەسنووری پێنجوین و نزیك سنووری ئێران، کەوتینە بۆسەیەکی سوپای عێراقی و هەوڵماندا هەرچۆنێك بێت خۆمان لەدەست بەعسییەکان رزگاربکەین و خۆمان بەدەســتەوە نــەدەین، ئێمــە بــەرەو لوتکــەی شــاخەکان ئەڕۆیــشتین و لەوکاتەشدا بەفرێکی ئێجگار زۆر دەباری و کەش و هەواش لەرادەبەدەر ساردبوو ...

لەوکاتەدا یەکێك لەهاوەڵەکانم هەڵخلیـسکا و کەوتــە خــوارەوەی دۆڵێــك لــەخوا دۆڵەکــەش خــاڵێکی چــاودێری سەربازانی بەعس هەبوو، هەندێك لەبرادەرەکانم وتیان جێی بهێڵین باشترە و ئەو بەتەنها بمرێت چاکترە نەوەك هەرهەموومان!!!.

ئەم دەگێڕێتەوە و دەڵێت : من گوێم بەقسەی برادەرەکانم نەداو چەندەی کردم ویژدانم ڕێی پێنەدام ئەو بــرادەرەم جێ بهێڵم کە کەوتە دۆڵەکەوە، پێــشم وتــن : ئەگــەر بــشڕۆن مــن بــەهیچ شـێوەیەك جێــی نــاهێڵم و دەیخەمــە سەرشانەکانی خۆمەوە و رزگاری ئەکـەم، بەهــەرحاڵ چــوومە خــوار دۆڵەکــەوە و برادەرەکــەم هــەڵگرتوو خــستمە سەرشانەکانمەوە و بەتەنها ڕۆیشتم لەبەرئەوەی پێشمەرگەکانی تر جێیان هێشتین و خۆیان رزگار کرد !!!..تینــی

سەرما و سۆڵە و زامدار بڕادەرەکەم ماوەی نەداین خۆمان ڕزگاربکەین و بەناچاری خۆمان گەیاندە خاڵی چاودێری سەربازانی حیزبی بەعس و خۆمان دا بەدەستەوە، کە چوومە خاڵی چاودێرییەکە وتم پێشمەرگەین و هاتووین خۆمان بەدەستەوە بدەین.

دەستبەجێ ڕەوانەی ئەمنی سلێمانی کراین و دواتر بەرەو بەغدا ...لەوێش دوای ئەشکەنجە و ئازارێکی ئێجگار زۆر و تێهەڵدان و ئیهانە کردن ئێمەیان بەرەو دادگا برد و بڕیاری لەسێدارەدانمان بەسەر ردا سەپێنرا !!..من تا ئەوکات کڕنووشێکم بۆ خوای گەورە نەبردبوو، هەموو شەوێك بەبەرچاوی من کۆمەڵێك بەرەو ژووری سێدارەدەبردرا و لەسێدارە دەدرا، من هەموو کاتێك لەچاوەڕوانی ئەوەدابووم بڕیارەکە بچێتە بواری جێبەجێکردنەوە و لەسێدارەبدرێم، بەردەوام لەناخی خۆم دەپرسی : کەی ڕەوایە تاوەکو ئێستا خوای خۆم نەناسیوە و ئایا ژیان هەر ئەوەندەیە و تەواو؟؟ لێرەوە خوای گەورە ڕۆشنایی باوەڕی خستە دڵمەوە و، تۆبەیەکی ئیخلاسم بۆ خوداکەم کرد و کەوتمە کڕنووش بردن بۆ خوای گەورە، وتم : ئەی خوای گەورە من تاوەکو ئێستا تۆم نەناسیوە و داوات لێدەکەم مۆڵەتم بدەیت نەوەك لەبەرئەوەی لەترسی مەرگ و لەسێدارەدان تۆبە بکەم لەبەر ژیانی بەفیڕۆچووی چەندین ساڵەی ڕابردووم!!!... زۆر لەخوای گەورە پاڕامەوە و دەستم کرد بەنوێژ و زیکر و کڕنووش بردن، زۆر گریام و لاڵامەوە و پەشیمان بوومەوەن بۆ چەند ساتێ خەوم لێکەوت و لەخەوما دووکەس منیان بۆدادگا برد....

ئەو دوو پیاوە توند دەستەکانیان گرتبووم، لەوکاتەدا پیاوێك بەرەو ڕووم هاتوو وتی : مەترسە، بەرەو ژووری دادوەر دەیانبردم و لەمبەر ولەوبەر ماسی گەورە لەسەر کلکەکانیان وەستابوون و لەوکاتەدا پیاوێکی زۆر جوان و نورانی لەناو ماسییەکان هاتە دەرەوە و بەرەو ڕووم هاتوو وتی : مەترسە و تەنها ئەم زیکرە بکە ) لاالـه الا انت سبحانك اني كنت من الظالمين .. ( سەرم سووڕما و وتم تۆکێیت ؟ وتی :من یونس پێغەمبەرم!!!....

لەوکاتەدا لەخەوەکەم بەئاگاهاتم باوەڕ بکەن لەژیانمدا ئەم ئایەتەم نەبیستبوو زۆر بەجوانیی و ڕەوانی لەبەرم کرد، لەدوای خەوەکەم پاسەوانانی بەندیخانە هاتن و منیان بەرەوە دادگا بردەوە و ، منیش بەدەم ڕێگاوە هەر ئەو نزایەم دووبارە دەکردەوە کە لەخەوەکەدا فێری بووم، منیان گەیاندە ژووی دادگا بەلام ئەمجارە دادوەرەکەی پێشووتر نەبوو کەبڕیاری لەسێدارەدانی بەسەردا سەپاندم، دڵم زۆر خۆش بوو ...دادوەر چرپاندی بەگوێما کەتۆ لەم جۆرە تۆمەتانە بەرییت و بڕیاردرا ئازاد بکرێیت !!!!!...

باوەڕم نەدەکرد لەبەرخۆمەوە ئەمووت : دوای بڕیاری لەسێدارەدان چۆن ئازاد دەکرێم؟ ئەگەر هەرنا ڕەنگە بەشەم بەند کردن بێت هەتاهەتایی یاخود دە پانزە ساڵێك .... بەهەرحاڵ ئازاد کرام و ڕەوانەی یەکەی سەربازییەکەی جارانم کرامەوە کە جێم هێشتبوو بەرلەوەی ببم بە پێشمەرگە، ئەفسەری یەکەی سەربازییەکە وتی : چۆن ئازاد کراویت ؟ ئەوەندەی لام ڕوون بێت ڕەنگە بەهەڵە ئازاد کرابیت و وا بەباش ئەزانم خۆت دەرباز بکەیت و رابکەیت و چونکە جارێکی تر دەستگیرت ئەکەنەوە، لێرەوەش جارێکی تر خوای گەورە بەهانام هاتەوە و ئەفسەرەکە منی دەرباز کردو تاوەکو سلێمانی نەوەستام...

هەربۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت ] وكذلك ننجي المؤمنين [ کەواتە باوەڕدارانیش بێبەش نین لە یارمەتی خوای گەورە، بەومەرجەی باوەڕت بە گەورەیی وڕەحمی خوای گەورە هەبێت و بزانیت کەلەهەموو ناخۆشیەك خوای گەورە هاودەمتە و بەهانات دێت و فریات ئەکەوێت.

لێرەدا حەزرەتی یونس زۆر نەخۆشە و سێ ڕۆژە نانی نەخواردووە و هەموو پێستەی هەڵوەریوە و گۆشت بە لەشیەوە دیارە، بە فەرمانی خودا دارێك شــــــین دەبێت ) شــجرة من يقطين ( ئەم دارە سیفەتێکی هەیە گەڵاکانی

پان و درێژن هەم گەڵاکەی ئەخوورێت هەمیش میوەکەی ، و بۆنێکی زۆر خۆشیشی هەیە و سیفەتێکی گرنگیشی هەیە بە هیچ شێوەیەك مێش و مەگەز نزیکی ناکەوێتەوە ، لە هەندێ ریوایەتدا هاتووە ئاسکێکی شیردەر دێتە نزیك دەمیەوە و شیر دەخاتە دەمی حەزرەتی یونس سەلامی خودای لەسەربێت . لە هەندێ ریوایەتیش هاتووە کە کاتێ دارەکە وشك ئەبێت حەزرەتی یونس دەگریێت و خودا وەحی بۆ دەنێرێت و پێی دەفەرموێت : بۆ وشك بوونی دارێك دەگریت کەچی بۆ زیاتر لە سەد هەزار کەس نەگریایت ؟دواتر بەرە بەرە برینەکانی چاك بوونەوە و بۆلای گەلەکەی گەڕایەوە و هەرهەموویان بەرەو رووی هاتن و تۆبەیان کرد کە چیتر تاوان و گوناح و شیرك نەکەن خودای گەورەش فەرموویەتی ] فلولا ان کان من المسبحين للبيس في بطنه الى يوم يبعثون [ بەو واتایەی ئەگەرتەسبیحاتی منی نەکردایا ئەوانا رۆژی قیامەت لە سکی نەهەنگەکە دەمایەوە و رزگارم نەدەکرد، بەلام بابزانین کەبۆچی خوای گەورە سزای پێغەمبەرانی تری نەداوە وەکو بەرامبەر حەزرەتی یونس ئە نجامیداو لەهەندێك پێغەمبەری تر لێبووردنی کردووە و بەتاقیکردنەوەی قورس وسەخت وەکو پێغەمبەر یونس سزای نەدان؟

چونکە پێغەمبەر یونس سەلامی خوای گەورە لێبێت بەرامبەر بەگەلەکەی ئۆقرەی نەبوو و ئارامی نەگرت بۆیە ئەم کارەساتە رووی تێکرد، سەبرێکی وای نەبوو وەکو حەزرەتی نوح هەزار ساڵ بەرامبە بەگەلەکەی بوەستێت، یاخود وەکو حەزرەتی موسا بەدرێژایی تەمەنی رووبەڕووی گەورەترین ستەمکاربۆوە و بەهەمان شێوەش حەزرەتی ئیبراهیم رێگای چەندین شار و وڵاتی بڕی تا ئەم ئایینەی بەخەڵکی گەیاند، ئەم بەسەرهاتە واقیعییەی حەزرەتی یونس ئامۆژگارییێکی مەزنی خودای گەورەیە بۆ هەموولایەك و بۆ هەموو تاکێکی ئەم سەرزەویە وئەم رۆژگارە، ئەگەر کەسێکی نزیکت نوێژناکات و گوێ بۆ فەرمانەکانی پێغەمبەری پێشەوا ناگرێت، تۆ ئامۆژگاری بکە و بەبەردەوام لەگەڵیدابە، یاخود کچێك سەرپۆش ناکات تۆ بەردەوام ئامۆژگاری بکە و پێی ڕابگەیەنە وپێی بڵێ کە سەردا پۆشین حەیایەو رەوشتە، هەروەها موسڵمانان نابێت سیلەی رەحم بپچڕێنن و هاتووچۆی خزمانیان نەکەن و بەردەوامیش دەبێ ئارامگر و سەبر گربین بەرامبەر هەر رووداو وپێشهاتێك، رەنگە کەتۆ ئامۆژگاری خزمێك یاخود هاوڕێیەکت دەکەیت ئەوهاوڕێ و خزمەت گاڵتەت پێبکات و پێت بڵێ وازلەم شتانە بهێنە و وەرە سەیری ئەم گرتە سێکسییە بکە...

تۆ بەم کارەی ئەو قەڵس و دڵگران مەبە و دەسبەرداری مەبە، و زیاتر ئامۆژگاری بکە و پەیوەندیی لەگەڵ مە پچڕێنە ئەگەر هەربەردەوام بوو نزای خێر و هیدایەتی لەلایەن خوای گەورەوە بۆبکەو خەمخۆری بە، و نەرم ونیان بە لەگەڵی و دیاریی بۆ بکرە و لەگەڵی گوفتار شیرین و نەرم ونیان و بەزەیی بە، بەڵکو بەهۆی ئەو نەرم ونیانی و خەمخۆرییەی تۆوە خودا هیدایەتی بدات و لێی خۆش ببێت، ئەگەر وابیت تۆ باشترین قودوە و پێشەنگیی ئەم رۆژگارەیت.

هەربۆیە خودا ئامۆژگاری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەکات و پێی دەفەرموێت) فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُنْ كَصَاحِبِ الْحُوتِ إِذْ نَادَى وَهُوَ مَكْظُومٌ (48) لَوْلَا أَنْ تَدَارَكَهُ نِعْمَةٌ مِنْ رَبِّهِ لَنُبِذَ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ (49) فَاجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَجَعَلَهُ مِنَ الصَّالِحِينَ (50) القلم.

وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ (139) إِذْ أَبَقَ إِلَى الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ (140) فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ الْمُدْحَضِينَ (141) فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ (142) فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ (143) لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ (144) فَنَبَذْنَاهُ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ سَقِيمٌ (145) وَأَنْبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِنْ يَقْطِينٍ (146) وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَى مِئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ .(147)

الصافات...

*　　　*　　　*　　　*

**پێغەمبەر یوسف سەلامی خوای لەسەربێت:**

إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ (4) قَالَ يَا بُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُؤْيَاكَ عَلَى إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا لَكَ كَيْدًا إِنَّ الشَّيْطَانَ لِلْإِنْسَانِ عَدُوٌّ مُبِينٌ (5) وَكَذَلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِنْ تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَعَلَى آلِ يَعْقُوبَ كَمَا أَتَمَّهَا عَلَى أَبَوَيْكَ مِنْ قَبْلُ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (6) لَقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِ آيَاتٌ لِلسَّائِلِينَ (7) إِذْ قَالُوا لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَى أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ (8) اقْتُلُوا يُوسُفَ أَوِ اطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا مِنْ بَعْدِهِ قَوْمًا صَالِحِينَ .(9) يوسف ..

زۆربەی زانایان وتویانە :بۆئەوەی گەنجان دووچاری داوێن پیسی و زیناو گوناح نەبن باچاو لەحەزرەتی یوسف بکەن سەلامی خودای گەورەی لەسەربێت، با سورەتی یوسف و چیرۆکی بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە بخوێننەوە کەچۆن خۆی لەگوناح و تاوان پاراست و بەسەر شەیتانی لەعین زاڵ بوو.

خودای گەورە مرۆڤەکان جۆرەها شێوە تاقی دەکاتەوە وەکو ماڵ و سامان و سوڵتە و پارە و پول و جنسە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : دەترسم ئوممەتەکەم بەهۆی دووشت بەهیلاکەت بچن کەئەوانیش ماڵ و سامان و سێکسە، بەوودووشتە مرۆڤ بەهەلاکەت دەچێت و خودای گەورەی بیردەچێت .

ئەوەی ئەمڕۆ سەرانسەری دنیای گرفتار کردووە و وڵاتانی ئەوروپای خستۆتە گرفتارییەوە نەخۆشی ئایدزە کە تائێستا نەیانتوانیوە چارەسەرێك بۆ ئەو نەخۆشییە کوشندەیە بدۆزنەوە، سەدان ملیۆن دۆلار بۆ دۆزینەوەی دەرمان و چارەسەر بۆ ئەم نەخۆشییە خەرج دەکرێت کەچی چارەسەرییان دەست ناکەوێ، هۆکاری ئەم نەخۆشییەش سەرهەڵدانی بەرەڵلایی و رەواجدانە بەسێکسی بێ شەرعیی، هەزاران کەس لە ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا و رۆژاوا بەدەست بەدڕەوشتی و زیادەڕۆیی لەسێکس و سێکس بازان دەناڵێنن، و نەیانتوانیوە سنووورێکی بۆدابنێن و بەربەستێك لەبەردەم ئەو کارە بێ شەرعیی و سەرپێچییە دابنێن و قەدەغەی بکەن، تەنانەت بەرپرسانی دۆسیەی ئایدز لەنەتەوە یەکگرتووەکان بێ هیوایی خۆیان لەونەخۆشییە کوشندەیە دەربڕیوەو رایانگەیاندووە تاوەکو چارەسەر بۆ شەش نەخۆشێك دەدۆزنەوە لەوولاترەوە زیاتر لەسەدکەسێك دووچاری ئایدزدەبنەوە، چارەسەرییەکە تەنیا لەوەدایە کە سێکس بەحەلاڵی ولەنێوان ژن و پیاوی شەرعیی ئەنجام بدرێت نەوەك هەرکەسەو بەئارەزووی خۆی وەکو گیانەوەر لەگەڵ کەسانی بێگانە ئەنجامی بدات.

بەلاّم وەرە و سەیری بەرنامە و شەرعیی ئەم ئیسلامە پڕفەڕە بکە کە چەندە یاساو رێسایەکی جوانی هەیە، چەندە بەرنامەیەکی جوان و رێك وپێکی بۆ پێکهێنانی خێزان داناوەو نایەڵێت شیرازەی خێزان بپچڕێت، کەچی لەبەرامبەردا لەوڵاتانی ئەوروپی و ئەفریقی بەهۆی نەمانی شیرازەی خێزان و سێکس بازی ئەم نەخۆشی ئایدزە حەوت ملیۆن منداڵی گرتۆتەوە و بەدەست ئەونەخۆشییە کوشندەیە دەناڵێنن، ئەمە جگەلەوەی دەملیۆن مناڵ بێ دایك و باوك ماونەتەوە بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە .هەروەك پێشبینی تەواو کراوە کە لەساڵی 2015 ی زایینی

ژمارەی قوربانیانی ئەو نەخۆشیە دەگاتە 250 ملیۆن کەس.

ڕووپەڕەو مانشێتی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان ببینەو بیخوێنەوە کەدەیان کەس بەهۆی ئەوکارە جنسیەوە دەبنە قوربانی و دەکوژرێن، یاخود خۆیان دەکوژن.
وەرە سەیری شەرع وپاسای وڵاتە زلهێزەکان بکە بەتەنهالەئەمریکا لەماوەی ساڵێکدا لەساڵی 2007 دوملیۆن مناڵ لەڕێی زیناو سێکسی بێ شەرعیی لەدایکبوون ئەمە جگەلەوەی ڕۆژانە چەندین مناڵ لەباردەبرێت.
باسکردنی ژیانی پێغەمبەران وێستگەیەکە بۆ بەخۆداچوونەوەی ئێمە و زیندووکردنەوەی بیروباوەڕمان و زیاتر سووربوونمان لەسەر ئایینەکەمان و بۆئەوەیە ئێستاو دوارۆژمان دیار و ڕوون بێت لەعیبادەت و پەرستشەکان بگرە تاوەکو کار و کاسبی و بازرگانی، بۆیە باسی رابردوو ئەکەین بۆئەوەی دنیا هەڵمان نەفریوێنێت و هەردەم ئەو پێغەمبەرانەمان لەیاد و لەبەرچاو بێت کەچەندە ملکەچی بڕیار و ڕاسپاردەکانی خوای گەورەبوون و چەندە خەمخۆری گەلەکانیان بوون، حەیف و مخابن بۆ کەسێك لەژیانی ئەو پێغەمبەرانە غافڵە و بێ خەبەرە، چونکە ئەوان قودوە و پێشەنگن، لەخۆت پرسیاربکە بۆچی شوێنی ئەوان نەگرم و بۆچی شەوورۆژ بەدوای کارو کردەوەی خراپەدا بگەڕێم و عەرەق بخۆمەوە و داوێن پیسی و کاری ناشەرعیی بکەم و هەتاکەی ڕوولەوکارەخراپانەبکەم وبۆچی تەوبە و ئیستغفارنەکەم و نەگەڕێمەوە بۆلای خوای گەورە؟.
بابێین ژیانی پاکترین و داوێن پاکترین گەنجی سەرزەوی بخوێنینەوە ئەو گەنجەی لەپاکیی و ڕاستگۆییدا لەلوتکەدا بووە، گەنجێکی ژیر و زۆر جوان گەنجێکی لەخواترس و باوەڕدار ئەو گەنجەی هەمووکات لەخوا ترساوە و لای ڕوون بووە کەخودا بەبەردەوام لەگەڵیدایەو چاودێرە بەسەرییەوە، ئەویش حەزرەتی یوسفی کوڕی حەزرەتی یەعقوبە سەلامی خودای گەورەیان لەسەربێت، حەزرەتی یوسف قوتابخانەیەکە بۆ پەروەردە و دروستکردنی گەنج، بەڵام چ گەنجێك ؟ گەنجی لەخواترس و داوێن پاك و بەڕەوشت و بەئیمان ولەخواترس، گەنجێك سەرتاپای تەمەنی لە منداڵییەوە تاوەکو تافی لاوێتی و دوای چەشتنی ناسۆری و زەحمەتییەکانی بەندیخانەبێت و دواتر پرۆژەکەی پێشەنگی و سەرکەوتوویی بێت حەزرەتی یوسفە سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت، هیچ پێغەمبەرێکی تر جگە لەحەزرەتی یوسف ئەم تاقیکردنەوە دوور و درێژەی نەبینیوە، کەنیوەی تەمەنی لە ئەزیەت و ئازار و دوور لەسۆزی باوك و کەس وکاری بەسەربەرێت، ئەمە جگە لەتاقیکردنەوەی ئەم پێغەمبەرە بە ئافرەتێك .شارەزابوون و خۆئارایشتدان بە ڕەوشتی حەزرەتی یوسف سەرکەوتنی خێزان و تێکنەچوونی شیرازەی خێزانە هەروەها سەرکەوتنی گەنجە بەسەر شەهوات و داوێن پیسی، ئەگەر ژیانی ئەم کەڵە پێغەمبەرە بخوێنیتەوە ئەوا دەزانی کە پێکهێنانی خێزانێکی شەرعیی چەندە بەرز و پیرۆز و گەورەیە لەلای خوای گەورە و میهرەبانەوە، سەیری ژیانی ئەوروپییەکان بکە چەندە پەشۆکاون بەدەست نەمان و ڕووخانی شیرازەی خێزان، چەندە خەمۆکن بەرامبەر بە کاری داوێن پیسی، کەسێك نازانێت دایك و خوشك و براو خاڵ و مام و پوور و ئامۆزاچییە ...نازانێ ژیانی بەسەر چییەوە بەندە و بۆچی هاتۆتە ئەم ژیانە وئەرکی سەرشانی چییە لەم جیهانە؟ بەڵام حەزرەتی یوسف دەستی گەنجەکان دەگرێت و پێیان دەڵێت :ئاگاداری داوێن پیسی بن و نزیکی مەکەون، پێمان دەڵێت : وەکو ئەو بژین و داوێن پاك بین و لەخواترس بین کەبەوهۆیەوە بەرزترین پلە و پایەمان دەست دەکەوێت.

ڕۆژێك لەرۆژان یارانی پێغەمبەر لەلای حەزرەت دانیشتبوون و داوای بەسەرهاتێکی گەورە و گرنگی لێدەکەن،

ئالەوكاتەدا خواى گەورە وەحيى بۆ پێغەمبەرەكەى ئەنێرێت وپێى ئەفەرموێت ] نحن نقصّ عليك احسن القصص بما اوحينـــا اليك هذا القران [ بۆچى خواى گـەورە بە پێغەمبـەرى ڕاگەيانـدووە باشـترين چـيرۆك؟ چـونكە حەزرەتى يوسف سەلامى خواى گەورەى لەسەربێت داوێن پاك و گەنجێكى ئاراگر و بەسەربووە ودوايى بەباوكى شاد بۆتەوە و براكانيشى پەشيمانى رووى تێكردوون و گەڕاونەتەوە بۆلاى خواى گەورە، و هەروەها زولەيخاى خێزانـى عەزيزى ميسر تەوبە دەكات و پەشيمان دەبێتەوە، و مێردەكەيشى لەسەرتەختى وەزيرايەتى لائەدرێت و حـەزرەتى يوسف لەشوێنى دائەنرێت و پاشاكەش بەهۆى داوێن پاكێتى حەزرەتى يوسف تەوبە دەكـات و بـاوەڕ دەهێنێـت، و براكانى يوسف دواتر پەشيمان دەبنەوە و كڕنووش بۆ حەزرەتى يوسف دەبەن و چيرۆكەكە پەند و عيبرەتى ئێجگار زۆرى تێدايە وەكو پاراستنى داوێن پاكيى و دووركەوتنەوە لە كارى بەد ڕەوشتى و سەبر و ئارامى حەزرەتى يوسف لەزيندان و بەڕێوەبردنى ولآت لەرووى قات و قڕى و نەبوونى وگەشە پێدانى ولآت لەرووى ئابوورى و بازرگانييەوە، هەروەها چۆنيەتى مامەڵەى برا لەگەڵ براكەى هەتاوەكو خرا پيش بێـت بەرامبـەرى، و تۆڵـە نەسـەندنەوە لـە و تاوانەى كەبەرامبەرى ئەنجام دراوەو لەرابردووغەدرى لێكراوە، بۆيە بە ) أحسن القصص ( ناونراوە لەلاى خـواى گەورەوە.

حەزرەتى يوسف تەمەنى لەنێوان دە ساڵان تادوانزەساڵانەوەيە و خەون ئەبينێت كە يانزە ئەستێرە و خۆر و مـانگ كڕنووشى بۆ ئەبەن ] إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ[ ، حەزرەتى يەعقوب لەوكاتەدا پێغەمبەرە و ماناى خەونەكە چاك دەزانێت، بەلآم لەيوسفى ئەشـارێتەوە و ماناكـەى نادركێنێت، تەنها پێى فەرموو ئەم خەونە بۆ براكانت مەگێڕەوە.

] قَالَ يَا بُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُؤْيَاكَ عَلَى إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا لَكَ كَيْدًا إِنَّ الشَّيْطَانَ لِلْإِنْسَانِ عَدُوٌّ مُبِينٌ [ ئاگادارى دەكاتەوە لەوەى خەونەكە بـۆ براكـانى بگێڕێتـەوە، چـونكەدەيزانى كوڕەكـانى تـرى وەكـو يوسـف چـاك نـين و حـەزيان بەدنياوەيە.لێرەوە بزانە خۆهەڵكێشان بەباوك و باپيرەوە دادى كەسێك نادات هەرچەندە شێخ و مەلا و سەيد بێت .

ئەوەتا كوڕى پێغەمبەرە و لاى خواى گەورە نرخێكى ئەوتۆوى نييە، كوڕى پێغەمبەربووە غەرقى زريـانى ئاوولافـاو بووە خێزانى پێغەمبەر بووە بەهـەمان شـێوە، بۆيـە لێـرەوە كـارو كـردەوەى چـاك بـەهاناى خـەڵك دێـت نـەك خۆهەڵكێشان بەباوك و باپير و عەشيرەت و تەريقەت.

براكانى حەزرەتى يوسف لەڕادەبەدەر بەخيلن و حەزرەتى يەعقوبى باوكيـشيان بـەو بەخيليـەى كـە لەناخيانـدا چەكەرەى كردووە ئاگادارە، حەزرەتى يوسف و بنيامين براى يەكتربوون و لەدايكێك بوون و براكانى ترى لەدايكێكى ترن، زڕبراكانى يوسف دەكەونە پلان دانان و پرسيار لەيەكتر ئەكەن كەبۆچى ئەم باوكەى ئێمـە يوسـفى لەئێمـە خۆشتر دەوێت؟ و بەدواى پلان دەگەڕێن و شەيتانى لەعينيش بـير و خـەياڵيان دەخاتـە مێـشكەوەوزياتر فريويـان ئەدات، ئەمە لەلايەك، بائاوڕێك لەم ڕۆژگارەى ئەمرۆمان بدەينەوە كەچەندان برا هەن و لەگەڵ يەكتر نـاكۆكن و قسە لەگەڵ يەكترى ناكەن، كە هۆكارەكەى بەهۆى سەروەت و سـامانى دنياوەيـە يـاخود بـەهۆى قسەوقـسەڵۆكى ژنەكانيانەوەيە.

دواى ئەوەى براكانى يوسف باوكيان رازى ئەكەن كە حـەزرەتى يوسـف لەگـەڵ خۆيـان ببەنـە دەرەوەى شـارو زۆر داوالەباوكيان دەكەن كەمۆڵەتيان پێبدات تاحەزرەتى يوسف لەگەڵ خۆيان ببەن، سەرەتا باوكيـان رازى نابێـت و دەفەرموێت دەترسم لەئێوەدابڕێت و گورگ بيخوات.

ئەوانيش بەباوكيان دەڵێن چۆن شتى وادەبێ و چۆن گورگ دەيخوات كـە ئێمـە لەگەڵيـداين !!...اقْتُلُوا يُوسُفَ أَوِ

اطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا مِنْ بَعْدِهِ قَوْمًا صَالِحِينَ (9) قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ لَا تَقْتُلُوا يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَابَةِ الْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ السَّيَّارَةِ إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ (10) قَالُوا يَا أَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَنَّا عَلَى يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُ لَنَاصِحُونَ (11) أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ (12) قَالَ إِنِّي لَيَحْزُنُنِي أَنْ تَذْهَبُوا بِهِ وَأَخَافُ أَنْ يَأْكُلَهُ الذِّئْبُ وَأَنْتُمْ عَنْهُ غَافِلُونَ (13) قَالُوا لَئِنْ أَكَلَهُ الذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّا إِذًا لَخَاسِرُونَ ... حەزرەتی یەعقوب لەڕادەبەدەر یوسفی خۆشویستوە و بەردەوام چاودێری دەکرد و دەیزانی رۆژێکی رووناك چاوەڕێی یوسفی نازدار دەکات.

بەهەرحاڵ باوکیان رازی دەبێت و براکانی "یوسف لەگەڵ خۆیان دەبەن و لەڕێگادا هەندێك لەبراکانی دەڵێن بابیکوژین و هەندێکیشیان دەڵێن نەخێر فڕێیدەدەنە ناوبیرێکەوە و دواتر تەوبە دەکەین و روو لەچاکە دەکەین، ئەمە بیرۆکەیەکی هەڵەیە، چونکە پێغەمبەری پێشەوا فەرموویەتی زۆربەی ئەوکەسانەی لەدۆزەخدا بینیم لەوکەسانە بوون کەلەدنیا گوناهیان ئەکردو دەیانووت :دواتر تەوبە دەکەین و دەگەڕێینەوە، وەکو ئەم رۆژگارە پەنا دەباتە بەر داوێن پیسی و عەرەق خواردنەوە و خواردنی ماڵی خەڵك بەحەرامی و دزی و درۆکردن و دەیەها گوناهی تر ....کە ئامۆژگاری دەکەیت دەڵێ جاریَ زووە دواتر تەوبە دەکەم ..!!! پاشان براکانی حەزرەتی یوسف کراسەکەی بەری دادەکەنن و بەخوێنی ئاژەڵ سووری ئەکەن و دێنەوە پیشانی باوکیان ئەدەن و دەڵێن گورگ خواردی، حەزرەتی یوسف بەتەنها و لەبیابانێك و لەناو بیرێکی قوڵی پڕ لە دووپشك و ماردایە و هاوار دەکات ئەی براکانم تەنها جلەکانم بدەنەوە، ناڵێت دەرم بهێنن بەڵکو جلەکانی دەوێتەوە، چەندە جوانە شەرم وحەیا و خۆدا پۆشین، ئەو نایەوێت بێ جل بێت و گەرەکیەتی پۆشتە بێت، جل و بەرگیش کاریگەریی هەیە لەسەر کەسایەتی مرۆڤ، چەندە جل و بەرگی شەرعیت لەبەربێت ئەوەندە هەست بە گەورەیی و کەسایەتییەکەی خۆت ئەکەیت، دواتر کاتی ئێوارە براکانی بەگریان رۆڕۆوە دەگەنەوە ماڵەوە بەلام چ گریانێك ؟ گریانێکی ڕاست بۆ باوکیان و بۆ تاوانە خراپەکەیان .... بەباوکیان ووت :ئێمە یاریمان دەکرد و یوسف لای جلەکانمانەوە دانیشتبوو گورگ هێرشی بۆبرد و ڕفاندی و ئەمەش جلەکانیەتی، حەزرەتی یەعقوب بڕوا بەکوڕەکانی ناکات و دەزانێت فێڵێکە و کردوویانە و لەهەمان کاتیش دەزانێت کە وئەمە بڕیارێکی ئیلاهییە و دوای ئەو رووداوەش خێرێك دێتە کایەوە، و بەو شەوە سواری ئەسپەکەی دەبێت و بەرەو بیابان دەڕوات یوسف نابینێتەوە و دەگەڕێتەوە و بەردەوام دەگری تائەوکاتەی چاوەکانی پڕدەبن لەئاوی سپی، بەلام هەرسەبر و ئارامی دەبێت و ناشوکری ناکات. لەڕیوایەتێکدا هاتووە کە حەزرەتی یەعقوب سەیری جلەکەی حەزرەتی یوسف ئەکات و دەبینێت نەدڕاوە، و دەڵێت : ئەو گورگە چەندە بەزەیی بووە و یوسفی ئەزیەت نەداوە !!!..خۆ باش ئەزانێت کە راست نییە و گورگ نەیخواردووە، دوای سێ ڕۆژ مانەوە لەناو بیری تەنگ و قوڵ و تاریکایی بەقودرەتی خوای گەورە کاروانێك ڕێگا ون دەکەن وڕوولەبیابان ئەکەن و لادەدەنەلای ئەوبیرەی کەحەزرەتی یوسفی تێدایە، یەکێك لەکاروانچییەکان سەتلێك هەڵئەداتەناوبیرەکەوە تاوەکو ئاو دەربهێنێت هەست دەکات زۆر قورسە و بۆی نایەتە دەرەوە و جارێکی تر هەوڵدەدات، لەگەڵ هاتنە دەرەوەی سەتڵەکە حەزرەتی یوسف لەبیرەکە دێتەدەرەوە و لەجوانی شێوە و رووخساری یوسفی منداڵ سەری سوڕدەمێنێت، دەری دەهێنن و دەیشارنەوە لە کاروانەکە، چونکە دۆزینەوەی منالێکی لەوشێوەیە مانای وابوو باشترین شتی دەستکەوتووە کەدەبێت بە کۆیلە و بەندەی ئەو کەسە، هەرچەند لەناو ناخۆشیدا بیت و تەنگ و چەڵمە یەخەت بگرێت دەرگای ئۆێد و هیوا لەخۆت دامەخە، کەواتە ئەوکەسەی حەزرەتی یوسف لەبیری تەنگ و تاریك رزگار ئەکات هەرئەویشە تۆ لەتاریکایی و گرفتەکان رزگارئەکات و بەومەرجەی تۆش متمانەت بەخوای گەورە لەدەست نەدەیت و بەردەوام

لەوبیر و خەیاڵە دابیت کەتەنها کەسێك بە هانات بێت و رزگارت بکات ئەوا خوای گـەورە و میهرەبانـە ...وَجَاءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُوا وَارِدَهُمْ فَأَدْلَى دَلْوَهُ قَالَ يَا بُشْرَى هَذَا غُلَامٌ وَأَسَرُّوهُ بِضَاعَةً وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَعْمَلُونَ (19) وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا فِيهِ مِنَ الزَّاهِدِينَ (20) وَقَالَ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِنْ مِصْرَ لِامْرَأَتِهِ أَكْرِمِي مَثْوَاهُ عَسَى أَنْ يَنْفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُ مِنْ تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ.بە پارەیەکی زۆرکەم فرۆشرا چونکە مناڵە و تواناى کارکردنی نییە، عەزیزی میسر دەیکڕێتەوە کەئەو عەزیزە وەزیری خەزێنەی میسرە و، فەرمان بەژنەکەی دەکات کەبەجوانترین شێوە پەروەردەی بکات و چاودێری بکات، ئاگاتان لێبێت هەندێ کەس ئەڵێن : چیم کردووە خوا وام بەسەردەهێنێت!!!.. ؟؟؟ ئەم پێغەمبەرانە چییان کردووە ئەو هەموو ناخۆشیی و نارەحەتیەیان بەسەردێت ؟؟ وَقَالَ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِنْ مِصْرَ لِامْرَأَتِهِ أَكْرِمِي مَثْوَاهُ عَسَى أَنْ يَنْفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُ مِنْ تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ... ئێمە لەم بەسەرهاتە فێری ئەوەدەبین کەخودا پشتیوانی هەمووکەسێکە و خۆی چاودێرییان دەکات و نایەڵێت لەناوبچن، سەیری یوسف بکە سێ شەو لەناوبیرێکی تەنگ و تاریك و قوڵدا مایەوە، بەڵام کێ پاراستی ؟ بێگومان خودای گەورە خۆی پاراستی و چاودێریکرد، ئەگەر لەم رۆژگارەش ئەوانەی هێرش دەکەنە سەرئیسلام و دەیانەوێت لەکەدار وناشیرینی بکەن و گەنجان لەئیسلامەتی ساردبکەنەوە و بیانەوێت بەئەشکەنجەو ئازاردان بەرەو بەدڕەوشتی وکاری بێ شەرعییان بەرن، ئەوا خەیاڵیان خاوە و خودا خۆی چاودێریی و پشتیوانی ئەو گەنجانە ئەکات، ئەگەر گەنجێك دووچاری ئەزیەتی لەوشێوەیەبوو باپەلەنەکات و ئارامگر بێت چونکە خودای گەورە بەسەر هەمووشتێکەوە زاڵە و خۆیشی پشتیوانی ئەبێت.

هەمووومان ئەم بەسەرهاتەی حەزرەتی یوسفمان گوێ لێبووەو بیستوومانە بەڵام گرنگ ئەوەیە کە یوسفی نەوجەوان لەلایەن کاروانێکەوە کەبەلای بیرەکە رەت دەبن و دەریدەهێنن و بەرەو ولاَتی میسر ئەیبەن و تادەگەیەنرێتەلای عەزیزی میسر وتائەوکاتەی تەمەنی دەگاتە تافی لاوێتی کەچەندە گەنجێکی جوان و دەروشاوە بووە ) وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ( ، لێرەوە دەست پێدەکەین کەلەکۆشکی عەزیزی میسرە و بەسەرهاتەکانی ئەم پێغەمبەرە دەخوێنینەوە و پێغەمبەریش ئازیزیش فەرموویەتی ) نیوەی جوانیی دنیا بە حەزرەتی یوسف دراوە. (

زولەیخا خێزانی عەزیزی میسربووکە عەزیزی میسر وەزیری خەزێنەی ئەوکاتەی ولاَتی میسر بووە، زولەیخاتابڵێی ژنێکی زیتەڵ و زانا بووە لە داڕشتنی پلان بەرامبەر کەسانی بەرامبەری، ] وراودتە الّذي في بيتهـــا عن نفسە وغلقت الابواب وقالت هيت لـك [ سەیری فێڵ و پلانی ئەم ئافرەتە بکە بەرامبەر بەحەزرەتی یوسف هێواش هێواش و بەرەبەرە دەیەوێت حەزرەتی یوسف هەڵبخەڵەتێنێ و لەخشتەی بەرێت ئەوەندە بەنەرم ونیانی بەواتای دایك و خوشکایەتی لەگەڵ یوسف دێتەگۆبەڵکو بەو ئومێدەی رۆژێك لەرۆژان هەڵیبەخەڵەتێنێ و دووچاری کاری ناشەرعیی بکات، تاوای لێهات بەبێ ئاگایی حەزرەتی یوسف هەموو دەرگاو پەنجەرەکانی کۆشکی لەحەزرەتی یوسف داخست.

بەڵام حەزرەتی یوسفی گەنج ولەخواترس ئاگای بەم پلانەی زولەیخا نییە و نازانێت چی لەهەگبەدایەو نازانێت دەیەوێت بەرەو گوناهو ناشەرعیی دەبات، زولەیخا لە حەزرەتی یوسف دێتە ژوورەوەوخۆی رازاندۆتەوە و پێی دەڵێت )هیت لك ( خۆتم بۆ ئامادکردووە، خۆی جوان کردووە و لەرادەبەدەر خۆی رازاندبۆوە، و پێی دەڵێت : هەموو شتێکم

رەخساندووە و مەترسە .. حەزرەتی یوسف خودای دێنێتەوە بیرو ] قال معاذالله [لێرەوە حەزرەتی یوسف ئامۆژگاری هەموو گەنجێك دەكات كە هەركاتێك ناشەرعیی و ئافرەتێك ویستی هەڵتبخەڵەتێنێت بڵێن پەنادەگرم بەخواو كاری واناكەم، پاشان حەزرەتی یوسف دەفەرموویت ] انه ربي احسن مثواي [ هەندێك دەڵێن ئەم قسەیەی یوسف بەرامبەرزولەیخا لەگەڵ مێردەكەیەتی كەبەجوانترین شێوە لەناو ماڵەكەی خۆی پەروەردەی كردووە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویت :هەرگەنجێك لەلایەن ئافرەتێكەوە داوای كاری بێ شەرعیی لێبكرێت و ئەویش لەترسی خودا نەیكات، یاخود ئافرەتێك لەلایەن پیاوێكەوە داوای ئەوكارەی لێبكرێت و لەترسی خوا نەیكات، ئەوا ئەو دووجۆرە كەسە لەرۆژی قیامەتتدا لەژێر سێبەری عەرشی خوادان و داوەتی تایبەتی خودای گەورەن....

ئەی گەنجی بڕوادار یوسف ئاسا هەڵس و كەوت بكە، دەسبەرداری نامە گۆڕینەوەوتەلەفۆن كردن و دڵداری بە لەگەڵ كچی نامەحرەم و واز لەو كارە بێ شەرعیی و خووە خراپانە بهێنە، چونكە ئەمانە هەرهەمووی هۆكارێكن بۆ نزیك بوونەوە لەگوناهو ئەنجامدانی كاری ناشەرعیی ، خۆت ببینە چەند گەنج و چەند ئافرەتی خاوەن مێرد و منداڵ بەهۆی ئەم كارانەوە لەناویران وكوژران، كەجگە لەوێران بوون و تێكچوونی شیرازەی خێزان و ئابڕووچوونی بنەماڵەو عەشیرەت هیچی تریان بۆنەمایەوە، ئایا ئەمەیان چاكترە یاخود وەكو حەزرەتی یوسف ؟؟؟ پێویستە لەكاتی سەرهەڵدانی هەركارێكی ناشەرعیی بڵێی پەنا بەخودا دەگرم.

دەی خۆ دەتوانی زۆر بەئاسانی تەركی ئەو جۆرە گوناهانە بكەیت، خۆ دەتوانی ژمارەی مۆبایلەكەت بگۆڕیت و هاتووچۆی ئەوماڵە نەكەیت كەكەسی داوێن پیسی لێیە وەئەگەر هاورێی خراپت هەیە تۆش ئامۆژگاری بكە، ئەگەر وەرینەگرت هاتووچۆی مەكە.

لەوكاتەدا هەریەك لەزولەیخا و حەزرەتی یوسف بەرەو دەرگا ڕایان كرد، زولەیخا بۆئەوە رایكرد تاوەكو یوسف دەرگاكە نەكاتەوەو هەڵنەیەت حەزرەتی یوسفیش بۆئەوەرایكرد بەڵكو لەم كارە ناشەرعییە رزگاری بێت و دەرگاكە بكاتەوە، بوو بە پێشبڕكێ لەنێوان گوناهو مەعسییەت و تەوبە و لەخواترسان، لەئەنجامدا كێیان پێش دەكەوێت كەسی دووەمیان كەتەوبە و لەخواترسانە كە ئەویش حەزرەتی یوسفة عليه الســــــلام، لەبەرئەوەی ) إبن الكريم ...إبن الكريم ... ابن الكريم( ە، ئنجا لەدواوەزولەیخا كراسی یوسف رادەكێشێت و ئەدرێت و نینۆكەكانی لەپشتی ئەچەقێت و برینداری ئەكات و خوێنی لێدێت هەروەكو خوای گەورەدەفەرموویت ] فقدت قميصــــــه من دبر [ ئالەو كاتەدا مێردەكەی زولەیخا دێتە ژوورەوە، كە عەزیزی میسر ئەم دیمەنە دەبینێت سەری سوڕدەمێنێت و زولەیخای خێزانی پێی دەڵێت : پاداشتی ئەو كەسە چییە دەستدرێژی بكاتە سەرخێزانت ؟؟!!!

ئەمجارە بەمێردەكەی دەڵێ : یان ئەبێ سزای بدەی یان ئەبێ بەندی بكەی.

مێردەكەی زولەیخا روو لەحەزرەتی یوسف دەكات و پێی دەڵێت : بۆتۆعەیب نییە كاری وادەكەیت ؟ حەزرەتی یوسفیش دەڵێ : من شتی وام نەكردووە و ژنەكەت دەستدرێژی كردۆتە سەرمن، تەنها عەزیزی میسر لەگەڵ پاسەوانەكەی بەم كارە دەزانن و كەسێكی تر جگەلەمان و لەخوای گەورە كەسی تر ئاگادارنییەو نازانێت.

پاسەوانەكەش بە عەزیزی میسر دەڵێت : گەورەم چۆن ئێمە بزانین كە ئەم گەنجە تاوانبارە و سەیری كراسەكەی بكە ئەگەر لەپێشەوە دڕابێت ئەوا تاوانی یوسفە و ئەگەر لەدواوەش دڕابێت ئەوا تاوانی ژنەكەتە، عەزیزی میسر سەیری كراسی یوسف دەكات و دەبینێت لەدواوە دڕاوە وپشتیشی بەخوێنە و شوێن نینۆكەكانی ژنەكەی پێوەدیارە!!!!...

یەكسەر روو لەژنەكەی دەكات و پێی دەڵێ ] استغفري لذنبكِ [ و پاشان بە حەزرەتی یوسف دەڵێت :ئەم نهێنیە لای

**کەس نەدرکێنی.**

**هەڵوێست وەرنەگرتنی عەزیزی میسر لەو کاتەدا لە بیٚ غیرەتیدابووە، ژنێك بگاتە ئەو ئاستەی ) خیانەت ( لە مێردەکەی بکات خێزان بەرەو سەرشۆڕی ئەچێت وەکو ئەوروپا پیاوان زۆر لایان ئاساییە دایکیان و خوشك و ژنەکانیان و کچیان هەر رۆژەی لەلای یەکێك بێت و رابووێرێت !!!.. تەنانەت لەوڵاتی فەرەنسا واباوە پیاوان رێگە بەژنەکانیان ئەدەن تاوەکو بیست پیاویش ئاساییە لەگەڵ ژنەکانیان و خاوو خێزانیان رابووێرن و پەنا ببەنە بەرکاری ناشەرعیی ... ئەم جۆرە سیفەتانە تەنانەت لەناو ئاژەڵانیشدا نییە و قەبوڵ ناکرێت !!! تەنها بەراز نەبێت، ئەم خووەی بەرازیش بۆ ئەوان گەڕاوەتەوە کەئەمەش حیکمەتی حەرام بوونی گۆشتی بەراز دەردەخات.**

**خاڵێکی گرنگ لەم باسەدا هەیە:**

**ئەو کەسانەی زۆر سەرقاڵن بەکار و کاسبی و بازرگانی و ناپەرژێنە سەر خێزانیان زۆرجار گرفتەکە لەمەوە سەرهەڵدەدات، ئەگەر زولەیخا پیاوەکەی بەبەردەوام لەگەڵی بووایە و ساتەکانی لەگەڵ بەسەر ببردایەتە سەر و خۆشەویستییان بۆ دروست بووایە، بیری لەو کارە نەدەکردەوە، جوانترین خەسڵەتی ئافرەتیش ) حەیا( یە، گەورەترین دەستمایەیەتی و ناکرێت ئافرەتانیش بێدەنگ بن لە ئاست ) ئیهمال ( کردنی پیاوەکانیان بەرامبەریان، بەئاسانیش لێنەگەڕێن پیاوەکانیان بەهۆی سەرقاڵی و گەشتکردن و کار و کاسبی ، خێزانیان لەبیر بکەن ..بەتایبەتی لەرۆژگارێکی وەك ئەمڕۆ کە هۆکاری پەیوەندی وغەریزە جوڵاندن زۆرە و لەبرەودایە.**

**بەسەرهاتێك**

**گەنجێك بەناوی ) موحەممەد ( تابڵێی جوان و ڕێك و پێك لە شاری ) کوفە ( ژیاوە، ئەم کوڕە دایکێکی پیریی هەبووە، و بەردەوام خەریکی کارو کاسبی بووە و بەهۆی پارەی کاسبیەکەی دایکی ژیاندووە، رۆژێك لەرۆژان ژنێك لە کۆڵانێکی کوفە چاوی لێئەبڕێت و بەفێڵی کڕینی باوەشێنەکانی دەیهێنێتە ماڵەوە و خۆی بۆ جوان ئەکات و پێی دەڵێت : لەگەڵم جووت نەبیت هەموو خەڵکیت دەهێنمە سەر و ئابڕووت ئەبەم، لەوکاتەدا ژنەکە لەوپەڕی رازاوەیی و خۆئامادەکردندایە بۆ کاری بیٚ شەرعیی!!!...**

**ئەو گەنجەش دەڵێت : ڕێم بدە بچم بۆ ئاودەست دوایی چیت دەوێت من ئامادەم ... دەچێتە ئاودەستەکەوە و هەموو گیانی خۆی ئەکات بەپیسایی و دێتە دەرەوە و دەچێتە بەردەم ژنەکەوەو، دەڵێت من ئامادەم !!!... ژنەکەش سەری سووڕدەمێنێت و هاوار دەکات و بەپەلە دەری دەکاتە دەرەوەی ماڵەکەی ، دواتر دەگەڕێتەوە ماڵەوە و دایکی دیمەنەکە ئەبینێت سەری سوڕ دەمێنێت کەکوڕەکەی سەرتاپای گیانی لەپیساییدایە !!! دواتر دەچێت خۆی دەشوات و بەسەرهاتەکە بۆ دایکی دەگێڕێتەوە، لەوسا بەدواوە بە ) موحەممەدی بۆنخۆش ( ناوبانگ دەردەکات لەبەرئەوەی بەهەر شوێنێك داچووبایە بۆنێکی ئێجگار خۆش ئەو شوێن و جێگایەی دەگرتەوە!!!....ئافەرین بۆئەو کچەی کە کوڕێك داوای پەیوەندیی دڵداری لێئەکات و ئەو نایکات، ئافەرین بۆئەو کوڕەش زەمینەی بۆ خۆشکراوە بۆکاری ناشەرعیی و خۆی ئەپارێزێت، ئافەرین بۆ بازرگان و کاسبکاران کە ژنێك یەخەی دەگرێت بۆکاری خراپ و ئەو ئەڵێت ) أنيّ أخاف الله ... ( من لەخوا ئەترسم ... نەکەن ئەم دروشمە لەیاد بکەن ...بۆخۆشییێکی چەند ساتێکی کەم ... ناخۆشیەکی درێژخایەن و نەبڕاوە مەکە بەکالاّی بەری خۆت ... گەر تا ئەو ساتەش تووشی هاتووی، ئەوا پەلە بکە و دەرگای تۆبە و گەڕانەوە کراوەیە و پاك و بێگەردانە بژی بۆخۆت.**

پاش ماوەیەك لەم رووداوە دەنگ وباس گەیشتەلای ئافرەتانی نزیك كۆشك و خزمەتكارەكانی خێزانی عەزیزی میسر كە ئەویش زولەیخا بوو كە چۆن دەبێت زولەیخا بەو گەورەییەی خۆیەوە داوای كاری بێ شەرعیی لە گەنجەكەی ناومالەكەیان بكات كەئەویش حەزرەتی یوسفە سەلامی خودای گەورەی لەسەربێت .

دیسان زولەیخا كەوتەوە پلان دارشتن و بە ئافرەتەكانی وت :خۆتان دەتوانن بێن وبەچاوی خۆتانەوە یوسف ببینن، بانگیان ئەكات و هەریەكەوچەقۆیەكیان دەداتە دەستەوە و دەستی خۆیان ئەبرن و بەفێڵ و تەڵەكەیەكی تری زولەیخا دەچنەوەلای یوسف بەڵكو لە زولەیخانزیك ببنەوە، بەلام ئەوان هەریەكە و خۆی بۆ نمایش دەكات و ئەڵێن ئەی یوسف وەرە لەگەڵ ئێمەرابووێرە وئێمە لەزولەیخا جوانتر و جەوانترین، ئەمەش هۆیەكی تر بوو بۆ هەڵخەڵەتاندنی یوسف بۆ ئەوەی زولەیخا بۆ عەزیزی مێردی و هەموو خەڵكەكەی بسەلمێنێت كەیوسف داوای كاری بێ شەرعیی لێكردووە.
هەڵوێستی حەزرەتی یوسف لەوكاتانەدا چۆنە؟ ئەو هەروەكو خۆیەتی و هەر پەنا بەخوا دەگرێت و ] ربی السجن احبّ الی مما یدعوننی الیه[ ، ئەی گەنج سەیری هەڵوێستی ئەم پێغەمبەرە بكە و بەندیخانە هەڵئەبژێرێت لەبری كاری ناشەرعیی و نزیك بوونەوە لەو هەمووئافرەتە كەدانەدانە دەچن بۆلای بەڵكو فریوی بدەن، زولەیخا پێشتر ئەو رووداوەی بۆ ئەو كۆمەڵە ئافرەتە گێرایەوە كە تاوم بۆ برد و پەلامارم دا لەشوێن خۆی نەجولاو هەستی نەبزووا و نزیكم نەكەوتەوە و دەستی بۆنەهێنام.
مێردەكەی زولەیخا بریاری بەندكردنی بەسەر یوسف داسەپاند و دەڵێن لەنێوان سێ ساڵ تاوەكو دە ساڵان ژیانی بەعیبادەت و پەرستش لە بەندیخانە بەسەربرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت ] الانبیاء اشد بلاءا [ حەزرەتی یوسف لەنازو نیعمەت و زۆری و بۆری كۆشكی وەزیر كەچی بەندیخانە هەڵدەبژێرێت، ئەگەر وانەبووایە نەدەبوو بە وەزیری خەزێنەی میسر دوای ئەوەی لە بەندیخانە دەردەچێت ، چونكە كەلە بەندیخانە بووە چەند خەونێكی بۆ كەسانی بەندیخانە گێراوەتەوەو هەقیقەتی خەونەكان هاتنە دی، دووكەس خەون ئەبینن لە دوای راڤە كردنی خەونەكان حەزرەتی یوسف بەیەكێكیان ئەڵێت : تۆ ئەمریت ولەسێدارە ئەدرێیت، بەوەی تریشیان ئەڵێت : تۆ ئازاد ئەكرێیت و لای پاشا كاری خۆت ئەكەیت ...لێرەوە حەزرەتی یوسف داوای لێكرد لەبیری نەكات ولای پاشا ئاماژەی پێبكات ] اذكرني عند ربك [ واتە لای ئەو كەسەی كەكاری لەگەڵ ئەكەیت باسم بكە و ناوم بهێنە ...دواتر لەبیری ئەكات ) فأنساه الشیگان ژكر ربه ( واتە لەبیری كرد لای پاشا ناوی حەزرەتی یوسف بهێنێت ..
هەندێ لەزانایان ئەڵێن : ئەوەش هۆیەكە بۆزیاتر مانەوەی حەزرەتی یوسف لەبەندیخانەكەدا، كە ئەبووایە رزگاربوونی خۆی لەوپیاوە نەبینیایە و بیكاتە هۆكارێك بۆ دەرچوون لە بەندیخانە، بەڵكو تەنها داوای لەخوای گەورە بكردایە چونكە خوای گەورە زۆری پێناخۆشە كە داوای لێنەكەیت....
لێرەوە حەزرەتی یوسف ئەیەوێت ئەوەندە ساڵە بۆچی خراوەتە بەندیخانەوە و هەروەها دەیەوێت بەئاسانی بێ بەرهەم نەبێت و گەرەكیەتی سەرنجی كاربەدەستان و خەڵكی شار بۆپاكیی و بێگەردییەكەی رابكێشێت و بڵێت : دەرەنجامی ستەمكردن، و نادادپەروەریی منی گەیاندۆتە ئێرە ...بۆیە دەفەرمووێت : من دەرناچم تا ئەوەی ئەمەوێت بۆمی بكەن.

پاشای میسر شەوێك لەشەوان خەون دەبینێت بەهۆی خەونەکەیەوە بێزاری و بێتاقەتی رووی تێدەکات و کە گومانی تێدانییە خەونەکەی دێتە جێ و راستی و هەقیقەتی بەدواوەیە ...لەخەوەکەدا ئاماژە بەحەزرەتی یوسف دەکرێت کە لەبەندیخانەدایە و بچۆرە لای و تەنها ئەو راڤەی خەونەکەت ئەزانێت !!!... بۆ پێغەمبەر یوسف دەهێنن لە بەندیخانە ئەویش لەبەراییدا پێیان دەڵێت بە عەزیزی میسر بڵێن کەبۆچی ئەوەندە ساڵە منی بەبێ تاوان بەند کردووە؟

ناوبراو خۆی دەچێتە بەندیخانە و لەگەڵ حەزرەتی یوسف دادەنیشێت و خەونەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، حەزرەتی یوسف پێی دەفەرمووێت :مانای وایە حەوت ساڵ بەبەردەوامی بارانتان بەسەردا ئەبارێت و کشتوکاڵ و بەروبوومی زۆرتان ئەبێت بەڵام دوای ئەو حەوت ساڵە حەوت ساڵی تر دەکەونە نەبوونی و هەژاری.

حەزرەتی یوسف پێی رادەگەیەنێت کەلەسەرتان پێویستە ئەو گەنمەی کە بەهۆی بارانەکەوە دەستتان دەکەوێت، هەڵیبگرن تادوای ئەو حەوت ساڵە لەحەوت ساڵە بێ بارناویی و وشکاییەکە بۆخۆتان بەکاری بهێنن تاوەکو رووبەرووی گرانی و قات و قڕی نەبنەوە، بزانە حەزرەتی یوسف سەلامی خودای گەورەی لەسەربێت چەندە حەکیم و زاناو کەسێکی ئابووری ناسە، بێگومان سایلۆی ئەم سەردەمە و سەردەمەکانی پێشووتریش کە گەنمی تێدا عەمباردەکرێت هەمووی بۆبیرۆکەکانی حەزرەتی یوسف دەگەڕێتەوە کە ئاگاداری عەزیزی میسری کردەوە، حەزرەتی یوسف ئاگاداری دەکاتەوە کە گەنمەکە بەپووش و پەلاشەکەیەوە هەڵیبگرن و نارزێت، لێرەوەزانیمان کەبیرۆکەی دامەزراندنی سایلۆ بۆ حەزرەتی یوسف دەگەڕێتەوە بەڵام باباشیش بزانین کە هەروڵاتێك سایلۆی نەبێت وڵاتێکی وێران و بێ بەرەکەت و سەرنەکەوتووە.

پاشای میسر لێرەوە رووڵەکاربەدەستانی بەندیخانە ئەکات و ئەپرسێت ئەم پیاوە بۆچی بەبێ تاوان خراوەتە بەندیخانەو فەرمان دەردەکات کەدەبێت دەستبەجێ ئازادبکرێت، بڕیاری ئازادکردنی دەدرێت و حەزرەتی یوسفیش دەفەرمووێت دەرناچم تاوەکو پاشا نەزانێ کەمن لەبەرچی و لەسەرچی خراومەتە بەندیخانە؟ پاشا لەگەڵ حەزرەتی یوسف دەکەوێتە وتوێژ و حەزرەتی یوسف بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە و زولەیخاش دان بە تاوانەکەی خۆی دادەنێت و کۆمەڵە ئافرەتەکەی کەهاتنەلای ویستیان تاقی بکەنەوە و بۆخۆیانی فریوبدەن ئەمانیش گەواهیاندا کەئەم پیاوە کەسێکی زۆر پاکە و بێ تاوانە!!..

پاشا دەستبەجێ بەرائەتی حەزرەتی یوسف لەبەردەم هەموو خەڵکی رادەگەیەنێت و فەرمان دەردەکات کە حەزرەتی یوسف بوو بەوەزیری خەزێنەی دەوڵەتی میسر، چونکە پلانێکی بازرگانی زۆر پوخت و جوانی دارشت و بەو هۆیەوە توانی میسر لە برسێتی و هەژاری رزگار بکات و تەنانەت هەموو وڵاتێك روویان لەو وڵاتە دەکردو بەقازانج گەنمیان لە میسر دەکڕیەوە.

متمانەبەخۆبوون گەورەترین فاکتەرە بۆ سەرکەوتن لەژیان، حەزرەتی یوسف متمانەی بەخۆیەتی بۆ دەرچوونی وڵات لە قەیرانی نەبوونی و داوا دەکات بیکەن بەوەزیری خەزێنەی میسر ) اجعلني خزائن الارض اني حفيظ عليم ( هەر وڵاتێك و دەسەڵاتێك خاوەنی سیفەتی ) حفيظ ( و ) علیم ( بێ، واتا پاراستنی خێر و بێری وڵات لە پاشاگەردانی و بەفیڕۆچوونی سامان و گیرفان پڕکردنی هەندێك لەسەر حیسابی خەڵکی هەژار و نەدار و پاراستنی بەرژەوەندی خاك و وڵات مانای ) حفیظ ( ە، لەگەڵ ئەمەش ) علیم ( واتا زانا بەهەڵسووڕاندنی کاروبارەکانی

ولاَت ...بەشێوەیەکی ئەکادیمیانە و زانستی وردەکاری، کە بێگومان ئەمەش بە ) مۆسسە ( کردنی دەزگاکانە و دورخستنەوەی دەسەلاَتی تاکە کەسییە، هۆکاری بەرەو پێشچوونی ولاَتانی پێشکەوتوو لەرووی تەکنەلۆژیاوە ئەم دوو سیفەتەیە کە ) حفیظ و علیم( ن، بۆمان دەرکەوت کە پێغەمبەران تەنها ئامۆژگارییان نەکردووە و وەعزیان نەداوە بەڵکو پرۆژەی چارەسەرکردنی کێشەکانیان کردووە و لەخەمی گەل و ولاَتیان دابوونە.

حەزرەتی یەعقوبی باوکی حەزرەتی یوسف لە فەلەستین دەبێت ئەو کاتە گرانی و کەم خۆراکی روو لەفەلەستین دەکات و فەرمان بەکوڕەکانی دەکات کەدەبێ بچن بۆ میسر بەڵکو لەو ولاَتە گەنم لەگەڵ خۆیان بێنن، براکانی حەزرەتی یوسف دەگەنە میسر، کەحەزرەتی یوسف چاوی پێیان دەکەوێت دەستبەجێ دەیانناسێتەوە.

حەزرەتی یوسف لەگەڵیان دادەنیشێت و گەنمیان پێدەدات و پێیان دەڵێت ئەمجارە کەهاتنەوە برایەکی ترتان هەیە لەگەڵ خۆتان بیهێنن و گەنمی زیاترتان پێدەدەم، بزانە ئەم پێغەمبەرە چ پلانێکی جوان و سەیری دارِشت بەڵکو ئەمجارە بێنەوەلای و خۆی بۆیان ئاشکرابکات کەمن یوسفم و برای ئێوەم.

براکانی حەزرەتی یوسف دەگەڕێنەوەلای باوکیان ئەوکاتە حەزرەتی یەعقوب چاوەکانی کوێربووە، ئەوەندە لەدووری و بێ هەواڵی خۆشەویستترین کوڕی بگرێیت کەئەویش حەزرەتی یوسفە، هەواڵەکەبەباوکیان رادەگەیەنن و دەڵێن باوکە دەبێ ) بنیامین ( ی، برامان لەگەڵ خۆمان ببەین چونکە ئەو پیاوە کە وەزیری خەزێنەی میسرە و بەپێی کەسەکان خۆراك و گەنمان ئەداتێ، باوکیان هەرچۆنێك بێت رازی دەکەن و بنیامین لەگەڵ خۆیان دەبەن، کەدەگەنەوە میسر حەزرەتی یوسف بەتەنها لەگەڵ ) بنیامین ( دادەنیشێت و خۆی پێ دەناسێنێت کەمن برای تۆم و ) یوسف( م، حەزرەتی یوسف پلانێکی تر دادەرِێژێت کەئەویش ئەوەیە :

ئەو شتەی دەستی کەگەنمی تێدەکات و دابەشی سەر خەڵکی ئەکات ئەیخاتە ناوکیسەی برا بچووکەکەیەوە، یاسای ئەوکاتیش وابوو کە ئەگەر شتێك لەیەکێك بدزرێت دەبێ کەسە دزەکە ببێتە بەندەی خاوەن شتە دزراوەکە، حەزرەتی یوسف بەپلانەکەیەوە لەشتەکەی دەگەڕێت و لەبرا گەورەی دەست پێدەکات و دواین جار دەڵێت ئەوەتا لەناو بەشە گەنمی برا بچووکەکەیانە، هێشتا خۆی بۆ ئەوانی تر ئاشکرانەکردووە کەمن برای ئێوەم و ئێوە پێش سی ساڵ بەر لەئەمرۆ منتان فرێدایە ناوبیرێکەوە و پاشان بەهۆی کاروانێکەوە گەیشتمە ئەم میسرە، براگەورەکانی هێشتا لەسەر تاوانەکانیان بەردەوامن و دەڵێن ئەم برا بچووکەمان دزە و کاتی خۆیشی برایەکی بچووکمان هەبوو کەبەهەمان شێوە دزبوو!!!!....

حەزرەتی یوسف دەفەرمووێت : من ئەوبرا بچووکەتان نادەمەوە و دەبێ لێرە بمێنێتەوە چونکە یاسای ئەوسەردەمە وابووە دەبێت ببێت بەبەندە، دەچنە لای پاشای میسر و داوادەکەن برا بچووکەکەیان بدەنەوە، ئەویش دەڵێت: ئەمە مەحاڵەو نایدەینەوە دەستتان، براگەورەکەیان دەڵێت کەوابوو من نارِۆم و لێرە دەمێنمەوە .براکانی تری دەگەڕێنەوە میسر و بەسەرهاتەکە بۆ باوکیان دەگێڕنەوە و برا بچووکەکەیان وەکو حەزرەتی یوسف بۆماوەی ساڵێك لەدەست دەرِوات و لای حەزرەتی یوسف دەمێنێتەوە، بەلاَم هێشتا باوك و براکانی نازانن کەئەم پیاوە یوسفی برایانە، جارێکی تر براکانی بەهۆی بێ گەنمی خۆراکەوە دەچنەوە میسر ئەمجارەیان حەزرەتی یوسف جیایان دەکاتەوە و پێیان دەفەرمووێت ] هل علمتم مافعلتم بیوسف [ ، زانیتان چیتان بەیوسف کرد؟ سەرهەڵدەبڕن و دەڵێن تۆ یوسفیت؟ ] اانت یوسف [ ؟؟؟؟!!!!!

ئنجا حەزرەتی یوسف خۆی ئاشکرا دەکات و دەفەرمووێت:بەڵێ من یوسفم و برای ئێوەم، ئەوانیش تاودەدەنە دەست و پێیەکانی حەزرەتی یوسف و ماچی دەکەن و ئەویش دەفەرمووێت واز بهێنن و ئەمە لەبیر خۆتان بەرن و پێیان

دەفەرموویێت ] عفا الله عما سلف[ ، پێی فەرموون ئەوەی لەخوابترسێت و سەبر و ئارامیی هەبێت خودا پاداشتی دەداتەوە، تەقواو لەخواترسانەکەی بۆ ئەوەبوو کەنزیکی کاری ناشەرعیی نەبۆوە، سەبر و ئارامگرتنەکەشی بۆ ئەوەندە ساڵەی بەند کردنی بوو بەبێ تاوان و گوناح .پاشان فەرمانی کرد کراسەکەی بۆباوکیان بەرن، باوکیشی کراسەکە دەخاتە سەر چاوەکانی و دەستبەجێ رۆشنایی دەگەڕێتەوە نێو چاوەکانی و چاك ئەبێتەوە، بەر لەناردنی کراسەکەش بۆ باوکی هەموو براکانی کرنووشی بۆ ئەبەن ، و خەونی سی و پێنج ساڵ بەر لەئێستای دێتە دی کە یانزە ئەستێرەو رۆژ و مانگ کرنووشی بۆ ئەبەن و خەونەکە بەمناڵی بۆ باوکی دەگێڕێتەوە و باوکیشی هۆشداری دەداتێ کە ئەم خەونە بۆ براکانی نەگێڕێتەوە چونکە شەیتانی لەعین دوژمنی بەردەوام و ئاشکرای مرۆڤە] إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ [ ئا ئەمرۆ خەونەکەی هاتەجێ و براکانی دەستیان بەتەوبە و ئیستغفارکرد و وازیان لەدرۆ و تاوان هێنا، لەهەندێك ریوایەتیشا ئاماژە بەوەکراوە زولەیخا تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە و دوای مردنی عەزیزی میسر دەبێت بە خێزانی حەزرەتی یوسف وئەوەندە شەیداو عەشقی خوای گەورە دەبێت تەنانەت حەزرەتی یوسفی بیردەچێت.

لەکۆتایی ئەم بەسەرهاتەدا حەزرەتی یوسف روومان تێدەکات و فێری ژیانمان ئەکات و ئەفەرموویێت ] ربِّ قد اتيتني من الملك [ .... زانایان ئەڵێن : مانای ئەم ئایەتە ئەوەیە، خودایە موڵکی خۆتت پێبەخشیم!!!..

ئایا باس لە پۆستی وەزیرییەکەدایە یا خود ماڵ و سامانی دنیا ؟؟ نەخێر ) موڵك ( لێرەدا بەمانای سەرکەوتن بەسەر رەوشتیداوێن پیسی دێت !!!... با موڵکی دنیامان هەلبێت بەلام گەرهاتوو شەرەف و رێز وحورمەت لەدەست بدەیت چی لەموڵکی دنیا دەکەیت ؟؟؟بۆیە ناوی ناوە ) موڵك ( هەموومولکی لەدەست بچێت ئەگەڕێتەوە بەلام کەئابروو تکا و شەرەف و کەرامەت لەدەست چوو گەڕانەوەی بۆ نییە و کەسێك لەتوانایدانییە بیگەڕێنێتەوە!!!..

دواتر لەدوای ئەم ژیانە پڕ لەسەروەرییە کە تۆماری کرد و ، بە پاکی و سوپاس گوزاریی کۆتایی پێ هێنا، نزا دەکات و دەفەرموویێت ] أنت ولی فی الدنيا والاخره توفنی مسلما و ألحقنی بالصالحين [ با گەورەترین ئاواتت ئەوەبێ کە بەموسڵمانی بژیت و بە موسڵمانیش سەربنێیتەوە و موسڵمانیش واتا )) بۆ خوا ژیان و بۆ خوا مردن (( ....

لەحەزرەتی یوسف فێری کۆمەڵێك وانە و پەند و عیبرەت دەبین:

*فێری راستگۆیی و لەخواترسان دەبین.

*فێردەبین کەبەردەوام تەوبەو ئیستغفار بکەین.

*فێربووین کە نزیکی کاری ناشەرعیی و داوێن پیسی نەبینەوە.

*فێربووین کەلەنێو ماڵێك پەروەردەبووین نابێت خیانەت لەوماڵە بکەین.

*فێربووین کەبەردەوام خودا لەگەڵمانە.

*فێربووین کەلێبووردەبین، وەك چۆن براکانی دەبەخشێت و تۆڵە لەو کاربەدەستەش نااتەوەکەزیاتر لەدەساڵ بەبێ بوونی تاوان و تۆمەتێك خستیە زیندانەوە.

*فێری سەبر و ئارامگری کردین.

*فێری کردین کە هەموومان وەك ئەو فێری ئابووری و سەرخستن و بەگوڕخستنی بازرگانی ببین و ولات لەنەبوونی رزگاربکەین.

*فێربووین ژیان کورتە و تاقیکردنەوەکانیش بەجۆرەها شێوەن.

لَقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِ آيَاتٌ لِلسَّائِلِينَ (7) إِذْ قَالُوا لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَى أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ (8) اقْتُلُوا يُوسُفَ أَوِ اطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا مِنْ بَعْدِهِ قَوْمًا صَالِحِينَ (9) قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ لَا تَقْتُلُوا يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَابَةِ الْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ السَّيَّارَةِ إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ (10) قَالُوا يَا أَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَنَّا عَلَى يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُ لَنَاصِحُونَ (11) أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ (12) قَالَ إِنِّي لَيَحْزُنُنِي أَنْ تَذْهَبُوا بِهِ وَأَخَافُ أَنْ يَأْكُلَهُ الذِّئْبُ وَأَنْتُمْ عَنْهُ غَافِلُونَ (13) قَالُوا لَئِنْ أَكَلَهُ الذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّا إِذًا لَخَاسِرُونَ (14)فَلَمَّا ذَهَبُوا بِهِ وَأَجْمَعُوا أَنْ يَجْعَلُوهُ فِي غَيَابَةِ الْجُبِّ وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُمْ بِأَمْرِهِمْ هَذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ (15) وَجَاءُوا أَبَاهُمْ عِشَاءً يَبْكُونَ (16) قَالُوا يَا أَبَانَا إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِنْدَ مَتَاعِنَا فَأَكَلَهُ الذِّئْبُ وَمَا أَنْتَ بِمُؤْمِنٍ لَنَا وَلَوْ كُنَّا صَادِقِينَ (17) وَجَاءُوا عَلَى قَمِيصِهِ بِدَمٍ كَذِبٍ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنْفُسُكُمْ أَمْرًا فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ (18) وَجَاءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُوا وَارِدَهُمْ فَأَدْلَى دَلْوَهُ قَالَ يَا بُشْرَى هَذَا غُلَامٌ وَأَسَرُّوهُ بِضَاعَةً وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَعْمَلُونَ (19) وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا فِيهِ مِنَ الزَّاهِدِينَ (20) وَقَالَ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِنْ مِصْرَ لِامْرَأَتِهِ أَكْرِمِي مَثْوَاهُ عَسَى أَنْ يَنْفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُ مِنْ تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ (21) وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (22) وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَنْ نَفْسِهِ وَغَلَّقَتِ الْأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ (23)

* * *

پێغەمبەر شوعەیب سەلامی خوای لەسەربێت:

كَذَّبَ أَصْحَابُ الْأَيْكَةِ الْمُرْسَلِينَ (176) إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ (177) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (178) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (179) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ (180) أَوْفُوا الْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ (181) وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ (182) وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ (183)وَاتَّقُوا الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالْجِبِلَّةَ الْأَوَّلِينَ (184) قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مِنَ الْمُسَحَّرِينَ (185) وَمَا أَنْتَ إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُنَا وَإِنْ نَظُنُّكَ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ (186) فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِنَ السَّمَاءِ إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ (187) قَالَ رَبِّي أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ (188) فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ إِنَّهُ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ . (189) الشعراء..

ئەمجارەیان لەخزمەتی یەکێکی ترین لەنێردراوو پێغەمبەرەکانی خوای گەورە کە ئەویشیان حەزرەتی شوعەیبی کوڕی مەدیانە سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت، ئەم پێغەمبەرە بەدووپشت دەگاتەوە بەحەزرەتی ئیبراهیمی باوکی پێغەمبەران و باوکی حەزرەتی شوعەیب سەرۆك هۆزی مەدیەن بووە لە ئوردن و حەزرەتی شوعەیب لەناو ئەو هۆز و گەلە ژیاوە کە لەنزیك دەریای مردوو بووینە، بەرلەو هۆزە گەلی سەدوم لەشوێنەکەی ئەوان ژیاون و دەیانزانی کەبەرلەوان ئەو گەلە بەر سزای خوای گەورە کەوتن و لەناوچوون.

حەزرەتی شوعەیب ڕەمزی تێکۆشان و کۆڵنەدان بووە وپێمان دەڵێت : کەباوەڕهێنان و ئیمانداریيەتی ڕاستەقینە هەر ئەوەنییە شایەتوومان بهێنیت و لەماڵەوە یاخود لەسووچێکی مزگەوت دانیشیت و بەتەنها زیکر و یادی خوای گەورە بکەیت، بەڵکو پێت دەڵێت :تۆش هەوڵبدەوماندووببە و ڕەنج بکێشە بۆ بانگەواز وبانگکردنی ئەم خەڵکە بۆ ڕێی هیدایەت و سەرفرازی و بەختەوەری، حەزرەتی شوعەیب وەکو هەموو پێغەمبەرەکانی تر شەووڕۆژ لەگەڵ گەلەکەی بووەو خەمخۆرییان بووە و درەنگانی شەوانیش لەخەڵوەدا لەبەردەم خوای گەورە ئیستغفاری کردووە و بەکوڵ گریاوە، ئەگەر ئێمەش لەم چەرخ و ڕۆژگارە بمانەوێت نزاکانمان گیرابن و خوای گەورە بەهانامانەوەبێت بۆ

بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵیی و بەدڕەوشتی و سەرخستنی ئەم ئایینە ئەوا وەکو ئەو پێغەمبەرەو پێغەمبەرەکانی تر پێویستیمان بەماندووبوون وخەڵوە و ئیستغفارهەیە، بەم شێوەیە دەتوانین ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست بهێنین و بەرەنگاری هەموو کۆسپ و تەگەرەیەکی ئەم ڕۆژگارە ببینەوە، لەهەموو کات و سات و شوێنێك دەتوانین پەنا ببەینە بەر خەڵوە و موناجات و نزاو پاڕانەوە، لەماڵ و لەمزگەوت ولەسەرشەقام وتەنانەت لەبازاڕەکانیشدا بۆت هەیە لەگەڵ خوای گەورە موناجات بکەیت و خەڵوەبکەیت کەموناجات و خەڵوەش لەگەڵ خوای گەورە کڕنووش بردن و تەسبیحات وبیرکردنەوەیە لەگەورەیی خوای بالادەست، لەوکاتەدا تۆ زۆر خۆشەویست و ڕێزدار دەبیت لەلای خوای میهرەبان و بەسەردەکاتەوە و وەڵامی نزاکانت دەداتەوە.

بەڵام ئەوکەسەی بەو شێوەیە نەبێت و کەمتەرخەمی بکات لەخەڵوەت و گوێنەدان بەفەرمان و بڕیارەکانی خوای گەورە ئەوکەسە با باش بزانێ کەکەسێکی سەرکەوتوونییە و کەمتەرخەمە لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ژیان، ئەگەر بێدەنگ بێت لەئاست تاوان و ناهەقی و ناداد پەروەریی کاربەدەستان ئەوا بێگومان کەسێکی بێ گیانە و هیچ بوونێکی ئەوتۆوی نییە لەم دنیایەدا، کەسێك کە عیبادەت وباوەڕەکەی کردۆتە ڕەمز و هێمای ژیانی و خەڵکانیش لەو ڕەمزە دەوڵەمەند ئەکات ئەوە کەسێکی سەرکەوتووە و، ئایندەیەکی گەش چاوەڕێی ئەکات، بائێمەش وابین و لەوکەسانە نەبین کەبڵێین ئەرکەکانی خۆم بەجێدەگەیەنم و خەڵکان چیدەکەن ئارەزووی خۆیانە و گرفتی من نییە، ئەمە گەورەترین تاوان و هەڵەیە، چونکە لەسەرەتاوە وتمان ئەم نەوەی ئادەمە هەرهەموویان جێ نشینی خوای گەورەن لەسەر زەوی و دەبێ وەکو سەرجەم پێغەمبەران لەهەوڵدابن و ماندووبن بۆ گەیاندنی پەیامی پیرۆزی ئیسلام بەهەموو خەڵکان .ترسناکترینیان ئەوەیە هەندێك عاداتی چاولێکەری هەیە تائێستاش لەگەڵدابێ خەڵکان پەیڕەوی ئەکەن و لەسەری دەڕۆن، وەکو عاداتی خیانەت کردن لەیەکتری و پچڕاندنی سیلەی ڕەحم و هاتووچۆنەکردنی یەکتری، ئەگەر عیبادەتەکەت ئەو عادەتانەت نەگۆڕێت ئەوا لەئیمان و باوەڕەکەت بترسە، پێغەمبەرانیش وەکو ئەڵقەیەکی گەیەنەر بووینەلەنێوان مرۆڤەکان و خوای گەورەچونکە هەرچی فەرمانی خوای گەورەیە بۆ مرۆڤەکانیان ناردووەو مرۆڤیشیان ڕاسپاردووە کەملکەچی فەرمان وبڕیارەکانی خوای میهرەبان بێت، تۆش کەباوکی و لەتەمەندا ڕۆچوویت پێویستە باوەڕو بەندایەتیەکەت وات لێبکات بەردەوام ئامۆژگاری کوڕو کچەکانت بکەیت و ئامۆژگارییان بکە کە هاتووچۆی هاوڕێ و برادەری خراپ نەکەن و بالاپۆش بن و نزیکی حەرام و گوناهو تاوان نەکەون، ئەرکێکی تری پێغەمبەران ئەوەبووە کەبەدرێژایی تەمەنیان کەلەناو گەلەکانیان بوون، دژی گەندەڵیی دارایی و بێ ڕەوشتی وستەمکردن ئەووەستان کەبەزەبری هێز و دەسەلاتی خۆیان بەسەر گەلەکانیان سەپاندبوو و مافیان زەوت ئەکردن، لەناو هەرگەل ومیللەتێك کەخراپەکاری و فەسادی و بەدڕەوشتی و گەندەڵیی هەبوو بێت ئەوا خوای گەورە پێغەمبەری بۆناردوون.

گەلی حەزرەتی شوعەیب بەم شێوەیە بوون و ستەمیان لەخەڵکان ئەکرد و گەندەڵ بوون و پارەو سامانی زۆر و بێ شوومارریان لەخەڵکی هەژار وکاسبکار ئەسەند، شتیان بەخراپ ئەکڕی و بەباشە ئەیانفرۆشتەوەوەکوئەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆ وابوون لەڕادەبەدەر گەندەڵ و خراپ بوون، خراپەکارییان لەڕادەبەدەرتێپەڕی کردبوو چونکە دەسەلاتدارەکانیان زاڵم و ستەمکار و گیرفان پڕبەلام کەسە هەژار وکاسبکارەکان دەست کورت و بێ پشت و پەنا، دز و جەردەییان زۆر تێدابوو لەسەر ڕێگاکان ببوونە گومرگ بەسەر بازرگانان و پارەی زۆریان لێ ئەسەندن و کەل و

پەلەکانیشیان بەتاڵان ئەبردن .ئەوگەلەبەوەندەش نەوەستان دارێکی گەورەیان چاندبوو کە ) ئەیکـە ( یـان پـێ ئەوت و قورئانیش ئاماژەی پێداوە ) اصحاب الایکـــە ( و، ئەمانە دارەکەیان ئەپەرست و کڕنووشیان بـۆ دەبـردو دەسەڵاتدارەکان خەڵکەکەیان بە پەرستنی ئەو دارە سەرقاڵ کردبوو، خوای گەورە لەبارەیانەوە فەرموویەتی ] كذبت اصحاب الایكة المرسلين [ واتە : هیچ پێغەمبەرێك بەلایانەوە ڕاست نـەبووە وگاڵتـەیان پـێ هـاتووە و بـەگوێیان نەکردوون ولەدژیان وەستاون.

هەروەها خوای گەورە لەبارەی حەزرەتی شوعەیبەوە فەرموویەتی ] وإلى مدين أخاهُم شعيباً قال ياقوم اعبدوا الله مالكم من اله غـيره[ ، حەزرەتی شوعەیب جارێ پەلەناکات و دەیەوێت بانگیان بکات کەبۆچی خوای تاك و تـەنها نا پەرستن کە ئایا جگە لەو خوایەکی تر هەیە؟

پێغەمبەران هەرهەموویان بەدەست ستەمکارانی سەردەمەکەی خۆیان زەحمەتییان کێشاوە و ئەزیەتـدراون، چـونکە گەلەکانیان زۆری پارەو سامان هەڵیخەڵەتاندبوون و لووت بـەرزبوون و گوێڕایـەڵیی فەرمانـەکانی خـوای گـەورە نەبوون کەلەلایەن پێغەمبەرانەوە بۆیان دەهات.

ئێستاکە لەوڵاتانی ئەوروپی هەر بەرپرس و تەنانەت سەرۆکیش بێت گەندەڵیی لەسـەر بـسەلمێت دەدرێتـە دادگـا ئەگەر پارەی دەوڵەتیشی بۆ پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن بەکار هێنابێت یاخود خانووی پێ دروست کردبێت، گەیشتۆتە ئەورادەیەی چەندین بەرپرس بەهۆی ئاشکرابوونی گەندەڵییـەکانیان خۆیـان کوشـتووە یـاخود دەسـتیان لـەکار کێشاوەتەوە، ئەمە بۆچی ؟ لەوەدەترسن کەبەرنەفرەتی ڕۆژگاربکەون و ئابڕوویان بچێت، ئەمانەخۆ کەسـانی بـێ باوەڕن و باوەڕیان بەئیسلام نییە، بەڵام حوکم و یاسا وای لێکردوون بەو شێوەیە پەروەردەبن، ئەی ئەگەر کەسێك بەگوێی خواو پێغەمبەرەکەی نەکات دەبێت چ سزا و پاداشتێك چـاوەڕێی بکـات لەکاتێکـدا خـۆی بـە ئیمانـدار و موسڵمان دەزانێت و لەناو وڵاتانی ئیسلامیدا ئەو گەندەڵییە بکات ؟ پێغەمبەران خاوەن یەك هەڵوێـستن و نایـەڵن گەندەڵیی و جەردەیی هەبێت و کەسانی لاواز وبێ پشت و پەنا لەخواروەبن و زاڵمانیش لەسەرتەختا حوکم بکەن، پێغەمبەری پێشەواش سەڵات وسەلامی خـوای گـەورەی لەسـەربێت بـەم شـێوەیەبووە و بۆڵـەناوبردنی سـتەمکاران وسەرخستنی بێنەوایان ماندووبووە و هەوڵی داوە، ئەوەتا هەرشتێکی موشریکەکانی بکەوتبایە دەسـت هەرهـەمووی بەسەر هەژاران و نەداران دابەش دەکرد و هیچ شتێکی بۆخۆی نەدەگێڕایـەوە، ئێمـەش کەبـەرپرس بـین و خـاوەن دەسەڵات بین دەبێ بەوشێوەیە بین و وانەکەین ژێر دەستەکانی خۆمان مافخوراوبکەین.

ئە مجارەیان حەزرەتی شوعەیب سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت ئامۆژگارییان ئەکات کە ماڵ و سامانی ئەو خەڵکە بەتاڵان مەبەن و لەخوا بترسن، و سەرە ڕێگاکان بۆ جەردەیی و دزی و بەتاڵان بردن بەکارمەهێنن و چیدیکە زوڵم و ستەم لەوخەڵکە هەژارەمەکەن، حەزرەتی شوعەیب لەگەڵیانەو ئامۆژگارییان ئەکات بەڵام ئەوان بـەگوێی نـاکـەن و گاڵتە بەخۆی و ئەو چەند کەسە ئەکەن کـەباوەڕیان پێـی هێنـاوە و لەگەڵیـدان، حـەزرەتی شـوعەیب بەنـەرم و نیانییەوە پێیان دەفەرموێت ئێوە ژمارەتان زۆر کەم بووەو خوای گەورە زۆری کردن و هۆزەکەتان ژمـارەی زۆربـووە، پاشان سزای گەلەکانی پێش خۆیانیان دێنێتەوە بیر کەخوای گەورە چۆن و بەچ شێوەیەك لەناوی بردن، پێغەمبەران بۆ ئەوەهاتوون هۆشیاری بەخەڵکان و گەلەکانیان ببەخشن کە ئاگادارت دەکاتـەوە لەخراپـە ئـەوا چاکەکەیـشت بۆدەستنیشان دەکات ودەبێ پەیڕەوی بکەیت، تۆش گەردەتەوێت چاکـساز بیـت و دەوروبـەرت هۆشـیاربکەیتەوەبەو شێوەیەبە و کەخراپەی کەسێکت ڕاستکردەوەئەوا باشەکەی پێ بڵێ، بۆنموونە :ئەگەر خوشکێکت باڵا پۆش نییە تۆ ئامۆژگاری بکە، ئەگەر وتی :بەدیلی ئەوکارەم چییە؟ بڵێ حیجاب و خۆدا پۆشین جێگرەوەیەتی.

گەندەڵیش بەهەمان شێوە بڵێ دەست پاکی جێگرەوەیەتی، دزی و جەردەییش بەهەمان شێوە دەستپاکی و تۆبەو گەڕانەوە بۆلای خوای گەورە، حەزرەتی شوعەیبیش بەهەمان شێوە بەگەلەکەی دەفەرمووێت :سنوورێك بۆ خۆتان دابنێن و دەستوور و یاسایەك پەیڕەو بکەن و بەئارەزووی خۆتان دەستدرێژی مەکەنە سەرسامانی خەڵکانی ژێردەستەتان، دواتر پێیان ئەفەرمووێت ] إن اريدُ الا الاصلاح مااستطعت وما توفيقي الا بالله عليه توكلت واليه انيب [ ئەمەئامانج و گوفتار و دروشمی هەموو پێغەمبەرانە، حەزرەتی شوعەیب لە گوناهو تاوانی گەلی لوت ئاگادارییان دەکاتەوەکەلەئێوەوە نزیك بوون و خوای گەورە هەرهەموویانی لەناوبرد، گەلەکەی دژی ئەوبیرۆکەی حەزرەتی شوعەیبن و پێی ئەڵێن : ئیتر بەسە وازمان لێبهێنە، بەلاَم ئەو پێغەمبەرە وازیان لێناهێنێت و بۆ ڕێنماییکردنی ئەوان هاتووە و هۆشیاریان پێدەبەخشێت کەدەسبەرداری تاوان و گوناهەکانیان بن ولەسزای خوای گەورە بترسن، پێی ئەڵێن : نوێژەکانت فەرمانت پێ ئەکات ئێمە واز لە پەرستنی خوایەك بێنین کە باوك و باپیرانمان پەرستوویانن؟ یاخود ماڵ و سامانمان بەم شێوەیە پەیدا نەکەین ؟؟ ] .. قالوا ياشعيب أصلاتك تأمرك ان نترك مايبعد أباؤنا أو أن نفعل من أمالنا ما نشاء.[

بۆچوونەکانیان وەکوبۆچوونی کاربەدەستانی ئەم ڕۆژگارەیە پێت دەڵێت : دین و دەوڵەت تێکەڵ بەیەکتر مەکە و نوێژەکەی خۆت بکەو واز لە پارە و سامانی ئێمە بهێنە، پێت دەڵێ : نوێژەکەی خۆت بکە و دەست لەکاروباری دەوڵەت وەرمەدە !!!!..قورئان بۆخۆت بخوێنە و وازلەبیرۆکە و فیکری ئێمەبهێنە !!!!دابڕاندنی دین لەدەوڵەت گەورەترین و زەقترین تاوانە، پێچەوانەی شەرع ویاسای ئیسلامە و سەرخستنی نووسراوو یاسای مرۆڤە بەسەر ئایین، حەزرەتی شوعەیبیش گەرەکیەتی ) دین ودەوڵەت ( تێکەڵاوی یەکتربن و تابەهۆیەوە مافی ژێردەستەکان پارێزراو بێت و بەوهۆیەشەوە یاسا و ڕێسایەکی تۆکمە و پتەو دەچەسپێت، کە پێچەوانەی شەرع و یاسای دەستنووسی خۆیانە، ئەمجارە گەلەکەی بەگاڵتە پێکردوونەوە پێی دەفەرموون کەتۆ پیاوێکی باش و نەرم و نیان بوویت و سەرلێشێواو نەبوویت بۆتێکچوویت و گۆڕاویت!!!.. ؟؟

ئایینی ئیسلام باشترین ونایابترین ئایینە بۆچەسپاندنی یاسا و شەریعەت و لەناوبردنی گەندەڵی و بۆت دەردەکەوێت کە تەنها عیبادەت نییە بەتەنهاو بەڵکو عیبادەت و مامەڵەشە، عیبادەتەکەت دەبێ وات لێبکات کە ملکەچی یاسابیت و لەیاسا دەرنەچیت، دواجار حەزرەتی شوعەیب ئاگادارییان دەکاتەوە، ئەی گەلەکەم سەرپێچی لەفەرمانەکانم مەکەن، چونکە سزای هاوشێوەی گەلی نوح و هودتان بۆدێت و لەناودەچن و بۆدواجار پێتان دەڵێم لەخوای گەورە بترسن وگوێڕایەڵیم بکەن.

ئنجا پێیان دەفەرمووێت داوای لێخۆشبوون لەخوای گەورەبکەن و خوای باڵادەست زۆر بەڕەحم وبەزەییە ولەگوناهەکانتان خۆش دەبێت، دیسان بەگوێی ناکەن و گاڵتەی پێدەکەن و فەرامۆشی ئەکەن و حەزرەتی شوعەیبیش پێیان ئەفەرمووێت چاوەڕوان بن تائەوکاتەی خوای گەورەسزاتان بۆئەنێرێت و لەناوتان ئەبات.

گەورەدەسەلاَتدارەکان دێنە گۆو، بەحەزرەتی شوعەیب دەڵێن : گەر بێدەنگ نەبیت و بەبێدەنگی لەناومان نەمێنیتەوەئەوا خۆت و ئەوانەی لەگەڵتن شاربەدەرتان ئەکەین و بەردبارانتان ئەکەین ولەناوتان ئەبەین، بەلاَم حەزرەتی شوعەیب گوێیان پێنادات ولێیان ناترسێت و دەزانێت کە خوای گەورە خۆی پارێزکاری ئەوەو بەسەر ستەمکارانی سەردەخات و براوەش هەربۆ باوەڕدارانە، ئەمجارە پێی دەڵێن ) یاشعیب مانفقە کثیرا مماتقول( ، پێشیان ووت :لەبەرخزمایەتی نەبووایە بەردبارانمان ئەکردی و لەناومان دەبردی، حەزرەتی شوعەیب پێیان

دەفەرمووێت ] اعملوا على مكانتكم إني عامل[ ، پاشان پێی فەرموون چاوەڕێی بەئێشترین و سەختترین سزای خوای گەورە بکەن و منیش ئەوکاتە دەتانبینم و ئێوەش دەزانن کەکامەمان براوە و سەرکەوتووە، حەزرەتی شوعەیب لەخوا دەپاڕێتەوە ونزادەکات ] ربنا افتح بيننا وبين قومنا بالحق وأنت خير الفاتحين [ نزا دەکات ولەخوای گەورە تکاکارە لەگەلەکەی جیابێتەوەو چ سزایەکی توندی خۆی هەیە بەسەریان دابارێنێت و لەناویان ببات، خوای گەورە نزاکەی گیراکرد و سزای خۆی بۆناردن و یەکەمجار هەوای لێبڕین و ئۆکسجین نەماو تەنگە نەفەسی رووی لەهەموویانی کرد، سێ ڕۆژ لەماڵەوە بەتەنگەنەفەسی مانەوە و ڕەوش و کەش وهەوایەکی نالەبار هەڵیکرد و هیچ سێبەرێك بەسەریانەوە نەما !!!!..ئنجا خوای گەورە لەدوورەوە هەورێکی چڕی ڕەنگ ڕەشی بۆناردن و سێبەری لەگەڵدابوو، هەرهەموو گەلەکە چوونە ژێرییەوەو زەوی لەرزەیەکی زۆر توندڕوویدا و هەرهەموویان لەناوچوون، بەلام حەزرەتی شوعەیب و ئەوانەی لەگەڵیدابوون باوەڕداربوون نەچوونە ژێر هەورە ڕەشەکەوە و ڕزگارییان بوو، چونکە بڕیاروفەرمانی خوای گەورە بەوشێوەیەیە و هەتا دنیاش مابێت سەرکەوتن وبراوەیی تەنها بۆ موسڵمانان و باوەڕدارانە.سەیر لەوەدابوو حەزرەتی شوعەیب و باوەڕدارەکان بەرامبەر ستەمکارەکان زۆر بەئاسانی هەوایان هەڵئەمژی و هەناسەیان ئەدا، حەزرەتی شوعەیب و باوەڕدارەکان نموونەی سزاکەیان بینی، گەلی مەدیەن وەکو گەلی سەمود کەوتنە سەرئەژنۆ و دوای زەوی لەرزەکە دەنگێکی زۆر بەرز هات و هەرهەموویان سنگیان شەق بوو و دڵیان لەجەستەیان هاتە دەرەوە، پاشان حەزرەتی شوعەیب چووەسەرلاشە تەقیوەکانیان و پێی فەرموون گەلەکەم پێموتن : خوای گەورە بپەرستن وبەگوێم بکەن وستەم وزۆرداری مەکەن گاڵتەتان پێدەهات و لەسزای خوای گەورە ئاگادارم کردنەوە و دەتانویست بەردبارانم بکەن و شار بەدەرم بکەن، و زۆر لەگەڵتان بووم و زۆریش ئامۆژگاریم کردن، کەچی سەرپێچیتان دەکرد و گاڵتەتان پێدەهات، حەزرەتی شوعەیب گەڕایەوەلای باوەڕدارەکان و دەستی کردەوە بەبانگەواز کردن تائەوکاتەی تەمەنی بەرەو پیربوون دەڕوات وحەزرەتی موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت لادەداتە مەدیەن و دەبێت بەزاوای حەزرەتی شوعەیب سەلامی خوای گەورەیان لەسەربێت...

*　　　*　　　*

**پێغەمبەر موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت :**

وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي إِنَّكُمْ مُتَّبَعُونَ (52) فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ (53) إِنَّ هَؤُلَاءِ لَشِرْذِمَةٌ
قَلِيلُونَ (54) وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَائِظُونَ (55) وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَاذِرُونَ (56) فَأَخْرَجْنَاهُمْ مِنْ جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ (57) وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ
كَرِيمٍ (58) كَذَلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا بَنِي إِسْرَائِيلَ (59) فَأَتْبَعُوهُمْ مُشْرِقِينَ (60) فَلَمَّا تَرَاءَى الْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَابُ مُوسَى
إِنَّا لَمُدْرَكُونَ (61) قَالَ كَلَّا إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ (62) فَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنِ اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْبَحْرَ فَانْفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ
فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ (63) وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ الْآخَرِينَ (64) وَأَنْجَيْنَا مُوسَى وَمَنْ مَعَهُ أَجْمَعِينَ (65) ثُمَّ أَغْرَقْنَا الْآخَرِينَ
(66)إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ (67) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ .(68) الشعراء..

یەکێك لەو پێغەمبەرانەی بە درێژایی تەمەنی پیرۆزی رووبەڕووی دەسەلاتداری زاڵم وستەمکار بۆتەوە و بەبەردەوام پشتیوانی کردووە لە ستەم لێکراوان و ستەم دیدەکان و زۆر سووربووە لەسەر بلاوکردنەوەی ئایین و بڕیار و راسپاردەکانی خوای گەورە حەزرەتی ) موسا ( یە، سەلامی خودای گەورەی لەسەربێت.

کەباس لەم پێغەمبەرە دەکرێت تواناو هێزو چاونەترسی و خۆڕاگری و فیداکاریت دێتە بەرگوێ و بەرچاوان، چونکە ئەوەندە بەهێز وتوانابووە باکی لەدەسەلآت و هێزی فیرعەوندانەبووە، پێغەمبەرێکــە لەهەمووپێغەمبــەران زیــاتر ناوی لەقورئانداهاتووە، چونکە بەبەردەوام لەهەوڵ و ماندووبوون و کۆشش دابووە و رۆژێك لەرۆژان پشووی نەداوە، خوا خۆی فەرموویەتی ] إني جاعل في الارض خليفة [ کەواتە هەموو مرۆڤێك لەسەر ئەم زەوییە جێ نشینە و ئەرکی سەرشانیەتی بەرنامە و شەرع و یاسای خوای گەورە بەو خەڵکانە بگەیەنێت و خۆی ماندووبکات، نەڵێت ئەمە کاری من نییە و خەڵك ئارەزووی خۆیەتی و چی دەکات و چی ناکات بابیکات !!ئەم وشەیە کەلەزاری ئەم خەڵکە دەردەچێ بەتایبەتی تر لەم رۆژگارە هەڵەیە و بەخۆداچوونەوەی پێویستە.

پێغەمبەر موسا بەرەنگاری گەورەترین ستەمکار و تاغوتی سەردەمی خۆی بۆوە کەئەویش فیرعەون بوو، فیرعەونێك لەناو کۆشکەکەی سەدەها منداڵی شیرەخۆر سەر دەبرێت نەوەکو موسایەك لەناو ئەو مناڵآنە سەرهەڵبدات، حەزرەتی موسا لەنێو کۆشك و تەلاری ئەو فیرعەونە گەورە دەبێت دواییش هەر بە هەوڵ و کۆشــشی ئــەم حــەزرەتی موســایە لەناودەچێت، ئەو پێغەمبەرە چەند سیفەتێکی هەبووە کە گرنگترینیان دڵسۆز بووە و ئــەوەی تریــان ) کليم الله ( بووە، واتا قسەی لەگەڵ خوای گەورەدا کردووە، دڵسۆزییەکەی چەندە بێ وێنەبووە سەیر کە لەوکاتە پــەیمانێکی خوای گەورە بەجێ دەگەیەنێ تابگەنە بــــــــەردەم کێوی ) گــور ( پێــشی هــەموو گەلەکــەی دەگــات بــەو کێــوە کەژمارەیان شەش سەد هەزار کەسە، خودا پێی دەفەرمووێ بۆچی ئاوەها بەو شــێوەیە و بەپەلــە پێــشی گەلەکــەت گەیشتیتە ئێرە ؟ حەزرەتی موساش دەفەرمووێت ] عجلت اليك ربي لترضى [ بزانــە چــەندە پەلەیــەتی تــاوەکو رەزامەندی خودا بەدەست بهێنێت.

یاخود لەوکاتەی کەبەرەو دەریا دەکەونە رێ و فیرعەون و سوپاکەی دەکەونە دوایان حەزرەتی موسا سەلامی خــوای گەورەی لەسەربێت لەدواوەی هەموو گەلەکەیەتی تاوەکو تەئکید بێ لەوەی کەتاکە کەسێك لەگەلەکەی دانەبڕاوە و جێنەماوە.

حەزرەتی موسا بەپێنج پشت دەگاتەوە حــەزرەتی ئیــبراهیم ســەلامی خوایــان لەســەر بێــت، وەك وتمــان هــەموو پێغەمبەران لەدوای حەزرەتی ئیبراهیم نەوەی حەزرەتی ئیــسحاق پێغەمبــەرن، تــەنها پێغەمبــەری ئێمــە نــەبێت کەلەنەوەی حەزرەتی ئیسماعیل پێغەمبەرە سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت، پێغەمبەر موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت کەسێکی رەش پێستی بەهێز و پتەوو توند و تۆڵ بووە و، کەمێك لەقسەکردن زمانی دەگیرا و هەنــدێك وشەی جوان نەدەختەڕوو، کەسێکی دڵسۆز و خەمخۆری ژێردەستەکان بوو بەهیچ شێوەیەك زوڵم و ســتەمی قــەبوڵ نەدەکرد.

لەسەردەمی حەزرەتی یوسفیشدا فیرعەون هەبوون ئەمانە بنەماڵەبوون و ســتەمکاربوون، فیرعەونەکــەی ســەردەمی حەزرەتی یوسف ناوی ) قابوس ( بوو بەلآم هی سەردەمی حەزرەتی موسا ناوی ) هۆلید بوو( ، و لەدوای حــەزرەتی ئیسحاق و دوای چەند سەدەیەك هاتە دنیا گەلی بەنی ئیسرائیل کە بنەماڵەی حــەزرەتی یــەعقوب بــوون لەگــەڵ هاتنی حەزرەتی یەعقوب بۆ میسر کەلەوکاتە حەزرەتی یوسف لەوێ نیشتەجێبوو مایەوە، و نەوەی بەنی ئیسرائیل زۆربوون تاوەکو ئەو فیرعەونەی لێهاتە دنیاوە ... فیرعەونیش هەموو هاوڵآتیەکانی بەنی ئیسرائیلی کرد بەپلە دوو و بۆیان نەبوو ببن بەخاوەن موڵك و سەروەت و سامان و لەئەنجامدا ئەیچەوساندنەوە و ئەیکوشتن.

هەموومان ئەهرامەکانی میسرمان بینیوە کە هەرهەمووی بەفەرمانی فیرعەون و بەهەوڵ وهیممــەت و مانــدووبوونی

بەنی ئیسرائیل دروستکراون و ئێستاش ماون و شەش سەد هەزار کەس بەندە و ژێر دەستەی فیرعەونی تاغوت بوون ئەمە جگەلەوەی لاشەی فیرعەونی ستەمکار لەناو ئەهرامەکاندا ماوە، چونکە بڕیاری خودابووکەدەبێ لاشەکەت بمێنێت تاوەکو ببێت بە پەندو عیبرەت بۆ هەموو ستەمکارێکی رۆژگار، فیرعەون کچێك دەبینێت کەناوی ئاسیابووە و فیرعەون داوادەکات کەباوکی کچە ئاسیای پێبدات و بیکات بەخێزانی خۆی، باوکیشی نارازی بوونی خۆی بەرامبەر بەفیرعەون نیشاندا کە ئێمە باوەڕدارین و لەسەر ئایینی ) ئیبراهیم و یەعقوب ( ین، و مەحاڵە ئەم کچەت پێبدەم کەتۆ بێ باوەڕی !!!هەرچۆنێك بێت فیرعەون باوکی ئاسیا ڕازی دەکات و ئاسیا دەکات بەخێزانی خۆی بەڵام هێشتا ئاسیا هەر باوەڕدارە و ئامادەنییە واز لە باوەڕە پتەوەکەی بهێنێت و فیرعەونیش بە باوەڕەکەی ئاسیا ئاگادارنییە.

هەندێك ریوایەت هەن کە دەنگ وباس بلاوبۆوە منالێك دێتە دنیاوە و تەخت و تەلاری فیرعەون دەڕووخێنێت و تەنانەت فیرعەونیش لەناودەبات، ریوایەتێکی تر هەیە گوایە فیرعەون شەوێك لەشەوان خەون دەبینێت کە ئاگرێك لەفەلەستینەوە کڵپە ئەکات و بەرەو میسر دێت و تەنها ماڵی فیرعەون و میسرییەکان و بەنی ئیسرائیلیە ستەمکارەکان دەسووتێنێت، بەڵام بەنی ئیسرائیلیە باوەڕدارەکان وەکو خۆیان دەمێننەوە.

دەڵێن بۆ بەیانی فیرعەونی ستەمکار خەڵکان کۆدەکاتەوەکەخەونەکەی بۆ راڤە بکەن و ماناکەی لێك بدەنەوە، کۆمەڵێك کەس پێی دەڵێن کەبەم زووانە منداڵێك لەدایك دەبێت و تۆ لەناودەبات، بۆیە فیرعەون بڕیارێك دەردەکات کەهەر منداڵێکی بەنی ئیسرائیل لەدایك ببێت دەبێت دەستبەجێ منداڵەکە بکوژرێت و نابێ بەخێو بکرێت، بەڵام ئەمە بڕیاری سەرزەوییە و بڕیاری خودای گەورە لە ئاسمانەکانەوە پێچەوانەی بڕیاری ستەمکارێکی سەرزەوییە...

چونکە ئەوەی خوابیەوێت وادەبێت و نابێ بچێتەسەر ) رزقکم في السماء( ، ئەمە بڕیاری خوایە ئەی بۆچی ستەمکاران وستەمکاران لەسەر زەوی خەڵکان دەچەوسێننەوە و زوڵم دەکەن خۆ رزق و ژیان بەدەست ئەوان نییە بەدەست کەسێکـــــــــە ) الّڗی لايغفل ولا ينام ( ئەی کەوابێت من بۆ زوڵم بکەم و بۆ خەڵك بەکوشتن و گرتن بدەم بۆ ببم بەسیخوڕ بەسەر خەڵکانی باوەڕدار و بێ تاوان؟

فیرعەون دەستی کرد بە زوڵم و ستەم و هەر منالێك لەدایك بووایە گەر کوڕبووایە ئەیانکوشت و کچیش بووایە بەخێویان ئەکرد تا گەورە دەبوو ئنجا دەستدرێژیان دەکردە سەر و مامەڵەشیان پێدەکرد، هەندێك دەڵێن ئەو ساڵەی فیرعەون بڕیارەکەی دەرکردبوو حەزرەتی هارون لەدایك ببوو، چونکە حەزرەتی هارون لەحەزرەتی موسا گەورەتربووە، دایکی حەزرەتی موسا سکی ئەبێت و بەهیچ شێوەیەك ناچێتە دەرەوە و تەنانەت دراوسێکانی نایبینن تائەوکاتەی حەزرەتی موسای ئەبێت، بەڵام چ بوونێك تەنانەت مامان بۆ لەدایك بوونی کۆرپەکەی ناهێنێت و هەرخۆی بەتەنهایە.

لەترسی فیرعەون نازانێ چ لەو منالە بکات لەلایەن خوداوە وەك چۆن بڵێی ئیلهامێــــــکی بۆدێت ] واوحينا الى امي موسى ان ارضعيه فإذا خفتي عليه فألقيه في اليم ولا تخافي ولا تحزني إنارادوه اليكِ وجاعلوه من المرسلين.... [ لەم ئایەتە پیرۆزەدا شەش شت کۆبۆتەوە، دوومزگێنی ، دووهەواڵ، دووفەرمانی تێدایە، خودا پێی دەفەرمووێ منالەکەت بخەرەئاوە و مەترسەو خەم مەخۆ، ئێمە بۆت دەگەڕێنینەوە و دەیخەینە ریزی پێغەمبەرانەوە، بەڵام چ دایکێك ئەم جورئەتەی هەیە کەمنالێکی تازە لەدایك بوو بخاتە سندوقێکەوە و پاشان بیخاتە ناو ئاوەوە بەو

ئومێدەی لەدەستی ستەمکــــــــارێکی خوێن ڕێژ ڕزگاری بێت .

لێرەوە چوار ئافرەت ڕۆڵیان گێڕا لە پێگەیاندن و پاراستنی موسا سـەلامی خـودای لەسـەربێت ئـەوانیش دایکـی و خوشکەکەی و خێزانەکەی و ئاسیای خێزانی فیرعەون کەبەردەوام چاودێری ئەو پێغەمبەرەیان دەکرد، دایکی موسـا ئیلهامەکەی بەجێگەیاند و حەزرەتی موسای کۆرپەلەی خستە تابوتێکەوە و دواترخستیە ناو ئاوەوە، و تابوتەکـە ڕۆیشت کەموسای تیایە، بەلاَم دایکی هەر دڵی لای کۆرپەکەیەتی و بانگی خوشکە گەورەکەی موسا دەکـات کـەدوای تابوتەکە بڕۆ و بزانە بەرەو کوێ ئەڕوات، خوشکەکەی قەراغ بە قەراغی دەریاکە بەدوای تابوتەکـەدا ڕائـەکات و دەبینێت بەرەو کۆشك و تەلاری فیرعەون دەڕوات.

تابوتەکە بەهۆی شە پۆڵەکانی ئـاوەوە دەڕوات تادەگاتـە بـەردەم پاسـەوانەکانی دەروازەی کۆشـکی فیرعـەون، و هەڵیدەگرنەوە کەدەبینن منالَی تێدایەلەوکاتەدائاسیای خێزانی فیرعـەون لەوشـوێنە دانیـشتووە و تابوتەکـەیان لێئەسەنێت و دەبینێت منالَێکی تێدایە کەرەنگ و ڕووخساری لە بەنی ئیسرائیلییەکان ئەچێت و شێوە و ڕەنگـی لـە میسرییەکان جیایە، بەویستی خودای گەورە سۆز و خۆشەویستی حەزرەتی موسا دەکەوێتە دڵی ئاسیاوە و زۆر خۆشی دەوێت و دەیخاتە باوەشی خۆیـەوە، هـەروەها هـەموو کەسـێك ئـەم پێغەمبـەرەی خۆشویـستووە چـونکە ڕەنـگ و ڕووخسارێکی خۆشەویستانە و دڵگیرانەی هەبووە.

فەرمانی خودا وابووە کە ئەو کاتە ئاسیا منالَی نەبێت، فیرعـەون بەسـەر ئـەو ڕووداوەدا دێـت و سەرسـام دەبێـت کەمنالَێك لەباوەشی ئاسیادایە، هیچ هەڵوەستەیەکی نەکردو بێدەنگی نواند لێرەدا ئاسیا بەفیرعەون ئەڵێت : بـا ئەم مندالَە بکەین بەچاو ڕۆشنایی خۆمان ) نجعله قرة عين لي و لك ( فیرعەونیش پێی دەڵێت : بۆتۆ و بۆمن نـــا ) !!!...ليس لي بل لـكِ ( فیرعەون دڵی پێی خۆش نەبوو، بەلاَم دڵەکان بەدەست خوای گەورەیە، ئافرەتانی ئـەو شوێنە کۆدەکەنەوە تاوەکو شیر بەحەزرەتی موسا بدات دەم ناخاتە مەمکی هیچ ئافرەتێکەوە و شیرناخوات، ویـستی خوای گەورە وایە نابێت ئەم منالَە لەناو بچێت و بکوژرێت کەفیرعەون شەوو ڕۆژی خستۆتە سەریەك بۆ لەناوبردنی، کەچی خۆی بەهۆی شە پۆلی ئاوەوە دەچێتە ناو کۆشکەکەی و هەرلـەوێش گـەورە دەبێـت و پێـدەگات، شـیری هـیچ کەسێك ناخوات و خوشکەکەی موساش هەربەدیار ئەو دیمەنانە وەستاوە و بەچاوەکانی خۆی دەیبینێـت، لـەبازاڕ و قەرەبالَغییەکان بەدوای ئافرەتی شیردەر دەگەڕێن و کەسێك نادۆزنەوە، خوشکەکەی موسا بە ئاسیاو پاسـەوانەکان دەڵێت )هل ادلكم على أهل بيت يكفلونه لكم وهم له ناصحون ( ئـەوانیش ڕووی تێئەکـەن وپێـی دەڵـێن تـۆ چـۆن دەزانیت؟ ئەویش دەترسێت و دەڵێت : ئەم مالَە فیرعەونیان زۆر خۆش دەوێت و لەهەمان کاتیش زۆر هـەژارو دەسـت کورتن، و بە پارەیەکی بەرامبەر بۆتان بەخێودەکەن!!!...

بەفەرمانی خوای گەورە ئەم قسانە هاتە سەر زرمانی خوشکەکەی موسا سەلامی خوای گەورەی لەسـەربێت، دواتـر دایکی حەزرەتی موسابانگ دەکرێتە کۆشکی فیرعەون و پێی ڕادەگەیەنن کە دەبێ بێیتە ئێرەو هـەرلێرەوەش شـیری پێبدەیت و بەخێوی بکەیت، بەلاَم دایکی ڕازی نابێت و دەڵێت ناتوانم بێم بـۆ ئێـرەو پێمبـدەن لەمالَەکـەی خـۆم گەورەی بکەم، بەڵێ بڕیار و پە یمانی خودا هاتەجێ کـە پێـی فـەرموو بـۆتی دەگەڕێنینـەوە و دەیخەینـە ڕیـزی پێغەمبەرانیش، دایکی موسا کۆمەڵێك قازانجی بەرکەوت ئەویش وەکو گەڕاندنەوەی کۆرپەکەی بـۆ باوەشـی خـۆی کەبڕیارێکی خودایی بوو، هەروەها کۆمەڵێك سوودو قازانجی پارەو پولی فیرعەون بۆی لەبری بەخێوکردن و گـۆش کردنەکە.

حەزرەتی موسا گەورەبوو و ماوەی هەژدە سالّ لەکۆشکی فیرعەون مایـەوە، تەنانـەت هەنـدێ جـار گـەر فیرعـەون

لەشوێنەکەی نەبووایە کاروباری کۆشکی بەڕێوەدەبرد وەك خودای گەورە دەفەرموویێت ] ولّما بلغ أشده واستوى اتيناه حكما وعلما [ خودا زانست وزانیاریی پێبەخشی بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی کۆشك تەنانەت گەیشتبووە ئەو رادەیەی هەموو پاسەوان وخزمەتکارێکی کۆشکەکە پرس ورایان پێدەکرد، بەڵام بڕیاری خوا بۆ موسا ئەوەنییە کەهەردەبێ لە نێو کۆشکی فیرعەون بمێنێتەوە، بەڵکو دەبێ بچێتە دەرەوە .ڕۆژێکیان حەزرەتی موسا دەچێتەدەرەوە لەڕیوایەتێکدا دەڵێن بەشەو دەچێتەدەرەوە و هەندێکیش دەڵێن گەرمەی نیوەڕۆیە، دەبینێ دووکەس بەشەڕهاتوون و بەرەنگاریی یەکتربوونەتەوە ] هڒا من شیعته وهڒا من عدوه [ یەکێکیان لە هۆزی خۆیەتی ویەکێکیشیان دوژمنیەتی کەلەهۆزی فیرعەونەکانە، حەزرەتی موسا دەبێتە ناوبژیکارو دەیەوێت لەیەکیان جیابکاتەوە و شەڕنەکەن، پاڵێك بە میسریەکەی هۆزی فیرعەون ئەنێت و کەسەکە بەردەبێتەوە و یەکسەردەمرێت، دەستبەجێ حەزرەتی موسا دەفەرموویێت ] هڒا من عمل الشیگان [ ئەمە کاری شەیتانە و من گەرەکم نەبوو بیکوژم.

حەزرەتی موسا هەستی کرد کەلەلایەن فیرعەونەوە گەورەترین سزای بۆ دادەنرێت، بۆیە نەگەڕایەوەکۆشکی فیرعەون، لێرەوە هەواڵ بەفیرعەون دەگات کەموسا کەسێکی سەر بەهۆزەکەی تۆی کوشتووە، کەسێکی نزیك لەکۆشکی فیرعەون کە هاوەڵیی حەزرەتی موسا بووە بە پەلە هەواڵ بۆ حەزرەتی موسا دەهێنێت کەخۆت بشارەوە، چونکە دەسەڵاتدارانی کۆشك لەئامادەباشیدان و بەدوات دەگەڕێن بۆ ئەوەی بتگرن، وپێی دەڵێت ] فأخرج اني لك من الناصحين [ ئەسپێك بۆ حەزرەتی موسا پەیدادەکات و پێی دەڵێت لەشار بڕۆ دەرەوە چونکە دەسەڵاتدارانی کۆشکی فیرعەون پلانیان دارشتووە بۆ دەستگیر کردنت.

فیرعەون لەهەمولایەکەوە فەرمانی دەستگیرکردنی موسای دەرکرد، بەڵام نەیدۆزییەوەو حەزرەتی موسا بەرەوبیابان ڕۆیشت،لەڕیوایەتدا هاتووە کە حەزرەتی موسا بەتەنها و بەبێ ئەسپ شەو دەکەوێتە ڕێ و بەرەو بیابان دەڕوات، نازو نیعمەتەکانی کۆشك و دایك و خوشك و هاڕونی برای جێدەهێڵێت و لەرێگا دوعا دەکات ] قال ربي نجنّي من قوم فرعون [ لەڕیوایەتێکی سەحیحدا هاتووەکەحەزرەتی موسا هیچ خواردنی پێنەبووە و ئەوەندەگەڵای داری خواردووە، تەنانەت سکی بە پشتییەوە نووساوە، هەروەها ئەوەندە بە پیادە ڕۆیشتووە نەعلەکانی پێی ڕزیون و پێیەکانی هەمووی برینداربوون و خوێن لە پێیە پیرۆزەکانی هاتووە و برینداربووە.

ڕۆیشتنی موسا بۆئەوەنەبووەکەلەفیرعەونی ستەمکار ترسابێت، بەڵکو بۆئەوەیە پەیام و بڕیارەکانی خوای گەورە بەسەربڕیارەکانی فیرعەونی تاغوت سەرکەوێنێت، ئێمە لەم ڕۆژگارە زۆر دوعا دەکەین کەخودا لەدەستی ستەمکاران وزلهێزەکانی جیهان رزگارمان بکات، بەڵام زۆر بە پەلەین لە گیرابوونی دوعاکانمان و بەئومێدین دەستبەجێ گیرابێت، حەزرەتی نوح دوای هەزار ساڵ ماندووبوون ئنجا نزای لەگەلەکەی کرد و بە زریان و تۆفان لەناوچوون، بۆیە پێغەمبەر موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت پەلەناکات و دەیەوێت ماندووبێت بۆ ئەوەی تەخت و تەلار و کۆشکی فیرعەون بلەرزێنێت، چونکە خودا خۆی خاوەن بڕیارە بەسەر هەموو ڕووداووشتێك و دەیەوێت حەزرەتی موسا تاقیی بکاتەوە.

جێی خۆیەتی لێرەوە ئێمە ئەم بەسەرهاتانەی پێغەمبەران بەچیرۆك نەخوێنینەوە بەڵکو بەڕووداو سەیری بکەین و بزانین کەئەم پێغەمبەرانە لە پێناو سەرخستنی پەیام و بڕیارەکانی خوای گەورە چەندە ئەزیەت و ئازاریان چەشت و چەندە ماندووبوون، باشوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرانە بین و ڕقمان لە ستەمکارەکان بێتەوە، کە بەدرێژایی تەمەنیان لەدژی ئەو پێغەمبەرانە و پەیامی خوای گەورە وەستان، باسکردنی ژیانی ئەو پێغەمبەرانە بۆ ئەوەیە تاوەکو بزانین کەلەم سەردەمەی ئەمڕۆدا گەر بەگوێڕایەڵیی پێغەمبەرەکەم نەکەم چەندە سوود و قازانج و چەندە

زیانیشم پێدەگات.

هەندێك كەس بەلایانەوە سوود وەرگرتنە لەلایەنی ماددی بەلاّم هەندێك كەس لایان ڕوونە كە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە و مسۆگەركردنی بەهەشتی نەبڕاوەو بێ كۆتایە، و نەسوتانمانە لەناو دۆزەخی هەتاهەتایی، چەندكەس هەیە ئەمڕۆ بەگوێی پێغەمبەر نەكات، سەیركە چەندین كەس لەبەر دەرگای یانەكان ڕیزیان گرتووە بۆ مەی خواردنەوە، چەندین و چەندان كەسیش هەن درۆ ئەكەن و حەرام ئەخۆن و خۆیان بۆ خەڵك نمایش ئەكەن، كە ئەمانە هەرهەموویان نیشانەیەكن لە گوێنەدان بەخوای گەورە و پێغەمبەرانی خوای گەورە.

ئەو میللەت و گەلانەی پێشوو كەباسیان دەكەین هەروەكو ئەو سەردەمە وابوون لەسەرپێچی كردن لەبڕیارەكانی خواو پێغەمبەر و دەست خستنە خوێنی یەكتری و درۆو تەڵەكەبازی و سوێندخواردن بەغەیری خوای گەورەو میهرەبان، پێغەمبەران هەتا دوایین كاتەكانی ژیانیان هۆشدارییان داوەتە گەلەكانیان گەربێتوو تەوبە و ئیستغفارنەكەن گوڕاو سەرگەردان دەبن و بەفەرمانی خوای گەورە لەناو ئەچن، ئەوەتا گەلی نوح و عادو پمود و هود و گەلی ئیبراهیم و گەلی ساڵح و ستەمكارانی سەردەمی موسا چییان بەسەرهات ؟بۆ كوێ چوون و كوا تەخت و كۆشك و تەلاری جارانیان؟ بۆیە حەیف و مخابنە ئێمەی ئەو ڕۆژگارە چاو لەوان بكەین و سەرپێچی لەشەرع وبەرنامەی خوای گەورەو پێغەمبەرەكانی بكەین، حەیف نییە كەبەگوێی پێغەمبەرێك نەكەین كەهەموو نهێنییەكانی بوونەوەری لەزەوی وئاسمان بۆباسكردووین؟ حەیف ئەوەیە بەدوای زانستەكانی ئەوان نەكەوین و وێڵی دوای زانستەكانی دەستی مرۆڤێكی لاوازبین.

حەیف بۆئەوەی بەدوای شەرع وبەرنامەی دەستنوسی دەستی مرۆڤ بكەوم و بیكەمە چاوساغ و ڕێبازەكەم كەچی لەولایشەوە گوێ نەدەمە گەورەترین وپیرۆزترین بەرنامەو یاسای خوای گەورە، گەلەكانی سەردەمی ئەو پێغەمبەرانە كامیان سەركەوتوو و براوەبوون وكامیان دۆڕاوو سەرگەردان؟ بێگومان براوەیی هەربۆ پێغەمبەران و سەرشۆڕی و دۆڕان بۆ گەلەسەرسەختەكانیانە، ئەوەتا پێغەمبەری پێشەوامان دەفەرمووێت :لەرۆژی قیامەتا پێغەمبەری واهەیە دوانزەكەسێك لەئوممەتەكەی لەگەڵدایە وهەیشە هیچ كەسێكی لەگەڵدانییە و هەیشە خەڵكانێكی ئێجگار زۆری لەگەڵدایەو باوەڕیان پێی هێناوە، كوڕو كچی ئەم ڕۆژگارەش لەم زەمەنەدا چەندە گوێڕایەڵیی پێغەمبەری ئیسلامن ئەگەر پێغەمبەر لەو ڕۆژگارە لەناومان بووایە هەرئەوەندە بەگوێیان دەكرد و شوێنی دەكەوتن، چونكە خۆئێستا فەرمایشت و ڕاسپاردەكانی لەناوماندا بوونی هەیە، و زۆرێك خەڵك پشتگوێی دەخەن و پەیڕەوی ناكەن،ئەگەر لەناویشمان بووایە هەر بەوشێوەیە دەبوو، بەگوێ نەكردنی پێغەمبەری خۆشەویست وەك ئەوە وایە بێت و لەدەرگای ماڵەكەت بدات و ئامۆژگاریت بكات و پێت بڵێت سەرپێچی لەبڕیارەكانم مەكەو خۆت داپۆشە و مەهێڵە خۆت و كچەكەت بەڕووتی و بەبێ سەرپۆش بچنە دەرەوە و لەخوابترسەو وابكە مناڵەكانت بەجوانترین شێوە پەروەردە بكەیت، وەك ئەوەوایە بچێتەلای بازرگانێك و دوكاندارێك و پێی بڵێت داوات لێدەكەم ئاگاداری كارو كاسبییەكەت ببەو، فێڵ لەتەرازوونەكەیت، و لەخوابترسە.

خوای گەورە ئەفەرمووێت ) أعبدوا الله واطیعون ( وحەزرەتی موساش پێی فەرمووین خوا بپەرستن و بەگوێم بكەن، و غەش مەكەن و فێڵ لەكاروبارەكانتان مەكەن و بزانن بەبەردەوام خوای گەورە چاودێرە بەسەرتانەوە، بۆیە لەرۆژیی

قیامەت و دوای حەشر و حیساب کە ئوممەتەکەی دەبینێت و دەفەرمووێت :أمتی ... أمـتی ... خوایـە ئوممەتەکـەم، خوای گەورەش پێی دەفـــــەرمووێ : یا محمّد هذا لیس من أمتك ... ئەمانـە لـەدوای تـۆ سـوننەتەکانی تۆیـان جێبەجێ نەدەکرد و دژی ئایینەکەی تۆ دەوەستان و پارێزگارییان لەڕێبازەکەی تۆ نـەدەکرد، نوێـژیان نـەدەکرد و بەڕۆژوونەدەبوون و عەرەقیان دەخواردەوە و داوێن پیسیان ئەکرد.

کوا گەنجەکانی ئوممەتی موحەممەد؟ کوا هەڵوێـستیان بەرامبـەر بـەڕووداوەکان؟ هەرهـەمووی سـەرقاڵی لادان و سەرپێچین و تـادەڕنگانی شەو بەدیار هۆکارەکانی راگەیاندنەوەن، و ئامادەنین نوێژێکی بە کۆمـەڵ لەمزگەوتـەکان بکەن و سوننەتێکی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە بەرز و پیرۆز ڕابگرن، هەرهەمووی کەوتۆتە دوای دنیا و سەروەت و سامان و جنێودان وغەییبەت کردن، ئەی کوائەو هەمووپارەو پوولەی دەوڵەمەندو خوا پێداوان؟ کەخەریکە لـە پێناو دنیـاو شەهەواتدا خەرج دەکرێت و کەسێك ئامادەنییە لە پێناوی ئەم دینەی موحەممەد خەرجی بکـات، کـوان ئەوخوشـکە دڵسۆزانەی کەبێنە مەیدان و خەڵکان فێـری قورئـان بکـەن و خوشـکانی تریـان ئاگاداربکەنـەوە و پێیـان بڵـێن کەسەرپۆشەکانتان بیرنەچێت و لەچك بکەن و حەرامە خۆتـان بۆخەڵکی بێگانە نمایش بکەن، ئەمانە هەرهـەمووی موحاسەبەی لەسەرە و لەڕۆژی قیامەت لێپرسینەوەی لەسەرەکەچیتکردووە بۆ ئەم ئایینە؟ با هەمووڵایەکمان بزانین کەئەگەر ئێمەش گوێڕایەڵیی پێغەمبەران نەبین، ئەوا وەکو گەلەکانی ئەوان دووچاری ئـازار و ناڕەحـەتی و سـزای بەئێشی خوا دەبین و لەناودەچین.

حـەزرەتی موسـا لەبەجێهێـشتنی میـسر بەردەوامـە تـاوەکو بەفـەرمانی خـوای گـەورە دەگاتـە مەدیـەن و ڕوو لەوشارەدەکات، کەدەبینێت خەڵکانێکی ئێجگـار زۆر لەمەدیـەن خـەریکی بـەخێو کردنـی مـەڕو مـاڵاتن و هـەموو ئاژەڵەکانیان تێکەڵی یەکتربووە و قەرەباڵغی سەری هەڵداوە، ولەولایشەوەدووئافرەت دەکەونە بەرچاوی حەزرەتی موسا و نایەڵن مەڕەکانیان تێکەڵ بەمەڕەکانی مێگەڵی ئەولاببێت، لێرەوە حەزرەتی موسا سـەلامی خـوای گـەورەی لەسەربێت هەستی کرد کە ئەو دووئافرەتە ئیماندارن و خاوەن حەیان و بەشەرمن، چـونکە نزیکـی قەرەباڵغیەکـە نەدەکەوتنەوە .لێرەوە گەنجی بڕوادار دەبێت ئافرەتی باش بناسێت و بزانێت چۆنە و چـۆن نییـەو بزانێـت کـەکێ دەکات بەهاوسەری ژیانی، ئەم دیاردەی حەزلێکردنە و دڵـداری کـچان وکـوڕان لەتەشەنەسـەندندایە وبەهۆیـەوە کۆمەڵگا وێران دەبێت، و سەدان گەنج هەیە دەڵێت :ناتوانم واز لەوکچە بێنم و دەسبەرداری ببم، یان ئەو دەهێـنم یاخود ژن ناهێنم بەهەمان شێوە کچانیش هەربەو شێوەیە، حەزرەتی موسا لێیـان نزیـك کەوتـەوە، و پێـــــــــ فەرمـــــــــــــــوون ) ما خگبکما( ، وتیان بۆئێمە ناشێت بچینە ناو ئەو قەرەباڵغیە و وتیشیان باوکێکی پیرو بەساڵاچووومان هەیە و هەرخۆمان ئەم مێگەڵە مەڕە بەخێو ئەکەین.

حەزرەتی موساش هاوکاری کردن و ئاوی بۆ مێگەڵی مەڕەکەیانی هێنا، ئنجا حەزرەتی موسا بەشەکەتی وماندوویی و بە پێی بەخوێنەوە چووە ژێر دارێکەوە و پشوویدا، ئەو دووکچەش کەحـەزرەتی موسـا هاریکـاریی کـردن دیمـەنی ماندوویی و شـەکەتی حـەزرەتی موسـایان بینـی و زانیـان کەخـەڵکی مەدیـەن نییـە و لەشـارێکی تـرەوە ڕووی کردۆتەشارەکەی ئەوان، ئەم دووکچەش حەزرەتی موسایان چاك ناسی کەکەسێکی باوەڕدار و لەخواترس و ئەمینـە، چونکە هەستی ئافرەت لەهی پیاو بەهێزترە و پیاو چاکتر دەناسێت کەچ مەرامێکی لەدڵدایە و مەبەستی چییە، دوو کچەکە خۆیان گەیاندەوە ماڵەوەو بەسەرهاتەکەیان بـۆ باوکیـان گێڕایـەوە، باوکیـشیان داوای لێکـردن بیهێننـە ماڵەوەچونکە کەسێکی غەریبە و خەڵکی ئەم شارەنییە.

کچەکان زۆر بەشەرم و حەیاوە بەدوای حەزرەتی موسادا چوون، ئەمە شەرم و حەیاو رەوشتی بەرز و بڵندی ئافرەتە نەوەك وەکو ئەم رۆژگارە ئافرەتی وا بەرچاو ئەکەوێت نیوەی جەستەی بەدەرەوەیە و تەقەی پێڵاوەکانی دوورە رێیەك ئەبرێت و ئەکەوێتە بەرگوێی کەسی بێگانە و جگە لەوەی بەنازەوە رێ ئەبرێت، کەگەرەکییەتی گە نجێك لەخشتەبەرێت و هەڵیبفریوێنێت، بەبۆن و خۆنمایشکردن و جەستە رووتیەکەی بۆت دەردەکەوێت کە ئەم ئافرەتە بایی چەندێکە و مەبەست و مەرامی چییە و بۆچی وادەکات؟ .... تۆدەچیتە بازاڕ شەرم دەتگرێت بەلای ئافرەتێکەوەگوزەربکەیت و سەرهەڵبڕیت کە چاوێکی قایم وبێ شەرمانەی هەیە و شان لەشانت ئەدات، بۆیە پێویستە خوشکان و دایکان ئاگاداری ئەو دیاردە و گوناهەبن و منداڵەکانیان و کچەکانیان ئامۆژگاری بکەن کەنزیکی ئەم جۆرە گوناهانە نەکەون کەسەرەتاییکن بۆ بەرپابوونی تاوان و گوناهو خراپەکاری و فەسادی.

کچێکیان لەحەزرەتی موسا نزیك ئەبێتەوە و پێی دەڵێت :باوکم بەدوای تۆی ناردووە و دەبێت لەگەڵمان بێیت بۆ ماڵەوە، هێشتا حەزرەتی موسا نەبووە بە پێغەمبەر دەڵێ : باشە، کچەکان پێشی ئەکەون و حەزرەتی موساش دەڵێ : بوەستە من خۆم پێشتان ئەکەوم بەبەرد ئاگادارم بکەنەوە، ئەگەر گەرەکتان لای راست بێت بەردێك ئاراستەی لای راستم بکەن، ئەگەرلای چە پیش رێگاکەتان بوو بەهەمان شێوە، سەیری ئەم رەوشتە بەرز و پیرۆزەی حەزرەتی موسابکەن و بزانن چەندە پەروەردەیەکی جوان و ئیماندارانەی هەیە و نایەوێت بەدوایانە بڕوات و لە پێشیان ئەڕوات.

بەلاّم لەم چەرخ ورۆژگارەی ئەمڕۆدا خەڵکان تێکەلاّوی کچ و کوڕان بەڕەوادەزانن و بەلایانەوە ئاساییە بەیەکەوە گەشت بکەن، یاخود گە نجی واهەیە هەفتانە پارەیەکی ئێجگار زۆر بۆمۆبایلەکەی خەرج کردووە تەنها بۆئەوەی رێگالەبەردەمی ئاسان بێت بۆ دڵداری لەگەڵ ئەو کچەی کە عەشقی بووە !!!..بەلاّم ئێستاکە ئەم جۆرە دیاردانە لەزۆری و برەو دان و باخچەی زۆر لەبەردەم کچان وکوڕان والآیە بۆ مەوعیدەکانیان، باوکیش لەئاست ئەو کارانەی کوڕ و کچەکانی بێدەنگە و هەڵوێستێکی مەردانە نانوێنێت.ئەگەر ئافرەت حەیای نەما ئەوا کۆمەڵگا ئەڕووخێت و وێران دەبێت، سەیری ژیانی ئەورووپا بکە، کوا خێزان ، کوا عەشیرەت، کوا رێز، کوا سۆز و میهرەبانی، کوا حەیا؟؟؟ هەرهەمووی گیرۆدەی دەستی ڕووخانی قیەم و ئەخلاقن و بەدەست بێ حەیایی ئافرەتان سەرگەردانن.

هەرلەمناڵییەوە پەنا دەبەنە بەر ڕووتکردنی منداڵەکانیان و بەگەورەییش بەهەمان شێوە، سەدان مەلەوانگەی تێکەلاّو لەولاّتانی ئەورووپی هەن و هەزاران کوڕو کچ تێکەڵی یەکتری ئەکرێن، و پەرە بەڕەللاّیی و سێکس و داوێن پیسی ئەدەن کەبەوهۆیەوە کۆمەڵگاش دەڕووخێت، بۆیە پێویستە کوڕان چاو لە حەزرەتی موسابکەن و کچی خەڵکی فریو نەدەن بە هە نجەتی هێنان پێیان رابووێرن و هەرچی قەدەغەیە و نادروستە ئە نجامی بدەن، هەزارەها کچی خۆش باوەڕ گیرۆدەی دەستی کەسانی فریو خواردوو و ئارەزوو بازانن!!!..

بەلاّم حەزرەتی شوعەیب سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت خۆی بەڕەوشت و کردەوەکانی دووکچەکەی ئاگادارە کەچەندە مەردانە و داوێن پاکانە و بەحەیاو ئەدەبانە مێگەڵە مەڕەکانیان بۆلەوەڕ دەنێرن و بۆیە ئامادەیە بەدوای ئەو کوڕە بێگانەیان دابنێرێت کەرووی لەشارەکەیانی کردووە، چونکە دەزانێت ئەو کوڕەش کەسێکی پاك و لەخواترس و باوەڕدارە، لەرێگادا حەزرەتی موسا نزادەکات و لەخوا دەپاڕێتەوەو دەفەرموێت :ربّي إني بما أنزلت من خيرٍ فقير ... لەکاتی گەیشتنەوەیان بۆماڵەوە کچەکانی حەزرەتی شوعەیب ئەم نزایەی موسا بۆ حەزرەتی شوعەیب دەگێڕنەوەو ] إستأجره ان خير من استأجرت القوي الامين [ کچێکیان ئەڵێت : باوکە پاداشتی بدەوە،

چونكه شایەنی پاداشت و خەلاّته ....حەزرەتی شوعەیبیش لەمەبەستی كچەكەی ئەگات كه مەبەستیەتی ببێت بە هاوسەری حەزرەتی موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت، بەلاّم بۆچی خاوەنی دوو ئاكاری جوانه ؟؟ چونكــــــه )قوی ( و ) امین ( بەهێز و دەستپاكیی دوو سیفەتی گەورەن بۆ پیاو، حەزرەتی موسا دەگاته ماڵەكـەی حـەزرەتی شوعەیب و بەیەكەوە دادەنیشن و بەسەرهاتەكەی لەگـەڵ كۆشـكی فیرعـەون وتـاگـەورەبوون و راكردنـی لەدەسـتی ستەمكارانی كۆشك بۆ حەزرەتی شوعەیب دەگێڕێتەوە و ئەویش رپێی دەفەرمووێت :مەترسه ئێـستا تـۆ لەشـوێنێكی ئەمینداى، ئنجا حەزرەتی شوعەیب دێت بەخەیاڵی كەبیكات بەزاواى خۆی، و پیی فەرموو )إني اريدأن انكحك احدى إبنتي هـاتين( ، حەزرەتی موساش رازی دەبێت و ئەو كچەیان هەڵئەبژێرێت كه بەدوایدا هـات و گەڕایـەوەو شـەرم گرتی، و پێیانووت :بەومەرجەی بۆ ماوەی هەشت ساڵ لەناوماندا بمێنەوە و ، ببەبەشوانی مێگەڵەكەمان، حەزرەتی موساش رازی دەبێت و بۆماوەی دەساڵ لایان دەمێنێتەوە و مناڵیان ئەبێت و لەشوانێتییەكەی بەردەوامه.

دوای دەساڵ حەزرەتی موسا بڕیارەكـەی خـۆی هێنایـەجێ و ڕووی كـردە حـەزرەتی شـوعەیبی خـەزوری كـەدەبێت بگەڕێمەوە ولاّتەكەم كەمیسره، لێرەوە خواحافیزی لەحەزرەتی شوعەیب كرد و بەرەو میسر دەكەوێتەڕێ، حـەزرەتی موسا لەگەڵ خێزان و مناڵەكانی دەكەونه ڕێگاشەویان بەسەرداد‌ێت كەش و هەوایەكی زۆر سارد و باراناوییه، و هیچ
شتێكیان پێنییەله ئاگرێك و چرایەك .لەدوورەوە ڕۆشناییەك دەبینێت] وَهَلْ أَتَـاكَ حَـدِيثُ مُوسَـى (9) إِذْ رَأَى نَـارًا
فَقَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا لَعَلِّي آتِيكُمْ مِنْهَا بِقَبَسٍ أَوْ أَجِدُ عَلَى النَّارِ هُدًى (10) فَلَمَّا أَتَاهَـا نُـودِيَ يَـا مُوسَـى
(11)إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى (12) وَأَنَا اخْتَرْتُكَ فَاسْتَمِعْ لِمَـا يُـوحَى (13) إِنَّنِـي أَنَـا
اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي (14) إِنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَـا لِتُجْـزَى كُـلُّ نَفْـسٍ بِمَـا تَـسْعَى
(15)فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَنْ لَا يُؤْمِنُ بِهَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَتَرْدَى(16)
وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَا مُوسَى (17) قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّأُ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَى غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَآرِبُ أُخْرَى (18) قَالَ
أَلْقِهَا يَا مُوسَى (19) فَأَلْقَاهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَـسْعَى (20) قَـالَ خُـذْهَا وَلَـا تَخَـفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا الْـأُولَى (21)
وَاضْمُمْ يَدَكَ إِلَى جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ آيَةً أُخْـرَى (22) لِنُرِيَـكَ مِـنْ آيَاتِنَـا الْكُبْـرَى (23) اذْهَـبْ إِلَـى
فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى (24) قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي (25) وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي (26) وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِـسَانِي (27) يَفْقَهُـوا
قَوْلِي (28) وَاجْعَلْ لِي وَزِيرًا مِنْ أَهْلِي (29) هَارُونَ أَخِي (30) اشْـدُدْ بِـهِ أَزْرِي (31) وَأَشْـرِكْهُ فِـي أَمْـرِي (32) كَـيْ
نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا (33) وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا (34) إِنَّكَ كُنْتَ بِنَا بَصِيرًا (35) قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَا مُوسَى (36) وَلَقَدْ مَنَنَّا
عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَى (37) إِذْ أَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّكَ مَا يُوحَى (38) أَنِ اقْذِفِيهِ فِي التَّـابُوتِ فَاقْذِفِيـهِ فِـي الْـيَمِّ فَلْيُلْقِـهِ الْـيَمُّ
بِالسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِي وَعَدُوٌّ لَهُ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَـى عَيْنِـي (39) إِذْ تَمْـشِي أُخْتُـكَ فَتَقُـولُ هَـلْ
أَدُلُّكُمْ عَلَى مَنْ يَكْفُلُهُ فَرَجَعْنَاكَ إِلَى أُمِّكَ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا فَلَبِثْتَ
سِنِينَ فِي أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَى قَدَرٍ يَا مُوسَى (40) وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي (41) اذْهَبْ أَنْتَ وَأَخُوكَ بِآيَاتِي وَلَـا تَنِيَـا
فِي ذِكْرِي (42) اذْهَبَا إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى (43) فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَيِّنًا لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى (44) قَالَـا رَبَّنَـا إِنَّنَـا
نَخَافُ أَنْ يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَنْ يَطْغَى (45) قَالَ لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى (46) فَأْتِيَاهُ فَقُولَا إِنَّـا رَسُولَا رَبِّـكَ
فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ قَدْ جِئْنَاكَ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكَ وَالسَّلَامُ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى (47) إِنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَا
أَنَّ الْعَذَابَ عَلَى مَنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى (48) قَالَ فَمَنْ رَبُّكُمَا يَا مُوسَى (49) قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَـدَى
(50)قَالَ فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الْأُولَى (51) قَالَ عِلْمُهَا عِنْدَ رَبِّي فِي كِتَابٍ لَا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنْسَى (52) الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ
الْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْ نَبَاتٍ شَتَّى (53) كُلُوا وَارْعَوْا أَنْعَامَكُمْ
إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِأُولِي النُّهَى (54) مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْـرِجُكُمْ تَـارَةً أُخْـرَى (55) وَلَقَـدْ أَرَيْنَـاهُ

آَيَاتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَى (56) قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَا مُوسَى (57) فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِثْلِهِ فَاجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَا نُخْلِفُهُ نَحْنُ وَلَا أَنْتَ مَكَانًا سُوًى (58) قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ الزِّينَةِ وَأَنْ يُحْشَرَ النَّاسُ ضُحًى (59)]طه ..

بەماڵ و منداڵەکەی دەڵێت :ئێوە لێرەوە بمێنن من بۆ ئەم ئاگرە ئەچم، بەڵکو ئەم ئاگرە سوودێکی بۆئێمە هەبێت بۆگەرمکردنەوەی خۆمان و ڕۆشنایی ڕێگامان، حەزرەتی موسا بەرەو ڕۆشناییەکە کەوتە ڕێ کەلێی نزیک کەوتەوە بینی ئەوە ئاگر نییەو دارێکە نوری لێدەرئەچێ و ڕۆشنایی بەدەور و بەری ئەبەخشێت، حەزرەتی موسا سەری سوڕدەمێنێت و لەدارەکە دەچێتە پێشەوە و ڕاستەوخۆ خوای گەورە قسەی لەگەڵ دەکات بەبێ بوونی پەردەیەك لەنێوانیان و بەبێ ئەوەی حەزرەتی جبریلی بۆبنێرێت ] نودي یاموسی اني انا ربك فاخلع نعليك[ ، پێی دەفەرمووێت :ئەی موسا من خودای تۆم و نەعلەکانی پێت دابکەنە، ] إنك بالوادی المقدس گوی[ ، لێرەوە بزانە کەدەچیتە نزیك بەرماڵ یان بۆناو حەرەمی مزگەوت دەبێ نەعلە و پێڵاوەکانت دابکەنیت، پاشان پێی فەرموو ] إني انا الله لااله الاالله فاعبدوني وأقم الصلاة لذكري.[

دواتر خوای گەورە باسی قیامەت بۆ حەزرەتی موسا دەکات کەهەموو کەسێك دەبێت لەوێ پاداشتەکەی وەربگرێت چ بەباشەیاخود بە خرا پە کە بێگومان بەهەشت و دۆزەخە و چاوەڕێی باوەڕدار و بێباوەڕەکان دەکات، بەهەشت بۆ باوەڕداران و دۆزەخیش بۆ ستەمکاران وبێباوەڕان.

کەواتە گە نجەکان نەکەن لەئیمان و بڕواکەتان پەشیمان ببنەوەو وانەکەن دنیا هەڵتانبفریوێنێ، بەڕاستی ئیمانەکەتان هەموو شتێکە و گوڵێکە و لەبەرۆك وناختانەوەیە و نورە ودەبێ لەدڵ و ڕۆحی خۆت خۆشەویستتربێت، ئایا پێچەوانەی بیروباوەڕی پاك و بێگەرد لەم دنیایەدا هەیە؟ نەخێر پێچەوانە و هاوشێوەی نییە و نابێت، ئایا کام لە فەرمانەکانی خوای گەورە زیانی بۆ مرۆڤەکان هەیە؟ وەئایا ئەم ئیسلامە جگە لەڕەحمەت و بەزەیی خاڵێك توندو تیژیی و توندڕەوی تێدایە؟ نەخێر ئەم ئایینە هەرڕەحمەتە و ئیسلامیش هەر ڕەحمەت و پێغەمبەر هەر ڕەحمەت و خوداش لەهەموو کەسێك بەزەیی تر و میهرەبان ترە.

ئەم ئایینەی ئێمە فیترەتێکی پاکە و موقەددەسە، تۆچەندە لەگەڵ دینداری ئاڵوودەبیت و چەندەی بچیتە ناو ئیمانەوە و ناخت پڕبێت لەئیمان ئەوسا حەساوە و بەختەوەرو دڵخۆش و سەرفرازیت، ئەوکاتەهەست دەکەیت کە باوەڕەکەت پتەوو جێگیرەو بۆخوایە وبەس، ئەگەر بەبەردەوامی لەگەڵ ئیمان و خواویستیدا تێکەڵ بیت ئنجا هەست دەکەیت تێکەڵی کەشێکی پڕ باوەڕو بەتین و پاك و بێگەردیت، ئەوسا بۆت دەردەکەوێت کەتۆ کەسێکی نەرم و نیان و لێبووردەییت و توندوتیژ نیت.

حەزرەتی موسا گۆچانێکی بەدەستەوەیە و خوا پێی فەرموو ] وما بتلك يمينيك یاموسی [ پێی دەفەرمووێ گۆچانەو مەڕو ئاژەڵەکانی پێ دەڵەوەڕێنم، خۆ خودا باش دەزانێ کە ئەمەی دەستی گۆچانە بەڵام گەرەکیەتی گەورەیی و باڵا دەستی خۆی بۆ حەزرەتی موسا بخاتە ڕوو، خوا فەرمانی پێکرد گۆچانەکە فڕێیدات، کە حەزرەتی موسا گۆچانەکەی فڕێدایە سەرزەوی بوو بەمارێکی گەورە، ئنجا خوای گەورە فەرمانی پێکردکە دەستەکانت بخەژێر باخەڵتەوەو بەفەرمانی خوای گەورە وەکو دارە درەوشاوەکەسەرتا پای لەشی دەبێت بەیەك پارچە نور و ڕووناکی، ئنجا خوا فەرمان بەحەزرەتی موسا دەکات کەبەو شێوەیەو بەو دوو ئایەتە دەبێ بۆلای فیرعەون بچێت، وەك زانایان دەگێڕنەوە حەزرەتی موسا ئەوەندە تام وچێژی لەووتوێژە لەگەڵ خوای گەورە وەرگرت تەمەنای کردووە، قسەکانی لەگەڵ خوادا کۆتایی نەیەت و درێژە بکێشێت، بەڕاستی بۆئێمەش وایە هەرچەندە خەریکی عیبادەت و شەونوێژو

خەڵوە بیت ئنجا هەست بەتام و چێژی باوەڕدەکەیت، لەکڕنووشو ڕکوعی زۆردا هەست بەتامەزرۆی ئیمان و لـەزەتی ئیمان دەکەیت، لە نزاو پاڕانەوەی بەکووڵدا هەست ئەکەیت کەزیاتر لەخوا نزیك دەبیتەوەو دڵنیایت کە باوەڕەکەت تەواوو پوختە، چـونکە زەلیلـی و ملکـەچ بـوونی خـۆت بۆخواکـەت دووپـات دەکەیتـەوە کـەداوای لێکردوویـت، وەرەولەماوەی بیست و چوار کاتژمێری تەمەنتا بچۆرە خەڵوەت و زیکری خوای گەورە بکە و بپاڕێوە، لەقـەرەباڵغی بازاڕ وەرە دەرەوە و ڕووبکەرە مزگەوتێك و بچۆرە کڕنووش بزانە چەندە دڵت فراوان دەبێت و خوداش لێت ڕازی ئەبێت و تۆی خۆش ئەوێت، چونکە خوای گەورە خۆی فەرموویەتی زیکرم بکە زیکرت دەکەم و لـەیادت ناکـەم و بـەردەوام لەگەڵتدام.

لێرەوە دوای بڕیارەکەی خوای گەورە کـەدەبێت بـڕوات بـۆلای فیرعـەونی تـاغوت و سـتەمکار و لـەوێوە و لـەناو کۆشکەکەی بەرامبەر هەموو دارودەستەکەی بڕیارەکانی خوای گـەورەی پـێ ڕابگەیـەنێت و چاوەنترسـانە لەگـەڵی بکەوێتە گفتوگۆ، حەزرەتی موسا سەلامی خوای گـــەورەی لەسەربێت نـــــزا دەکات ] رب اشرح لی صدری ویسر لی أمری وحلل عقده من لسانی یفقه قولی واجعل لی وزیرا من أهلی هارون اخی.[

حەزرەتی موسا نزای کردو ، داوای لەخوای گەورە کرد سنگی فراوان بکات ولەهەمان کاتیش هارونی بـرای لەگـەڵ بێت و ببێتە هاوکاری، چونکە حەزرەتی موسا زمانی دەگیرابۆیە داوای ) هارون( ی، کرد لەگەڵی بچێت چونکە زمانی لەو پاراوتر و ڕەوان تر بووەو بۆئەوەی لەکاروبارەکانیشی هاوبەش بێت و تا زیـاتر زیکـر و تەسـبیحاتی خـوای گەورەبکەن، خودای گەورەش نزاکەی قەبوڵ کرد و هارونی براشی کرد بە پێغەمبەر، ئەم نزایانەی حـەزرەتی موسـا بۆچ کاتێك باشە؟ بۆئەوکاتانە باشە تاوەکو زیاتر و زێتر لەسەر باوەڕەکەت گەرم و گوڕتر بیت و خەم لەنوێژەکان بخۆیت ولەکاتەکانی خۆیان بەئە نجامی بگەیەنیت، بۆ سووربوون لەسەر ڕۆژوو گرتنت و ئیستقامەتت، ئەگەر ئـەو جۆرە نزایانە بکەیت و بڵێیت : رب اشرح لی صدری ... بـڕوا بکـە سـنگت فـراوان دەبێـت و خـوای گـەورە هـەموو کاروبارێکی بەردەمت بۆ ئاسان دەکات و دێتەجێ، کەواتە ئێمەش پێویستیمان بەو جۆرە نزایـە هەیـە و لەهـەمان کاتیش پێویستیمان بە هاوکارێك هەیە تاوەکو دووچاری خراپەنەبەین و لەهەمان کاتیش ئەو هـاوڕێ و بـرادەرە ببێتە چاوساغمان وچەوتییەکانمان بۆ ڕاست بکاتەوە، تۆ هاوڕێی وا پەیدا بکە کەبتوانی خوشکەکەی خـۆتی پـێ بدەیت و لەهەمان کاتیش کچەکەی خۆتی بدەیتێ و ئاگاداری منداڵەکەشت بە کەهاتووچۆی چ برادەرێکـی دەکـات، چونکە تۆ لە پاشەڕۆژی کورو کچەکەت بەرپرسیاریت و لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکرێت.

حەزرەتی موسا بەکۆمەڵێك پرۆژەوەبەرەو ولاتی جـارانی دەکەوێتـە ڕێ، یـەکێك لەوپرۆژانـەی ئەوەیـە کـەدەبێت داوالەفیرعەون بکات کە بەنی ئیسرائیلییەکانی بداتە دەست و لەژێر دەستەیی و کۆیلایەتی ڕزگاریان بێت، بێگومان فیرعەون ئەمەی لاقەبوڵ نییەچونکە کە ئەگەر ئەوکارە بکات ئەی کێ خزمەتکاری بۆ بکات و ببێـت بەژێردەسـتەی خۆی و کارگێڕانی کۆشکەکەی، و میسرییەکانیش وەکو بەنی ئیسرائیل خاوەنی ئەو تواناو وزەیە نین خزمـەتگوزاری فیرعەونی ستەمکاربن، موسا بەخودای فەرموو خوایە من دەترسم، خوای گـەورەش پێـی فەرموومەترسـە مـن خـۆم دەتانبینم و دەبیستم ] إنني معکما اسمع وأری[ ، کەواتە ئەمە مزگێنی خوای گەوریە بۆهەموو بەندەیەکی ئیماندار کەمەترسن و خوای گەورە خۆی لەگەڵتانە و بینەر و بیسەری هەمووشتێکە کەڕوودەدات .

حەزرەتی موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت دەگاتەوە میسر ویەکە مجار لادەداتە ماڵەکـەی خۆیـان و بـەدایك وخوشك و براکانی شاد دەبێتەوە و بەسەرهاتەکانی بۆهارونی برای دەگێڕێتەوەکەبەفەرمانی خوای گەورە تۆ بـووی بە پێغەمبەر و دەبێت بەیەکەوە ئەو بڕیارەی خوای گەورە بەجێ بگەیەنین، پاشان خۆی و حەزرەتی هـاڕونی بـرای

بەرەو کۆشکی فیرعەونی ستەمکار دەکەونەڕێ پاسەوانانی بەردەرگای کۆشك لێی دەپرسن تۆکێ و بۆ لای کوێ ئەچیت؟ حەزرەتی موساش ئەفەرمووێت من نێردراوم و بۆلای فیرعەون ئەچم.

کە دەچێتە ژووری کۆشکەکەوە دەبینێ فیرعەون لەسەر تەختەکەی خۆی دانیشتووە و کەچاوی بەحەزرەتی موسا دەکەوێت دەیناسێتەوەو پرسیاری لێدەکات ئایا تۆ ئەوکەسە نیت کەلەماڵ و کۆشکەکەی مندا گەورە بووی و پەروەردە بوویت ؟ حەزرەتی موسا دەفەرمووێت بەڵێ من ئەو کەسم .. لێی دەپرسێت تۆ هەر ئەوکەسەنیت کە پیاوەکەت کوشت و لەولاتی ئێمە ڕاتکرد و ڕۆیشتیت؟ حەزرەتی موسا دەفەرمووێت من هەر ئەوکەسەم کەلەدەست ئێوە ڕامکردو مەبەستم کوشتنی کەسەکەنەبووبەلام ڕوویدا کەڕۆیشتم ئێستاکە بەکۆمەڵێك زانستەوە و بەپێغەمبەرایەتی هاتوومەتەوە ئێرە وخودا منی ناردۆتەوەلای تۆ، لەوکاتەدا حەزرەتی موسا بەزمانێکی زۆرپاراوو ڕەوان لەگەڵی دەکەوێتە گفتوگۆ و تەنانەت فیرعەون سەری سوڕدەمێنێت و پێی دەڵێت : تۆ جاران کەلای ئێمەبوویت زمانەکەت بەوشێوەیە نەبوو ولەقسەکردن زمانت دەگیرا؟؟....!!!

ئنجا حەزرەتی موسا بەبێ ئەوەی بترسێت و باکی لەدەسەلاتی فیرعەون هەبێت، ڕوولەفیرعەون دەکات کەمنەت نەکەیت بەسەرمەوە و نەڵێیت من تۆم بەخێو کردووە و گۆشم کردووی، چونکە دایکم منی بەخێوکردووە و پێی گەیاندووم، و پاشان تاکەی بەنی ئیسرائیل دەکەیت بەکۆیلە و بەندە کەخۆشت وەکو ئەوان بەندەیت؟ فیرعەونیش دەیەوێت فراوانی بەگفتوگۆکە بدات و پرسیارلەحەزرەتی موسا دەکات کە ئەو خوایەی تۆ کێیە کەناوی دەهێنیت و چونکە جگەلەمن خوای ترنییە ...حەزرەتی موساش پێی دەڵێت : خودای من ئەوخودایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە وهەموونیعمەتێکی پێداوین، فیرعەونیش ڕوو لەدارو دەستەکەی دەکات وپێیان دەڵێت خۆئەم پیاوە بەتەواوەتی شێت بووە و گۆڕاوە و گومڕابووە، بۆ بێجگە لەمن خودایەکی تر هەیە.... ؟؟؟؟!!!!

ئنجا جارێکی تر ڕوو لەدارودەستەکەی دەکات و پێیان دەڵێ ) انا ربکم الاعلی( ، ئنجا دەکەوێتە بەر تانە و تەشەر و هەڕەشەکردن لە حەزرەتی موساو پێی دەڵێت : تۆ گومڕابووی و دەبێ بتکوژم، پاشان حەزرەتی موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت بەبێ ئەوەی باکی لەفیرعەونی ستەمکار هەبێت و ترسێکی بەدڵدا بێت، پێی دەفەرمووێت من کۆمەڵێك بەڵگە و ئایاتت لەبارەی خودای گەورە بۆ دەهێنمەوە ئایا ئامادەی واز لەبانگەشەکەت بهێنیت کە دەڵێی من خوای هەرە گەورەی ئێوەم، وەئایا ئامادەی باوەڕم پێ بهێنیت و دەسبەرداری ستەمەکانت بیت ؟

فیرعەونیش بەحەزرەتی موسا دەڵێت : ئایا شتێکی ڕوون و دیارت لەلایەتاوەکو ئێمەش باوەڕت پێ بهێنین و بەو هۆیەشەوە خوداکەت بناسین؟ حەزرەتی موساش دەفەرمووێت : بەڵێ شتی زۆرم لەلایە، فیرعەونیش پێی دەڵێت : دەکەواتە بابیبینین بزانین ئەوشتانە چین ؟ حەزرەتی موساش گۆچانەکەی دەستی فڕێدەداتە سەرزەوی و بەفەرمانی خوای گەورە دەبێتە مارێکی زۆر گەورە، و لەهەمان کاتیش نور و ڕۆشناییەك سەرتاپای کۆشکی فیرعەون ڕۆشن دەکات و شەبەق دەداتەوە، پاشان فیرعەون دەڵێت : ئەی موسا گەرەکتە بەو سیحرو جادووەت ئێمە لەزەوی خۆمان دەرکەیتە دەرەوە؟ سەیری مێشك و عەقڵی ئەم ستەمکارەبکە هێشتا باوەڕ بەم موعجیزەیە ناهێنێت و بەجادوو و سیحربازی ناودەبات، حەزرەتی موسا بۆئەوەنەهاتووە کە فیرعەونی ستەمکار باوەڕی پێ بهێنێت بەڵکو بۆ ئەوە هاتووە بەنی ئیسرائیل لەژێر چنگی ئەو زاڵمە ڕزگاربکات.

پێشتریش لەوکاتەی کەحەزرەتی موسا مەدیەنی جێهێشت و بەرەو ولاتەکەی دەگەڕایەوە ولەنزیك دارە نورینەکە خوای گەورە قسەی لەگەڵ حەزرەتی موسا کرد، ئامۆژگاری حەزرەتی موسای کردو پێی فەرموو کە چوویتە لای فیرعەون ئارامگر ونەرم ونیان بەو هەڵمەچۆو تووڕەبوون نەتگرێت ] فاذهبا الى فرعون فقولاله قولا لينا

[، ئامۆژگاری دەکات هەڵمەشاخیٚ و پەنا نەبەیتە بەر تووڕەبوونیٚکی لەرابەدەر.

پاشان فیرعەون بەحەزرەتی موسا دەڵیٚت : دەبیٚت من هەموو ساحیریٚك كۆبكەمەوە و سیحرەكانیشیان لەهی تۆ بەهیٚزتر و سەرنج راكیٚشتر بیٚت، حەزرەتی موساش ئەمە بەدەرفەت دەزانیٚ و لای ڕوون و ئاشكرایە كە خەڵكان بەچاوی خۆیانەوە دەتوانن ڕاستی و درۆببین و لەیەكیان جیابكەنەوە، بۆیە فیرعەون وادەیەك بۆ ئەو ڕۆژە دیاری دەكات كە ) یوم الزینة ( ی پیٚدەڵیٚن و لەوڕۆژە هەمووخەڵكان دیٚنە گۆڕەپانیٚكەوە و كۆدەبنەوە، فیرعەون خۆی ئامادەی گۆڕەپانەكە ئەبیٚت و بەیانیەكی زووە و هەمووخەڵكان دیٚنە دەوری گۆڕەپانەكە، فیرعەون چل ساحیری زۆربەهیٚز دەهیٚنیٚت كەهەرلەكۆشكەكەی فیرعەون پەروەردەببوون، هەندیٚك كەسدەڵیٚن ژمارەی ساحیرەكانی سەردەمی فیرعەون چوار هەزارساحیر بووینە بەلاٚم ڕاستیەكەی چل ساحیری زۆر بەهیٚز بووینە .قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ الزِّينَةِ وَأَنْ يُحْشَرَ النَّاسُ ضُحًى (59) فَتَوَلَّى فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُ ثُمَّ أَتَى (60) قَالَ لَهُمْ مُوسَى وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُمْ بِعَذَابٍ وَقَدْ خَابَ مَنِ افْتَرَى (61) فَتَنَازَعُوا أَمْرَهُمْ بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا النَّجْوَى (62) قَالُوا إِنْ هَذَانِ لَسَاحِرَانِ يُرِيدَانِ أَنْ يُخْرِجَاكُمْ مِنْ أَرْضِكُمْ بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ الْمُثْلَى (63) فَأَجْمِعُوا كَيْدَكُمْ ثُمَّ ائْتُوا صَفًّا وَقَدْ أَفْلَحَ الْيَوْمَ مَنِ اسْتَعْلَى (64) قَالُوا يَا مُوسَى إِمَّا أَنْ تُلْقِيَ وَإِمَّا أَنْ نَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَى (65) قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِنْ سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى (66) فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُوسَى (67) قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنْتَ الْأَعْلَى (68)وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى (69) فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ هَارُونَ وَمُوسَى (70) قَالَ آمَنْتُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمُ الَّذِي عَلَّمَكُمُ السِّحْرَ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ مِنْ خِلَافٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ النَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَا أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَى (71) قَالُوا لَنْ نُؤْثِرَكَ عَلَى مَا جَاءَنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالَّذِي فَطَرَنَا فَاقْضِ مَا أَنْتَ قَاضٍ إِنَّمَا تَقْضِي هَذِهِ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا (72) طه..

جادووگەرەكان لەنیٚوانی خۆیان كەوتنە قسە و چپەچپكردن بە گویٚچكەی یەكتردا، و بەیەكتری ئەڵیٚن ئەم پیاوە بانگەشەی پیٚغەمبەرایەتی ئەكات و ئەی ئەگەر شتەكانی راست بوون ئیٚمەچی بكەین؟ خۆیان بەیەكتری دەڵیٚن سیحر تەمەن و ماوەی كورتە و باسەیری هەقیقەت و راستییەكان بكەین و بزانین ئەم پیاوە چی پیٚیە كەبانگەشەی پیٚغەمبەرایەتی و یەكتاپەرستی ئەكات، بەرلەدەستپیٚكی سیحرەكانیان دەچنە نزیك فیرعەونەوە و پیٚی دەڵیٚن ئەگەر ئیٚمە براوەبووین خەلاٚت و پلەوپایەی ئیٚمە لەلای تۆ چییە؟ فیرعەونیش پیٚیان دەڵیٚت ) إنّكم لمن المقربين ( واتە ئیٚوەدەبن بەنزیكترین كەسی من هەرلەدەسەلاٚت تا بنەماڵەكەم.

لەم ڕۆژگارەش هەروایە پیاوی واهەیە هەموو شتیٚك دەكات تەنها بۆئەوەی لە دەسەلاٚت و دەسەلاٚتداران وكاربەدەستانی ڕۆژگارزیك بیٚتەوە، ئامادەیە ملی باوەڕداریٚك بشكیٚنیٚت و مافەكەی زەوت بكات تەنها بۆئەوەی كاربەدەستەكە دەستخۆشی لیٚبكات و لەخۆی نزیك بكاتەوە، تەنانەت كەسی واهەبووە ئافرەتەكەی خۆی رازاندۆتەوە و بردوویەتی بۆلای كاربەدەستیٚك یاخود ئافرەتی داویٚن پیسی بۆئەهیٚنیٚت و شەرەف و كەرامەتی خۆی ئەدۆڕیٚنیٚت تەنها بۆئەوەی پشكیٚكی لەو دەسەلاٚتە بەركەویٚت و ببیٚت بە بەرپرس.

ئەمە دەردو عیللەتیٚكی هەموو سەردەم و چەرخیٚكە تەنها بۆئەوەی پلە وپایەیەكی دەست بكەویٚت تاوەكو لەدنیا پیٚی بژیٚیت و شانازی پیٚوە بكات، بەلاٚم سەرەنجام مردن یەخەی ئەگریٚت و گەڕانەوەش هەر بۆلای خوای گەورە و بالاٚدەستە، حەزرەتی موسا بەساحیرەكانی فەرموو من دەستپیٚشخەری بكەم یاخود ئیٚوە ؟ وتیان : ئیٚمە دەست

پێدەکەین، هەر چل جادووگەرەکە گوریسەکەی دەستیان هەڵدایە سەرزەوی و راستەوخۆبووبەمار!!!!!..

حەزرەتی موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت شتی لەو شێوەیەی نەبینیوە وسەرسامی دەیگرێت و دەترسێت ] أوجس في نفسه خيفة موسى.... [

سەرۆکەکانی دنیاش لەرابردوو و لەئێستا زۆربەیان جادووگەرییان هەیە و پشتیان پێدەبەستن و لەکورسی و دەسەڵاتەکانیان دەترسن لێیان داگیربکرێت، ئەوەتا مۆسۆلینی ئیتالیا و هیتلەری ئەلمانیا و ستالینی روسیا و سەدامی رژێمی بەعس و چەندان سەرۆکی تری دنیا، بۆنموونە لەسەردەمی حوکمڕانی خۆیدا سەدام جادووگەری تایبەتی خۆی هەبوو ، لێرەوە کە حەزرەتی موسا ترس دایگرت خوای گەورە پێی فەرموو مەترسە ) قلنا لاتخف إنّك انت الاعلى ( هەروەها پێی فەرموو ) وألقى ما فى يمينيك تلقفوا ما صنعوا انّما صنعوا كيد ساحرٍ ولايفلحوا الساحر حيپ اتى( ، پاشان خودای گەورە پێی فەرمووگۆچانەکەی دەستە ڕاسستت فڕێدەرە سەر زەوی و دەبێت بەمارێکی گەورە و سەرجەم مارەکانی جادووگەرەکان دەخوات و قووتیان ئەدات، فڕێیدایە سەرزەوی و بڕیارەکەی خوای گەورە هاتە جێ.

لێرەوە هەق و راستی دەرکەوت، ناهەقی و جادوو و سیحر هەردەبێ سەری شۆڕبێت لەبەرامبەر بڕیاری خوای گەورە، جێی خۆیەتی ئەوەی لەبواری پزشکیدا کاردەکات بەرلەهەموو کەسێکی تر کڕنووش بۆ گەورەیی و خاوەن دەسەڵاتداریێتی خوا ببات و تەسبیحاتی بکات کە جگە لەخوای گەورە کەسێکی تر ئەوتوانایەی هەیە بتوانێت شێوە و رووخسار و لەشی مرۆڤ بەو شێوە ڕێك و پێکە دروست بکات ؟ ئایا ساحیرەکان وفیرعەون لەتوانایانداهەبوو مرۆڤێك دروست بکەن و گیانی پێببەخشن ؟ هەروەها ئەوەی پسپۆڕی بواری بۆشایی ئاسمانە ئەرکی سەرشانیەتی بەرلەهەموو کەسێك زووتر شایەتمان بێنێت و بیر لە گەورەیی خوا بکاتەوەکەچۆن ئەم هەموو ئاسمان و ئەستێرە و خۆر و مانگی لەئسمانەکان ڕاگرتووە و لەهەمان کاتیش رووناکی و گەرمایی بەزەوی دەبەخشن، ساحیرەکانی فیرعەونیش زانیان کە ئەمەی موسا کردی هەقیقەتێك بوو و جادوونەبوو یەکسەر چوونە کڕنووش ) والقى السحرة ساجدين ( جگەلەمەش وتیان : باوەڕمان بەخوای موساو هارون هێنا.

ئەم چل جادووگەرەی فیرعەون ڕۆژێك لەڕۆژان گوێیان لە ئامۆژگاری وبانگەوازێکی حەزرەتی موسا نەبوو، خۆ ئەوان هەر خەریکی جادووگەری بوون وتەنانەت ئیمانیان بە خودای گەورە نەبوو، لەم سەردەمەش هەزارانی وەکو ئەو جادووگەرانەی سەردەمی فیرعەون گیرۆدەی دەستی تاوان و گوناهن و تەنانەت خودای گەورە دەناسێت بەلاّم ئامادەنییە ڕۆژی تەنها پێنج جار سەری بۆ خوا کەچ بکات و بڵێت ) سبحان ربى الاعلى وبحمده ( تەمەنی گەیشتۆتە چل ساڵان مێشکی پڕە لەزانست و زانیاریی لەسەر ئیسلام و خواو پێغەمبەر بەلاّم رۆژێك لە رۆژان سەری نەخستۆتە سەر زەوی و تەسبیحاتی خوای خۆی بکات !!!... چل جادووگەرەکەی فیرعەون هەقیقەتەکەیان بەچاوی خۆیان بینی و چوونە کڕنووش و ئیمانیان هێنا و فیرعەون دڵە خووڕپە ڕووی تێکر د و هاتە هەژین و پرسیاری لەخۆی دەکرد و دەیووت : ئەم هەموو خەڵکەم بۆچی کۆکردەوە و چی ڕوویدا ؟؟!!!

فیرعەونی ستەمکار شەرمەزاری رووی تێکرد و بە جادووگەرەکانی وت : بەر لەوەی مۆڵەت لەمن وەربگرن و باوەڕتان بەموسا هێنا دەبێ گەورەترین و سەختترین پاداشت لەمن وەربگرن، سەیری هەڵوێستی ئەو زاڵمە بکە، ئەمجارە فیرعەون چی بەجادووگەرەکان دەڵێت ؟ پێی وتن :بزانە گەورەترین جادوو لەموساوە فێربوون !!!سەیری تۆمەت و بوختانی ئەوستەمکارەبکە، کەس هەیە نەزانێت کەخوا هەقە و پێغەمبەرەکان هەقن و قورئانیش هەروا؟ ئەی بۆچی ئێمە لەو هەقیقەتانە ڕابکەین و وێڵی ڕێگای شەیتان بین ؟ بۆ خوشکانمان بەگوێی فەرمایشتەکانی خوای گەورە و

پێغەمبەرەکەی ناکەن؟ ئەی بۆ ئەم هەموو غەش و خیانەتە لەبازاڕەکان وفەرمانگەکان دەکرێت ؟ ئەی بۆ گەنجەکان دوای چاولێکەرییەکانی ولآتانی رۆژاوا کەوتوون و چاویان لەخراپە و تاوان و گوناهە و ڕۆژێک لەڕۆژان بیر لە ئاخیرەتیان ناکەنەوە؟ ئەی گەنجەکانن باش بزانن کە هەقیقەت و ڕاستی تەنها لەئیسلامەوەیەو هیچ ئایینێک بەقەد ئیسلام کراوە و ڕوون نییە، ئایینەکانی تر هەمووی شاراوەن و دەستکاری کراون، جگە لە قەشە و حاخامەکانیان نەبێت کەسانی خوار خۆیان هەقیقەتەکان نازانن، چونکە هەمووی شاراوەن و ئایینەکەیان دەستکاری کراوە و بەتاڵن و بەهیچ شێوەیەک لەلای خوای گەورە قەبووڵ نین جگە لەئایینی ئیسلامیی پیرۆز نەبێت ) سەیری بکەقورئانی پیرۆز و فقە و فەرموودەکانی پێغەمبەر لەهەموو ماڵ و لەهەمووشوێنێك هەیە و ئاشکران و شاراوە نین و هەمووکەسێك بەگوێرەی خۆی شتێکی لێ ئەزانێت.(

ئنجا فیرعەون بە جادووگەرە باوەڕ هێنەرەکانی ووت : دەست و قاچتان ئەبڕم و بەزیندوویی بەدارخورما هەڵتان ئەواسم و تاوەکو هەناسە لەگیانتان نامێنێت و بە ئازارەوە ئەمرن، بەڵام ئایا جادووگەرەکان پەشیمانی ڕووی تێکردن و لەسزاکە ترسان؟ نەخێر .... تەنانەت زۆر بێباکانە و چاونەترسانە سووکایەتیان بەفیرعەون کرد و لەبەرچاوی هەموو ئامادەبووانی گۆڕەپان و نمایشەکە وتیان : تۆ دەسەڵاتت بەسەر ئێمەوە نییە و دەسەڵات و کاربەدەستییەکەت کاتییەو چی لەدەستت دێت بیکە و باکت لەهیچ شتێك نەبێت، سەیری ئەم باوەڕە بەتینەی جادووگەرە باوەڕدارەکان بکە کە لەحزەیەکی زۆر کەمە لەو مەیدانەدا باوەڕیان بەحەزرەتی موساو خوای گەورە هێناوە و هیچ حسابێك بۆ فیرعەونی ستەمکار ناکەن.

جادووگەرەکان بە فیرعەون دەڵێن تۆ دەسەڵاتت بەسەر ئەم دنیایەدانییە و بۆماوەیەکی کاتیی حوکم دەکەیت و دنیاش تاسەر بۆتۆنییە و جێی دەهێڵیت، کاربەدەست و گەنجی واهەیە لەم ڕۆژگارە دەسبەرداری دنیا نابێت و پێی حەیف و مخابنە دەست لە گوناهو تاوان هەڵبگرێت، چونکە ئەوەندە ڕووی لەدنیا کردووەهەموخۆشی ونارەحەتیەکانی بەهەشت و دۆزەخی نەبڕاوەی بیرچۆتەوە، دەڵێ ئەترسم سەروەت و سامانی دنیام لەدەست بچێت بۆچی پەنا نەبەمە بەر زینا و ڕابواردن و مەی خواردنەوە؟ ئامادەیە قیامەتەکەی لەدەست بدات، گەنجەکان وەرن و چاو لەباوەڕی ئەو چل جادووگەرە بکەن و ئیمانتان کامڵ بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خوای گەورە، هەموو ماڵ وسەروەت و سامان و خێزان و ژن و منداڵ و دایك و باوکت بکە بە قوربانی کەسێك ) الّذي لا يغفل و لاينام( ، بیکە بە قوربانی ڕێی ئەو کەسەی هیدایەتی بە جادووگەرەکان بەخشی و پشتی فیرعەونیش ئەشکێنێ و لەناوی ئەبات، ئەو چل جادووگەرەی باوەڕیان بەحەزرەتی موساو خوای حەزرەتی موسا هێنا باکیان نەبوو لەوەی کەفیرعەون دەست و قاچیان ببڕێت، و بەدارخورما هەڵیان بواسێت گەنجی ئەمڕۆ دەبێت ئیمانی وەکو ئەوانە بێت و لەهیچ شتێك نەترسێت چونکە بەبەردەوام خوای گەورە لەگەڵ بەندەکانییەتی و لەژێر چاودێری خوای گەورەدان و خۆیشی بیسەر و بینەرە بەسەر هەموو شتێك کە ڕوودەدات.

لێرەوە دووشت ڕوویدا، باوەڕی ئاسیای خێزانی فیرعەون وەکو خۆی بەنهێنی مایەوە، جگە لە ئاسیاش ژنێك لە ماڵەکەی فیرعەون وەکو ئارایشت سازێك کاری دەکرد .ئەوەتارۆژێکیان قژی کچەکەی فیرعەون دادەهێنێت و شانەکە لەدەستی بەردەبێتەوە و هەڵیدەگرێتەوە و دەلێت یا الله ... کچەکەش دەڵێ مەبەستت لە و خوایە کێیە ؟ ئایا باوکمە ؟ دەڵێ نەخێر ... خودای من و تۆ و خوای باوکیشتە .کچەکەش دەچێتەلای فیرعەونی باوکی و بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە و فیرعەون فەرمان دەردەکات ژنەکە بهێننە لای، کاتێك دەیهێننەلای فیرعەون پێی دەڵێت : زوو پەشیمان بەوە و تەنها باوەڕ بەمن بهێنە، ئەو ئافرەتەپاکەش باکی لەهیچ نییە و پێی دەڵێت جگە لەخوای گەورە

باوەڕ بەکەسی تر ناهێنم و هەرئەو خوای من و تۆ و خوای هەموو کەسێکیشە، سەیری باوەڕو چاونەترسیی ئەم ئافرەتە خۆڕاگر و خاوەن غیرەتەبکە، خۆزگە خوشکانمان لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆ وەکو ئەو لەسەر باوەڕەکەیان سوورتر و مکوڕ تر دەبوون.

بۆئەوەی ئافرەتەکەی کۆشك لەباوەڕەکەی پەشیمان بێتەوە فیرعەون بڕیاردەردەکات کە مەنجەڵێکی پڕ لەمسی تواوە یاخود پڕلەزەیتی کولاَوی بۆبهێنن، کاتێك دەیهێننە بەردەمی بە ئافرەتەکە دەڵێت : گەر پەشیمان نەبیتەوە کوڕەگەورەکەت دەخەمە ناوئەو مەنجەڵەوە و دەیتوێنمەوە، بەلاَم خۆڕاگری ئەم ئافرەتە لەباوەڕو خۆڕاگری عەمماری هاوەڵی پێغەمبەری پێشەوا بەهێزتر و پتەو ترە، کاتێك کەعەممار باوك و دایکی شەهید دەکرێت و لەترسی کوشتنی دایك وباوکی ناوی خوای کافرەکان دەهێنێت، بەلاَم ئەو ژنەی کۆشکەکەی فیرعەون وانییەو هەرچەندەی حەزرەتی موسای نەبینیوە و قسەی لەگەڵ نەکردووە رازی نابێت باوەڕەکەی لەدەست بدات و ئامادەش نییە پەشیمان بێتەوە!!!!...

بەلاَم ئاياكام ئافرەتی ئەم سەردەمە وەکو ئەو ئافرەتەباوەڕدارەکەی ناوکۆشکی فیرعەون بەوشێوەیە بەجەرگە و بۆلەدەستنەدانی ئیمانەکەی ئامادەیە تەنانەت کوڕەکەی لەناومەنجەڵێکی پڕ لە زەیت و مسی کولاَوەوە، بەزیندوویی بسووتێنرێت ؟

کوڕی گەورەی ئەخەنە ناو مەنجەڵەکەوە و بلق ئەدات و ئێسقانەکانی ئەکەونە سەر لێواری مەنجەڵەکەوە، بەلاَم ئەو هەر ئامادەنییە دەستبەرداری ئیمانە پتەوەکەی بێت وهەرچوار کوڕەکەی بەبەرچاوییەوە ئەخەنە ناومەنجەڵەکەوە و وەکو ئەوی تریان لێدێت کەبووبەئێسقان، هێشتا دایکیان بەسەبرەو ئامادەنییە مل بۆ داواکەی فیرعەون کەچ بکات، ئەم ئافرەتە خۆی و منالە بچووکەکەی باوەشی ئەمێنن، دارو دەستەی فیرعەون منالەکە لەباوەشیی ئەستێنن، دایکەکە نایدات و مندالەکە لێرەوە دێتە گۆو دەڵێت : دایکەقەیناکا ئینشائەللاَ لەبەهەشتدا بەیەك دەگەین !!!!... منالەکەش ئەخەنە ناو مەنجەڵەکەوە، ئنجا فیرعەون دەڵێت : هێشتا کات ماوە گەڕێیتوو دان بە خودایەتی مندا بنێیت ئەوا ناتخەمەناومەنجەڵەکەوەو ناتسوتێنم، ئافرەتەکەش چۆن شتی وا قەبوڵ دەکات و لەولایشەوە چوار منالەکەی لەدەستداوە و بەبەرچاوی خۆیەوە خرانە ناومەنجەڵە ئاگرینەکەوە .ژنەکە هەر ڕازی نابێت و بەفیرعەون دەڵێت : تەنها یەك داوام هەیە ئێسقانەکانی من و کوڕەکانم کۆبکەرەوە و لەیەك شوێن بمانێژە، ژنەکەش هەڵئەدەنە ناومەنجەڵەکە وەکو ئەوان ئەبێت بەئێسقان....

فیرعەون داواکەی بەجێدەهێنێت و هەمووئێسقانەکان لەنێوان مەککە وفەلەستین دەنێژرێن، ئەوەتا لەشەوی ئیسراو میعراجدا کاتێ پێغەمبەر لەگەڵ حەزرەتی جبریلدا بەرەو ئاسمانەکان دەکەوێتە ڕێ ، لەو شوێنە بۆنێکی زۆر خۆش دەکات، و پرسیار لەحەزرەتی جبریل دەکات کە ئەم زەویە چییە کە ئەو بۆنەی خۆشەی لێدێت ؟ حەزرەتی جبریلیش پێی دەفەرمووێ ئەوە ئەوشوێنەیە کەئێسقانەکانی ژنەکەو مندالەکانی تێدا نێژراوە کەلەلایەن فیرعەونەوەخرانە مەنجەڵێکی گەورەی پڕ لەئاگر و سەرجەم چیرۆکەکە بۆ پێغەمبەری پێشەوا دەگێڕێتەوە بەڵکو بۆئێمەش بگێڕێتەوەتاوەکو باوەڕمان وەکو باوەڕی ئەو ئافرەتە وابێت.

ئاسیای خێزانی فیرعەون دیمەنی سووتانی ژنەکە و مندالەکانی دەبینێت و ڕوو لەفیرعەونی مێردی دەکات ، ئیتر بەس نییە ئەوەتا موسا لەناو خەڵکدا ڕیسوای کردی و چل جادووگەرەکەش باوەڕیان هێناو وازیان لەتۆهێناو ئەو زوڵم ستەمەی تۆ تاکەی ؟

ئاسیاش کە بەنهێنی ئیمانداربوو ئیمانەکەی ئاشکرا کردو باوەڕەکەی خۆی دووپات کردەوە، لێرەوە فیرعەون زیاتر

تووڕەبوون دەیگرێت و دەست و قاچەکانی ئاسیای خێزانی دەبڕێت و هەتا دەمرێت بەو ئازارەوە گیانی دەردەچێت بەڵام ئەم نزایانە دەکات و لەخوای گەورە دەپاڕێتەوە ) ربی ابنی لی عندك بیتا فی الجنە ( داوا دەکات خوای گەورە لەخۆی نزیك بکاتەوە و هەروەها لەبەهەشتیش خانووەکی پێبەخشێت، کەسێك خوای گەورەی خۆش بووێت و ئەوەی لەدنیا هەیەتی و دەیکات بەقوربانی خوای گەورە، ئاسیاش بەرلەبەهەشتی پان وبەرین داوای نزیك بوونەوە دەکات لەخوای گەورە!!!...

سەیری باوەڕو هێزی ئەو ئافرەتە بکەن چۆن ڕووبەڕووی مێردە ستەمکارەکەی دەبێتەوەو باوەڕەکەی ئاشکرا دەکات، هەربۆیە پێغەمبـــــەر ی ئازیزمان فەرموویەتی : باوەڕی ئەم سێ کەسە کامڵ و تەواوە کەئەوانیش ئاسیا و مەریم و فاتیمەن سەلامی خوایان لەسەربێت، ئەمانە ئافرەت بوون بەڵام چ ئافرەتێکی ئیماندار و پاك و چاونەترس و باکیان لەسزای ستەمکاران نەبووە و زۆر سووربووینە لەسەر باوەڕە پتەوەکەیان.

چەندە ژن هەیە بەدەست مێردەکانیان گیرۆدەن و ئەزیەت دەخۆن، بەڵام با سەبر بگرن و ئارامگربن چونکە ئەگەر مێردەکانیان ستەمیان لێبکەن ئەوا ستەمەکانیان ناگاتە ستەمەکەی فیرعەون، پێغەمبەر دەفەرمووێت خوای گەورەلەبەهەشتدا کۆشکێکی وای بۆ ئاسیا ئامادەکردووە سەرتاپای تەڕە بەبۆنی خۆش و بۆنێکی ئەوەندە خۆشی هەیە سەرتاپای بەهەشتی گرتۆتەوە، ئەی دەبێت بۆنی ئێسقانەکانی ئەو ژنە و منداڵەکانی چ بۆنێك بێت کە خوای گەورە لەسەر زەویدا بۆنداری کردوون و پێغەمبەری ئازیزیش بۆنی کردووە!!..؟؟

ئەمجارەیان فیرعەون هەوڵی کوشتنی حەزرەتی موسا دەدات و دەڵێت : دەبێ کوشتنی خوای موساش نیشانی هەمووڵایەکتان بدەم .

تادەهات بەنی ئیسرائیل زیاتر و زێتر بەدەستی فیرعەون و داودەستەکەی دەچەوسێنرانەوە و ئازار دەدران و بەبەردەوام کاریان پێدەکرا و نەدەبوو پشوویێك بدەن، بەنی ئیسرائیلیەکان بەردەوام گلەییەکانیان ئەهێنایە لای حەزرەتی موسا و لەو میانەیەشدا حەزرەتی موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت داوای لێدەکردن ئارامگربن و خوای گەورە هەرسەریان دەکەوێنێت و سزاش بۆ فیرعەون دەنێرێت، دواتر خوای گەورە حەزرەتی موسای ئاگادار کردەوەکەبەنی ئیسرائیل کۆبکاتەوە و لەدەست فیرعەونی ستەمکار ڕابکەن، ژمارەی بەنی ئیسرائیلیش لەو کاتەدا ( 600,000 ) شەش سەد هەزار کەسە.

حەزرەتی موسا بەر لەوەی بەنی ئیسرائیل لە ڕۆیشتنەکە ئاگاداربکاتەوەپێشتر دوعای کرد و لەخوای گەورە پاڕایەوە کەهەرچی سەروەت و سامان و موڵکی فیرعەون هەیە لەناوی ببات و نەیهێڵێت، سەرەنجام دوعاکەی گیرابوو هەرچی موڵك و سامانی فیرعەون و دارودەستەکەی بوو نەماو تەنانەت دراوەکانیان بوون بە بەرد !!!...هەروەها حەزرەتی موسا لەخوا پاڕایەوە و فەرمووی خوایە وابکەی کەسێك لەگەلەکەی فیرعەون باوەڕ نەهێنێت تاوەکو سزای سەختی تۆئەبینێت، خوای گەورە ئەمەشی قەبوڵ کردو بۆماوەیەکی درێژ باران نەباری و ڕووباری نیل وشك بوو و ئاوی تیانەما، بەفەرمانی خوای گەورە تەنها ماڵی بەنی ئیسرائیلیەکان بەبەردەوام ئاویان هەبوو و وشکایی ئەوانی نەگرتبوویەوە، دارو دەستەی فیرعەون بۆلای حەزرەتی موسا دەهاتن و داوایان دەکرد لەم وشکە ساڵیە ڕزگاریان بکات و هاوکارییان بکات .حەزرەتی موسا دوعای دەکرد باران دەباری و ڕووباری نیل پڕدەبۆوەلەئاو، هەروەها بەروبووم و خۆراکیان وشك بووبوو )ونقص من الثمرات ( لەماوەی ساڵێکدا هەر دارێك تەنها یەك هەناری ئەدا و دارخورماش بەهەمان شێوە تەنها دەنکێك خورمای ئەگرت !!!!.. دیسان دەهاتنەوەلای حەزرەتی موسابەهەمان شێوە دوعای دەکردتاوەکو میوە وبەروبوومیان بۆ ئەگەڕایەوە، بەڵام مخابن دوای بینینی ئەو هەموو

موعجیزاتە فیرعەونەکان هەرلەسەر کەللەڕەقیەکەی خۆیان نەدەهاتنە خوارەوە و باوەڕیان نەدەهێنا.
ئەمجارەیان خوای گەورەلافاوو وزریانێکی توندی بۆناردن، بەڵام چ لافاوو زریانێك کەلافاوەکە دەگەیشتە کۆڵانەکان تەنها ماڵی فیرعەونەکانی دەگرتەوە و نزیك ماڵی بەنی ئیسرائیلیەکان نەدەکەوتەوە !!!..دیسان چوونەوەلای موسا بەڵکو ئەمجارەش ڕزگارییان بێت و سەلامەت دەربچن، جارێکی تر لەخوای گەورە پاڕایەوە و لەم لافاوەش دەربازییان بوو کەسەرجەم ماڵەکانی گرتبوونەوە، ئەمجارەیان خوای گەورە سزای تری بۆناردن و کوللەیەکی ئێجگار زۆری ناردە سەر بەرووبووم و کشتوکاڵەکانی فیرعەونەکان و هەرهەموویان لەناوبرد و خواردیان، هیچ سەوزایی و بەرهەمێکیان نەماو لەدەستیان چوو، ئەمانە هەرهەمووی ئایات و موعجیزاتی خوای گەورەبوون بۆئەوەی چیتر ڕوولەکوفر و شیرك نەکەن.
حەزرەتی موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت نۆ بەڵگە و نیشانەی پێ پیشاندان کەچی باوەڕیان نەهێنا، بەڵگەی ئەو گۆچانەی بوو بەمار و بەهۆیەوە جادووگەرەکان باوەڕیان هێنا، بەڵگەیەکی تری ئەوەبوو دەستەکانی بوون بەنور و هەموو دنیای ڕووناك کردەوە، لەگەڵ ئەو بەڵگانەی تر کەباسمان لێوەکرد وەکو سەرهەڵدانی لافاوو وشك بوونی ڕووباری نیل و چاك بوونەوەی کشتوکاڵ و گەڕانەوەی سەوزایی و بەرووبوومیان وەکو جاران و هەڵکردنی لافاو بۆناوماڵەکانیان و نەچوونەژوورەوەی ئاو بۆ ماڵی بەنی ئیسرائیلییەکان و چەندین نموونەی تر لەکاتی وشکەساڵی، خوای گەورە بەردەوامە لەناردنی سزاکانی بۆ فیرعەونەکان و ئەمجارەیان ئەسپێیەکی زۆر لەلەشیان بلاو بۆوە، خەوو خۆراکیان نەما و بەدەست زۆری ئەسپێوە دەیاننالاند کەسەرجەم ماڵەکانی فیرعەونەکانی گرتبۆوە، جارێکی تر هاتنەوە بۆلای حەزرەتی موسا و دوعای بۆکردن و ئەمجارەش ڕزگاریان بوو، هەر باوەڕیان نەهێنا جارێکی تر خوای گەورە سزای خۆی بەسەرداباراندن و بۆقێکی ئێجگار زۆر سەرتاپای ماڵەکانی فیرعەونەکانی گرتەوەو ڕێگاکانیان و شوێنی نووستنیان و خۆراك و جل و بەرگیان پڕبوون لەبۆق، ئەمانە چیرۆك نین و هەرهەمووی موعجیزات و سزای خوای گەورە بوون بۆئەوەی ئەو گەلە ستەمکارە دەسبەرداری تاوان و گوناهو کوفرەکانیان بن، سەیربکە بۆق ناچێتە ماڵی بەنی ئیسرائیلییەکان و دەچێتە ماڵی فیرعەونەکان، ئەوانی تریش هەروەها لافاوو کوللە و وشکە ساڵی و بێ ئاوی بەهەمان شێوەتەنها بۆ فیرعەونەکانە و خۆیان بەچاوی خۆیان ئەیبینن، هەمووکات خوای گەورە ئاگادارە بەکاروکردەوەی هەموو مرۆڤێك، ئەرز و ئاسمان لەژێر فەرمانیی خوای گەورە دایەوەکو باڵندەکان بوون بەسەربازی خواو ڕێگەیان لەفیلەکانی ئەبرەهە گرت و بەردبارنیان کردن.
فیرعەونی ستەمکارو دارو دەستەکەی هەربەردەوام بوون لەسەر تاوانەکانیان و باوەڕیان بەخوای گەورە وموعجیزاتەکانی حەزرەتی موسا نەدەهێنا، و لووت بەرزی یەخەی گرتبوون و دەسبەرداری نەدەبوون، تەنها لەکاتی هاتنی سزای خوای گەورە بۆ سەریان بەپەلە ڕوویان لەحەزرەتی موسا دەکرد کەشتێك بکات، خوداکەی سزاکەیان لەسەر هەڵبگرێت، ئەمجارەیان خوای گەورە دوا سزای بۆناردن بەڵام لەهەموو سزاکان سەیر ترو ترسناکتر، خوێن بەسەریانەوە باری بۆنموونە :ماڵەکانیان پڕبوو لەخوێن قاپ و ئەوشت و مەکانەی پێیان دەخوارد و دەخواردەوە پڕببون لەخوێن!!!.....
کانی و کانیاوەکانیان هەرخوێن بوو سەرتاپای ڕووباری نیلیش بوو بەخوێن، ئەوئاوەی فیرعەونەکان دەیانخواردەوە و بەکاریان دەهێنا هەرخوێن بوو بەڵام هی بەنی ئیسرائیلیەکان پێچەوانەی ئەوان بوو و ئاوێکی ئاسایی بوو..
لەوەش سەیرتر و سەرسامترئەوەبوو کەئاولەدەستی بەنی ئیسرائیل بوو و فیرعەونەکان لێیان داوائەکردن و ئەوانیش پێیان ئەدان لەدەست فیرعەونەکان دەبوو بەخوێن!!!..

ئەگەر خوا گەرەکی بێت ئایینەکەی سەربخات هەموو سزا و موعجیزاتێك ئەنێرێت، بەڵام نابێ کەسی باوەڕدار و بانگخواز دەستەودامێن دابنیشێت بەڵکو دەبێ وەکو موسا ئاسا لەجووڵەو بانگەواز دابێت و پشوونەدات ئەوکاتە باوەڕێکی تەواوو پتەوت هەیە، و دەبێ خەڵوە بکەیت و بەرەوماڵی خوا بڕۆیت و بڵێیت ( عجلت إليك ربي لترضى ) دەبێ شەونخوونی بکەیت و ڕووبەڕووی فەساد و بەدڕەوشتی ببیتەوەو دەبێ لە مێشك ودڵتەوە بەرنامەیەك هەبێت کەبۆخوا تێدەکۆشم و ماندوو دەبم و بۆخواش هیدایەت بەم خەڵکە ئەبەخشم و لەدڵی خۆتا دوعا بکە و بڵێ : خودایە دەوڵەمەندم بکەیت بۆئەوەی بەو دەوڵەمەندییەوە هاوکاری بێنازان و بێ باوکان و هەژارونەداران بکەم، و پەیمان بێ پڕۆژەیەك دا بمەزرێنم تەنها بۆگەنجان تاوەکو بتوانن ژن بهێنن و خێزان پێك بهێنن، لەدڵی خۆتەوە بڕیاربدە گەرچوویتە کۆلێژ هۆشیاری بەهاوڕێکانم ببەخشم و ئامۆژگارییان بکەم بۆئەوەی ڕوولەوئایینە بکەن و نزیکی کاری ناشەرعیی و خراپە نەکەونەوە، و زۆرنزا بکە و بڵێ خوایە گەر ژنم هێناساڵحمان بکەیت و وابکەم مناڵەکانم پەروەردەیەکی ئیسلامییان فێر بکەم و هەروەها فێری قورئانیان بکەم و لەئیسلام شارەزابن، دەزانی بەو جۆرە نزاو پاڕانەوە و پەیمانەکانی ناخی دڵت لەگەڵ خالیقەکەت، خوا پشتیوانت دەبێت و گیرای دەکات، بەڵام گەرتۆدابنیشیت و بڵێیت خوا خۆی دینەکەی سەردەخات و پێویستی بەمن نییە، نەخێر ....شتی وامەڵێ و خۆت ماندووبکەو بۆئەم ئیسلامە ماندووبە و پشوومەدە چونکە تۆجێ نشینی خوای گەورەیت لەسەرئەو زەوییە.

فیرعەونەکان زیاتر لەسەر تاوان و ستەمەکانیان بەردەوام بوون وسەرەنجام ئەمجارەیان بەئێشترین و توندترین سزای خوای گەورەیان بۆدێت، خوای گەورە فەرمانی بەحەزرەتی موسا کرد ماڵی بەنی ئیسرائیلییەکان دەست نیشان بکەو شەو هەموویان کۆبکەرەوە و لەماڵەوە بچنە دەرەوە و میسر جێ بهێڵن، بەبێ ئەوەی کەسێکی نزیك فیرعەون بەوکارەی حەزرەتی موسا ئاگاداربێت پێغەمبەر موسا بەوشەوە ( 600,000 ) بەنی ئیسرائیلی لەمناڵ و پیر وگەنج و پیاوو ئافرەت و گیانەوەرەکانیان دێنێتە دەرەوە و بڕیارەکەی خوای گەورەیان پێڕادەگەیەنێت بەرەو دەرەوەی میسر دەڕۆن، کەبۆبەیانی فیرعەون و دارودەستەکەی خەبەریان بوویەوەسەیر دەکەن شار چۆڵ و یەك بەنی ئیسرائیلی تیانەماوە !!!..

فیرعەون فەرمان دەردەکات لەهەرکوێیەك بن دەبێ قۆڵبەست بکرێن و سزابدرێن، خوای گەورە خۆی خستیە دڵی فیرعەون و دارودەستەکەی کەدەبێت بێنە دەرەوە و ماڵەکانیان جێ بهێڵن [ فأخرجناهم من جنات و عيون ومقام كريم كذلك وأورثناهم بني اسرائيل ] ، خوا فەرمانی کرد و خستیە دڵیانەوەکەتەنانەت دەبێ فیرعەونیش کۆشك و تەلارەکەی جێ بهێڵێت و بەدوای حەزرەتی موساو بەنی ئیسڕائیلدا بگەڕێت.

هەموو سەروەت و سامان و باغ و هەرەمەکانیان جێ هێشت، و دواتر بەنی ئیسرائیل دەستیان بەسەر داگرت و بوو بەهی ئەوان .بەڵام ئەمە دەبێ بچێتە بواری جێبەجێکردنەوەچونکە بڕیاری خوای گەورەیە و گەورەترین سزای خوای گەورە چاوەڕوانی فیرعەونی ستەمکارەلەدەرەوەی کۆشك و کورسییەکەی کەلەسەری دادەنیشت و دەیووت ( أنا ربكم الاعلى!!!!.... )

فیرعەون و دارو دەستە ستەمکارەکەی کەژمارەیان ئێجگار زۆربوولەبەنی ئیسرائیل و حەزرەتی موسا نزیك بوونەوە، بەنی ئیسرائیلییەکان ترسان و هاواری حەزرەتی موسایان کردو ئەویش فەرمووی مەترسن خوای گەورە لەگەڵ ئێمەیە و بەسەلامەتی دەرئەچین و دەبێ فیرعەون و دەست و پێوەندەکەی لەناوبچن ( إنّ معي ربي سيهدين ) ، خوای گەورە فەرمانی بەحەزرەتی موسا کرد گۆچانەکەی لەئاوەکەبدات و حەزرەتی موساش فەرمانەکەی بەجێ گەیاند و ئاوی ڕووباری نیل شەق بوو، هەندێك لەزاناکان دەڵێن ئاوەکە بۆ دوانزە لق دابەش بوو تاوەکو بەفەرمانی خوای

گەورە ئەو شەش سەد هەزارکەسە دەربازییان بێت ونەخنکێن، هەروەها زەوییەکەی وشك بوو، دەستبەجێ بوو بەخۆڵ. خوای گەورە دەفەرموێت ] وجاوزنا بني اسرائيل البحر فأتبعه فرعون وجنده بغيا و عدوا حتى إذا ادركه الغرق[ ، زاناکان قسەیەکی جوانیان هەیەودەڵێن فیرعەون ویستی نەبوو بەدوای حەزرەتی موساو بەنی ئیسرائیلدا بڕوات چونکە ئەیزانی شتێکی بەسەردێت، ئەوکاتە فیرعەون لە پێشەوەی لەشکر و سوپاگەورەکەیدابووە، بەفەرمانی خوای گەورە ئەسپەکە لەحیلەی داوە و بەشوێن حەزرەتی موساو بەنی ئیسرائیل ڕایکردووە، کەوفیرعەون کەوتە دوایان هەردەبێ لەشکرەکەی دوای ئەو لەدوای بڕۆن و فەرمانەکەی جێبەجێ بکەن !!...دەستبەجێ خوای گەورە فەرمانی بەئاوی ڕووبارەکەوە کرد کەوەکو خۆی لێبێتەوە و هەرهەموولەشکرەکە بەفیرعەونیشەوەغەرقی دەریا بوون، ئەمەیە گەورەترین موعجیزەی خوای گەورەخۆئەگەر لەم ڕۆژگارەش موعجیزە نەمابێت ئەوا قورئانی پیرۆز گەورەترین موعجزەیە یاخود مێشکی مرۆڤ و زەوی و ئاسمانەکان ئەمانە هەرهەموویان گەورەترین و دیارترین موعجیزەی ئەوخوایە گەورەیەن ) الّذي لا يغفل ولا ينام( ، کە ئاوی ڕووبارگەیشتە نزیك دەم و لووتی فیرعەونی ستەمکار بزانەچی دەڵێت ؟ لێرەوە هەست بەهەڵە و ستەمەکانی خۆی دەکات و دەڵێت ) قال امنتُ أنّه لااله الا ألّذي امن به بنو أسرائيل ( فیرعەون دەڵێ باوەڕم بەوخوایە هێنا کەبەنی ئیسرائیلییەکان باوەڕیان پێهێنا، خوای گەورە پێی ئەفەرموێت : ئێستا باوەڕ بەمن دەهێنیت ؟ کەئەم هەموو سزایەم بۆ ناردی و ئەو هەمووموعجیزەیەم لەڕێی پێغەمبەرەکەمەوە نیشانی تۆ و دارو دەستە ستەمکارەکەت دا، حەزرەتی جوبرائیل بۆ پێغەمبەری ئەگێڕێتەوە لەوکاتەی فیرعەون غەرقی دەریا بوو بەلێشاو ئاوم ئەخستە دەم و قوڕگییەوە نەوەك باوەڕ بهێنێت و خوای گەورەش لێی خۆش ببێت، و حەزرەتی جوبرائیل بۆ پێغەمبەری ئەگێڕێتەوە ئەوەندە ڕقم لە فیرعەونی ستەمکاربووە ترساوم لەوەی خوای گەورە تەوبەکەی قەبوڵ بکات و لێی خۆش بێت!!!!...

کەواتە لێرەوە بزانن تەوبە لەسەر کەسێك قەبوڵ نییە کەسەرتا پای ژیان و هەڵس و کەوتی ستەمکارانە بووبێت و دژی فەرمانەکانی خوا جووڵابێتەوەو فەسادی بڵاو کردبێتەوە وشیرك و هاوبەشی بۆخوای گەورە پەیدا کردبێت چۆن کۆتاییەکەی خێر ئەبێت، پاشان خوای گەورە بەفیرعەونی فەرموو ]واليوم ننجيك ببدنك لتكون لمن خلفك اية وإن كثيرا من الناس عن اياتنا غافلون [ ئەمە بڕیاری خوایە و هاتەجێ ئێستاش لاشەی فیرعەونی ستەمکاروەکو خۆی ماوە و نابێت بڕزێت بۆئەوەی ببێت بە پەند و عیبرەت بۆ هەموو ستەمکــــــــــــارێکی دوای خۆی، ئەی ئەوەتا نییە سەدان و هەزاران ستەمکارو تاغوتی زەمانە لەدوای فیرعەون هاتوون ودژایەتی ئایین دەکەن و خەڵکان دەچەوسێننەوەو، کۆمەڵکوژی بەرپا دەکەن و مافی ئافرەت زەوت ئەکەن و گەنجان لەسێدارەئەدەن و تەنانەت بەچەکی ناووکی ولآتانی تر ئیبادە دەکەن و لەناوی دەبەن، خۆئەمانە لاشەی فیرعەونییان بینیوەو دەشزانن کەئەمە ستەمکارەکەی زیاتر لەچوارهەزارساڵ بەر لەئێستایە و تەرمەکەی وەکو خۆی ماوە، ) مانەوەی لاشەی فیرعەون وەکو خۆی موعجیزەیەکی خوایە بۆ ئەم ڕۆژگارەو پێتدەڵێت و وەکومن یاخی مەبە و ستەم مەکە و دژایەتی ئایین و ئیسلامەتی مەکەو لەخوابترسە.(

ەستەی,

جەستەی فیرعەونی ستەمکار

کەحەزرەتی موسا و گەلەکەی دیمەنی خنکانی فیرعەون و دارو دەستەکەیان بینی لەڕووبارەکە پەڕینەوە ئەودیو و بەنی ئیسرائیلییەکان لەشوێنێکی دوای ئاوەکە چاویان بەگەلێك کەوت کە بتیان ئەپەرست، ڕوویان لەحەزرەتی

موسا كرد كەوەكو خواى ئەوان خوايەكيان لەبت بۆبتاشێت تاوەكو بيپەرستن !!!..سەيرى ناپاكێتى ئەم بەنى ئيسرائيلييە؟ ئەوان خۆنەوەى يەعقوب پێغەمبەرن و باشيش دەزانن كەحەزرەتى موسا پێغەمبەرى خوايە ولەژێر دەستى فيرعەون و دەست و پێوەندەكەى ڕزگارى كردن كەچى لەم كاتەدا گومرا ئەبن وهەڵئەگەڕێنەوە!!!!....

وَإِذْ آَتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَالْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ (53) وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنْفُسَكُمْ بِاتِّخَاذِكُمُ الْعِجْلَ فَتُوبُوا إِلَى بَارِئِكُمْ فَاقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ عِنْدَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (54) وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَى لَنْ نُؤْمِنَ لَكَ حَتَّى نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ الصَّاعِقَةُ وَأَنْتُمْ تَنْظُرُونَ (55)

ثُمَّ بَعَثْنَاكُمْ مِنْ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (56) وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ وَأَنْزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ(57)

وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُوا هَذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطَّةٌ نَغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ (58) فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا قَوْلًا غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ فَأَنْزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا رِجْزًا مِنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ (59) طه..

خۆئەمان پێشتر موعجيزاتەكانيان بينى و هەر نۆ ئاياتەكەى خواى گەورەيان بينى كە بۆ حەزرەتى موساى نارد و ئەو بەنى ئيسرائيلييەى لە سزاكانى فيرعەون پاراست و بەدوورى گرتن كە بۆماڵەكانى فيرعەونى ئەنارد وەكو خوێن بارين ولافاوو ئەسپێ و هتد.....لێرەوە ئەركى سەرشانى حەزرەتى موسا سەلامى خواى گەورەى لەسەربێت قوڕستر وگرانتر دەبێت، خواى گەورە فەرمانى پێكردن كەبەرەو ( بڕۆن كەلەسينا نزيكە، وادى المقدس گوى ) و خوا فەرمانى بەحەزرەتى موسا كرد لەشاخێكى ئەو شوێنە دەبێت بۆماوەى سى ڕۆژ بمێنيتەوە و دەبێ بەڕۆژووش بيت و ئنجا تەوراتت بۆ ئەنێرمە خوارەوە .حەزرەتى موسا بۆ بەنى ئيسرائيل باسەكە دەگێڕێتەوە ودەفەرمووێت : من لەگەڵ خواى گەورە مەوعيدم هەيەو دەبێت لەلاتان بڕۆم و حەزرەتى هارون لەلاى بەنى ئيسرائيل جێدەهێڵێت، حەزرەتى موسا زۆر بەپەلە دەڕوات بەدەم مەوعيدەكەوە و خواى گەورە پێى دەفەرمووێت بۆبەوشێوەيە و بەپەلە هاتيتە ئێرە ؟ وَمَا أَعْجَلَكَ عَنْ قَوْمِكَ يَا مُوسَى ، قَالَ هُمْ أُولَاءِ عَلَى أَثَرِي وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَى ....حەزرەتى موسا بڕيارەكەى خوا بەجێدەهێنێت و بۆماوەى سى ڕۆژ لەشاخەكە ئەمێنێتەوە و بەردەوام لەگەڵ خواى گەورەدا لەگفتوگۆدايە، دەگاتە سيهەمين ڕۆژ ڕۆژووەكەى ئەشكێنێت و خواى گەورەش پێى ئەفەرمووێت بۆ ڕۆژووەكەت شكاندئەى موسا خۆمن فەرمانم پێنەكردى ؟ئەويش ئەفەرمووێت : لەبەر بۆنى دەمم شكاندم ، خواى گەورەش پێى دەفەرمووێت : ئەى نازانى خۆشترين بۆن لاى من بۆنى دەمى بەڕۆژووبووانە؟ پاشان خواى گەورە پێى دەفەرمووێت : مادام بڕيارەكەى منت شكاند دەبێ دە ڕۆژى تر بەڕۆژووبيتەوە، حەزرەتى موساش زۆرلاى ئاساييە چونكە حەزدەكات بەردەوام لەگەڵ خواى گەورە قسەبكات و چونكە زۆر تامەزرۆى قسە كردنە لەگەڵ خواى گەورە.حەزرەتى موسا دەڕۆژى تر لەشاخەكە مايەوەو خەريكى وتوێژە لەگەڵ خواى گەورەلەولايشەوە بەنى ئيسرائيل وتيان :دەڕۆژ ڕەتيداوە و حەزرەتى موسا نەگەڕايەوە و پەيمانەكەى نەگەياندە سەر، لەوكاتە ئاڵتون و زێڕى فيرعەونەكان لاى ئافرەتەكانى بەنى ئيسرائيل دەبێت و خۆيانيان پێ ئارايشت داوە .

كەسێكيان لەناوە بەناوى ) سامێرى ( و پێيان دەڵێت ڕەنگە بەهۆى ئەو زێڕەوە كە ئەمانەتێكى فيرعەونەكانە و لاى ژنەكانى ئێمەيە ڕەنگە بەهۆيەوە دووچارى ئەو موسيبەتە بووبين و بەهۆيەوەش موسا لەناومان نەما !!!.. سامێرى پێيان دەڵێت : با ئەو ئاڵتوو ن وزێڕانە بسووتێنين و پاشان بيپەرستين، هەندێك لەزانايان دەگێڕنەوە كە سامێرى بەهرەيەكى هەبووە ئەويش ئەوەيە جوبرائيل و شوێن پێى ئەسپەكەى حەزرەتى جوبرائيلى بينيوە، ئەسپەكەى

جوبرائیل پێیەکانی بەرز کردۆتەوە و، خستوویەتی شوێن چاڵەکەی کەسامیری بەبەنی ئیسرائیلی وت کەزێڕەکـەی تیادا بسووتێنن، بەفەرمانی خوای گەورە شوێن پێی ئەسپەکەی حەزرەتی جبریل لەچاڵەکە دەرچووە و، بەفەرمانی خوای گەورەلەشوێنی ماددەی زێڕەکە دەنگێك دەرچووە ) فأصبح لە خوار ( ئەم دەنگـە بـۆ ئـەوان بـووە فرسـەتێك تـاوەکو بڵێن ئەمە خواکەمانە وهاتەقسەکردن و بیپەرستین، لەم نێوەندەدا حـەزرەتی هـارون نـەیزانی چـیبکات، لەشەش سەد هەزار کەس تەنها حەفتا کەسێك باوەڕ بە هارون دەهێنن و بەقسەی دەکەن!!..و ئەوانی تر بـەگوێی سامیری ئەکەن و پەنا دەبەنە بەرپەرستنی مانگایەك و بەخوایەکی خۆیانی دائەنێن، هێشتا حەزرەتی موسـا بـەم کارە ئاگادارنییە و لە خەڵوە دایە و خەریکی قسەکردنە لەگەڵ خوای گـەورە، حـەزرەتی موسـا ئەوەنـدە لـەززەت لەوتوێژو قسەکان وەرئەگرێت کەلەگەڵ خوای گەورە لەقسەکردندایەو ئنجا داوا لە خوای گەورە دەکات کەدەمـەوێ بتبینم و خۆتم پێ پیشان بدەی، خوای گەورە فەرمووی ناتوانی بمبینیت، بەلاّم ئەو لەسەر داواکەی هەر مکـووڕە .
خوای گەورە پێی فەرموو :ئەی موسا سەیری ئەم شاخەی دواوەت بکە، کە ئاوڕ ئەداتەوە نوور و ڕۆشنایی خوای گەورە لەشاخەکە ئەدات و یەکسەر حەزرەتی موسا ئەبوورێتەوە و لەهۆش خۆی دەچێت ) وخرّ موسی صعِقا ( کـە کاتێـك بەهۆش خۆی هاتەوەفەرمووی ) خوایە گیان بمبوورە وتەوبەم کرد و باوەڕم پێتهێنا ... (
ئەوەتا حەزرەتی عائیشە ڕوو لە پێغەمبەری پێشەوا ئەکات و پێی ئەفەرمووێت : ئەی پێغەمبـەری خـوا لەشـەوی ئیسراو میعراجدا خوای گەورەت بینی ؟ پێغەمبەری ئازیزیش سەلام ورەحمەتی خوای گەورەی لەسەربێت دەفەرمووێت :تەنها نور وڕووناکی خوای گەورەم بینی و ئەوەندە نوربووتاچاو حـەزی دەکـرد زیـاتر و زێـتر چـاوی بـەونوورە بکەوێت.
دوای نزاکانی حەزرەتی موسا خوای گەورە تەوراتی بۆنارد و هەندێك لـەزاناکان دەڵـێن لەوحـەکان لەسـەر بـەرد نووسرابوونەوە، خوای گەورە فەرمانی بەحەزرەتی موسا کرد کەبۆلای بەنی ئیسرائیلیەکان بگەڕێتەوە .کە گەڕایەوە ناویان دەبینێت بەنی ئیسرائیل ئەویان هەر لەیادنەماوە و وا مانگایەکی زێڕین دەپەرستن، حەزرەتی موسا تـووڕە ئەبێت و ڕیشی حەزرەتی هارونی براکەی ڕائەکێشێت و لێی تـووڕە ئـەبێت، ئنجـا حـەزرەتی موسـا داوای لێکـردن کەتەوبە بکەن، تەوبەکەش چۆنە و بەچ شێوەیەکە ؟ دەبێ خۆیان بکوژن، وە ئەوکەسەی تەوبەکەی قـەبووڵ بێـت دەمرێت و دەکوژرێت ) وتوبوا الى بارئکم واقتلوا انفسکم...(
فَرجَعَ مُوسَى إِلَى قَومه غضبَانَ أَسفًا قَالَ يَا قَومِ أَلَمْ يَعدكُمْ رَبُّكُمْ وَعْدًا حَسَنًا أَفطَالَ عَلَيْكُمُ الْعَهْدُ أَمْ أَرَدْتُمْ أَنْ يَحِلَّ
عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِنْ رَبِّكُمْ فَأَخْلَفْتُمْ مَوْعِدِي (86) قَالُوا مَا أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا وَلَكِنَّا حُمِّلْنَا أَوْزَارًا مِنْ زِينَةِ الْقَوْمِ
فَقَذَفْنَاهَا فَكَذَلِكَ أَلْقَى السَّامِرِيُّ (87) فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَهُ خُوَارٌ فَقَالُوا هَذَا إِلَهُكُمْ وَإِلَهُ مُوسَى فَنَسِيَ (88)
أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا (89) وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَارُونُ مِنْ قَبْلُ يَا قَوْمِ إِنَّمَا فُتِنْتُمْ
بِهِ وَإِنَّ رَبَّكُمُ الرَّحْمَنُ فَاتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوا أَمْرِي (90) قَالُوا لَنْ نَبْرَحَ عَلَيْهِ عَاكِفِينَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَى (91) قَالَ
يَا هَارُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوا (92) أَلَّا تَتَّبِعَنِ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِي (93) قَالَ يَا ابْنَ أُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلَا بِرَأْسِي
إِنِّي خَشِيتُ أَنْ تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي (94) قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَا سَامِرِيُّ (95) قَالَ بَصُرْتُ
بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا بِهِ فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِنْ أَثَرِ الرَّسُولِ فَنَبَذْتُهَا وَكَذَلِكَ سَوَّلَتْ لِي نَفْسِي (96) قَالَ فَاذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِي
الْحَيَاةِ أَنْ تَقُولَ لَا مِسَاسَ وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَنْ تُخْلَفَهُ وَانْظُرْ إِلَى إِلَهِكَ الَّذِي ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا لَنُحَرِّقَنَّهُ ثُمَّ لَنَنْسِفَنَّهُ فِي
الْيَمِّ نَسْفًا (97) إِنَّمَا إِلَهُكُمُ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَسِعَ كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا (98) كَذَلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنْبَاءِ مَا قَدْ
سَبَقَ وَقَدْ آتَيْنَاكَ مِنْ لَدُنَّا ذِكْرًا (99) مَنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُ يَحْمِلُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وِزْرًا (100) خَالِدِينَ فِيهِ وَسَاءَ لَهُمْ

يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِمْلًا ...(101) طه.

ئێمەش هەرچەندی گوناهباربین و سەرپێچیمان لەبڕیارەکانی خواو پێغەمبەرەکەی  کردبێت بـەلآم هێـشتا خـوای گەورە بەڕەحم و بەزەییە بەرامبەرمان ئەوەتا هەمووشەوێك خوای گەورە دێتە ئاسمانەکانی خوارەوە و دەفەرمووێت ] هل من تائب فــــــأتوب له[ ، سەیری لێبووردەیی خوای گەورە بکە بانگی بەندەیەکی زەلیل و گوناهباردەکات بۆ لێخۆشبوون و مەرحەمەتی خۆی، یاخود خوای گەورە لەفەرموودەی قودسیدا فەرموویەتی تاوان و گوناهەکانی نەوەی ئادەم هەرچەندەی زۆربن و بگەنە بەرزایی ئاسمانەکان و دڵنیابێت تەوبە بکات کەلێی خۆش دەبم، ئەوابێگومان لێ خۆش ئەبم و ئەیخەمە ژێر رەحمەتی خۆمەوە، بۆیە پێویستە ئێمە وەکـو گـەلانی پێـشوو نەکـەین و بـەتاوان و ڕووڕەشی و حەرام خواردن و شەڕکردنمان لەدژی ئایینی خواو ڕێبازەکەی پێغەمبـەر نەچـینە بـەردەم قـاپی خـوای گەورە.

با بەتەوبە و ئیستغفار و ڕووسپییەوە بچینە حزوری خوای گەورە چونکە خوای گەورە تەوبەکارانی خـۆش دەوێـت، لەئێستاوە با پەیمان لەگەڵ خوای گەورە نـوێ بکەینــەوە و بڵـێین خودایــە ئەواتەوبــەمان کـرد و بـەرەو لای تـۆ گەڕاینەوە و لێمان خۆشببە و سەرفرازمان بکەو لەتاوان و گوناهەکانمان خۆش ببە و تۆ خـوای ئێمـەی و ئێمـەش بەندەی لاواز و بێ دەسەلآتی تۆین، متمانەتان هەبێت بەو تەوبەیە و گەڕانەوەیە خوا لێمان خۆش ئەبێت و لەبری ئەو تەوبەیە و وازهێنان لەگوناهو تاوان خوای گەورە لێمان دەبوورێت و پاداشـتمان بەهەشـتی نـەبڕاوە ئـەبێت .

حەزرەتی موسا لەوحەکە بۆ بەنی ئیسرائیل دەهێنێت و پێیان دەفەرموێت ئەی بەنی ئیـسرائیل ئەمـە تەوراتــە و لەلایەن خواوە بۆم هاتووە و ئیتر پەیڕەوی بکەن و پشتگوێی مەخەن، بەنی ئیسرائیلییەکانیش و تیان ) سمیعنـا و عصینا....(

گوێمان لێتگرت بەلآم بەگوێت ناکەین و وازمان لێبێنە !!!!...بەم شێوەیە حەزرەتی موسا سەلامی خـوای گـەورەی لێبێت لەناویان ئەمێنێتەوە و چەندین موعجیزاتی تری خوای گەورەیان پێ نیشان ئەدات تاوەکو وەفـات ئـەکات، بەلآم بەنی ئیسرائیل دوای بینینی ئەم هەموو موعجیزاتە و لەناوچوونی فیرعـەون و مردنـی سـامیری و دابـەزینی تەورات لەلایەن خواوە بۆیان هەر باوەڕ ناهێنن و بەردەوام دەبن لەسەر شیرك و گوناهو تاوانەکانیان ....ئنجا هەر ڕۆژە و بەجۆرێك حەزرەتی موسا سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت ئەزیەت ئـەدرا، دواتـر حـەزرەتی موسـا پـەنجا کەسیانی هەڵبژارد و لەگەڵ خۆی بۆسەرکێوی ) طور ( بردن، کە ئەم پەنجا کەسەیان لـەوانی تـر باشـتر بـوون و باوەڕیان نوێ کردەوە ...لەکاتی گەیشتنیان بۆ سەرکێوەکە بـە حـەزرەتی موسـایان وت : بـاوەڕ نـاهێنین تـاوەکو خواکەت نەبینین !!!...حەزرەتی موساش جارێکی تر پێی وتن : لەخوا بترسن و خوای گەورە بناسن، هیچ کەڵکێکی نەبوو و گوێیان پێنەدا تاوەکو خوای گەورە فەرمانی کرد کە گیانی هەر پەنجا کەسەکە بکێشرێت و دەستبەجێ لـە شوێنی خۆیان مردن...

حەزرەتی موسا کەوتە پاڕانەوە و فەرمووی : ئەی خوایە ئەمانە لەگەڵ من بەمەبەستی پەرستنی تۆ هاتن بۆ سـەر ئەم کێوە، ئەی ئێستا چ وەلآمێکی بەنی ئیسرائیلیەکان بدەمەوە کە ئەمانە لە چاکەکانیان بوون!!!؟؟؟ ئەی خوایە تکاکارم زیندوویان بکەیتەوە و ڕۆحەکانیان بۆبگەڕێنیتەوە جەستەکانیان، خوای گەورەش نزاکـەی قـەبوڵ کـرد و یەك لەدوای یەك زیندوو بوونەوە و هەریەکەیان دیمەنی زیندووبوونەوەی ئەوی تری ئـەبینی !!!.. جـارێکی تـر باوەڕتان هێنایەوە و لەگەڵ حەزرەتی موسا لەسەر کێوەکە دابەزینە خـوارەوە و گەڕانـەوە نـاو بـەنی ئیـسرائیل، جارێکی تر پشتیان لەحەزرەتی موسا کردەوە و وازیان لەباوەڕەکەیان هێنا !!!.ئەمجارەشـیان کەوتنــەوە خـۆ بـۆ

دژایەتیکردنی ئەوپێغەمبەرە، لێرەدا خوای گەورە بەبەرچاوی هەرهەموویان کێوی ) گور ( ی بەسەر سەریان بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و لەسەر سەری هەموویانی راگرت، گەر تۆبە نەکەن و دەسبەرداری تاوان و گوناهو سەرپێچییەکانیان نەبن ئەوا ئەیدات بەسەرسەریانەوە !!!...

ئەمە پیشەی جوولەکەکانە لەهەموو سەردەمێکدا، خاوەنی پەیمانی خۆیان نین و بەرژەوەندییەکانیان لەپێشەوەی هەموو ئامانجێکیانە و بەبەردەوام چاو لەراستییەکان ئەپۆشن و لەگەڵ خوا و پێغەمبەر و کەسانی تر راست ناکەن و خیانەت ئەکەن.

گەیشتە ئەو ئاستەی کەبەنی ئیسرائیل نەیانتوانی فەرمانەکانی خوای گەورە جێ بەجێ بکەن و پابەندی تەورات بن کە خوای گەورە بۆ حەزرەتی موسای نارد، خوای گەورە بە حەزرەتی موسای راگەیاند ماوەی چل ساڵان خاوەن وڵات نابن و لەشوێنێك ئۆقرە ناگرن و جێگیر نابن.خواردنی بەنی ئیسرائیل ) من و سلوی ( بوو، ) من ( خواردنی شیرین بوون بەشێوەی باران ) سلوی ( ش، باڵندەیەك بوو ئەیانگرت و ئەیانخوارد ...ئاویش بەردێکی گەورەیان لەگەڵ خۆیان ئەگێڕا و دوانزە کونی تیابوو، هەر هۆزێك بەشی خۆی بەردەکەوت کەژمارەیان دوانزە تیرەبوون، ئەمەش خۆی لەخۆیدا موعجیزەیەکی گەورەبوو لەبەرئەوەی ئەم چینە کەلەگەڵ حەزرەتی موسادا بوون بەکەڵکی پێشەنگیی و لەکۆڵ گتنی پەیام نەدەهاتن، خوای گەورە لەماوەی ئەو چل ساڵەدا پێشەنگیی لێسەندنەوە و نەبوون بەخاوەنی خاك و وڵات و هەر رۆژەی لەشوێنێك دائەمەزران و شوێنێکی جێگیریان نەبوو!!!...

حەزرەتی موسا سەلامی خوای گەورە لێبێت بەرلە وەفاتکردنی وەسیەتی کرد کە تەرمەکەی لە قودس بنێژرێت، ژیانی پڕ ماندوو بوون و ئەزیەت کێشانی حەزرەتی موسا بەکۆتا هات و دوای ئەویش پێغەمبەرێکی تر ئەم پەیامە بەرز و پیرۆزە هەڵدەگرێت بۆ بەجێگەیاندنی کارە گرنگەکانی خوای گەورە لەسەر زەوی.

*                    *                    *

پێغەمبەر داود سەلامی خودای لەسەر بێت:

أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلَإِ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنْ بَعْدِ مُوسَى إِذْ قَالُوا لِنَبِيٍّ لَهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلَّا تُقَاتِلُوا قَالُوا وَمَا لَنَا أَلَّا نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِنْ دِيَارِنَا وَأَبْنَائِنَا فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْا إِلَّا قَلِيلًا مِنْهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ (246) وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا قَالُوا أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِنَ الْمَالِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (247) وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَى وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلَائِكَةُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ (248) فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُمْ بِنَهَرٍ فَمَنْ شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَنْ لَمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلَّا مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ فَشَرِبُوا مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِنْهُمْ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ قَالُوا لَا طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُمْ مُلَاقُو اللَّهِ كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ (249) وَلَمَّا بَرَزُوا لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالُوا رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ (250) فَهَزَمُوهُمْ بِإِذْنِ اللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُودُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَفَسَدَتِ الْأَرْضُ وَلَكِنَّ اللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ ... البقرة.

پێغەمبەری پێشەوامان فەرموویەتی :هیچ رۆژێك لە رۆژان بەنی ئیسرائیل بێ پێغەمبەر نەبووینەو بە بەردەوامی

خواى گەورە پێغەمبەرى بۆ ناردوون ، هێشتا پێغەمبەرێكى تر لە ژیانداما بوو خودا پێغەمبەرێكى ترى بۆ دەناردن . داب و نەریتى ئەوساى جوولەكەكان وابووە كە دەكەوتنە خۆشحاڵى و گەیشتن بـە هـەموو شـتێك ئـەوا راسـتەوخۆ دەستیان دەچووە خوێنى پێغەمبەرێك و شەهیدیان دەكرد .. زۆربەى پێغەمبەرانى خودا قوربانى دەستى جوولەكەكان بووینە و تەنانەت بە گوێرەى هەندێك ریوایەت لە رۆژێكدا سێ پێغەمبەریان شەهید كردووە.

لە هەموولایەك لەنێو جولەكەكان تاوان و فەساد تەشەنەى كردبوو و لە بەرامبەردا خوداى گەورە بە چینێك ئازارى دان كە بە ) عمالیقة ( ناسراو بـوون ، گـەورەترین شـەڕ لـە نێـوان جوولەكـەكان و عەمالیقـەكان هەڵگیرسـا و عەمالیقەكان زۆر بە هێز و پتە وو باڵا بەرز بووینە . گەیشتە ئەو رادەیەى تابوتیان برد كە لە قورئانـدا خـواى گەرە ئاماژەى پێكردووە ، ئەو تابوتە وەكو تابوتى مردوو وابوو كۆمەڵێك شتى تێدابوو وەكو جل و بەرگى حەزرەتى موسا و لەوحەكانى تەورات كە خوداى بالآدەست بۆى هەناردبوو ، لەگەڵ گۆچانەكەى حەزرەتى موساو هەندێ كەل و پەلى هارون سەلامى خودایـان لەسـەر بێـت، بـەنى ئیسرائیل بـۆ هەرشـوێنێك رۆیـشتبانا تابوتەكـەیان وەك تەبەڕوكێك لەگەڵ خۆیان ئەیانبرد.

تابوتەكە لەلایەن ئیسرائیلیەكان پارێزراو بوو هەركاتێ دووچارى گرفت و كێشەیەك بوونایـە ئـەوا روویـان لـەو تابوتە دەكرد و وەك كالآیـەكى پـیرۆز بـەكاریان ئـەهێنا ، تەنانـەت لـەكاتى شـەڕو رووبەڕووبونـەوە لەگـەڵ بەرامبەرەكانیان لەگەڵ خۆیان دەیانبردە سەنگەرەكانى شەڕ..

سەرەنجام عەمالیقەكان تابوتەكەیان لە بەنى ئیسرائیل بردو زۆریشیان لێ كوشـتن و لـە قودسـیش دەریانكردنـە دەرەوە ، و پەرتەوازە بوون و پاشاكەیان لە پێغەمبەر جیابۆوە.

هیچ پێغەمبەرێكیش لەو سەردەمە پەیوەندییان بە موڵك و سامانى پاشاكانەوە نەبووە ، دواى ئەوە پێغەمبەرێكیان بۆهات ناوى ) شەمۆئیل یاخود شەمعون ( بوو ، داوایان لەو پێغەمبەرە كرد كە شەڕێك دەكەن و دەبێ هاریكارییـان بكات بۆ گەڕاندنەوەى تابوتەكە كە دروشمى عیززەت و شانازى بەنى ئیسرائیل بووە ، حەزرەتى شەمۆئیلیش پێـى وتن : ئەى ئەگەر شەڕەكە هەڵگیرسا و ئێوە نەتانكرد و پاشەكشەتان كرد ؟ وتیان چۆن شەڕ ناكەین ئـەى نـابینى تەنانەت لە شارەكەى خۆشمان دەركراوین و پەڕاگەندەبووین ] .. فلما كتب علیهم القتال تولوا [ شـەڕەكەیان نەكرد.

دواتر پێغەمبەر شەمۆئیل پێى وتن : كە بەم زووانە خودا پاشایەكتان بۆ دەنێرێت كـە نـاوى ) گـالوت ( ە ، ئـەو تالوتە لەناو خۆیانە و كەسێكى هەژارو دەستكورت و پیشەى ) دەبـاغ( ى، ئـەكات واتـە كـارو پیـشەى پێـستەى گیانەوەرە و چاكى دەكات و دەیفرۆشێت .. بەڵام پیاوێكى زۆر بەهێز و باڵا بەرز و سپى و چاوشین بـووە ، تـابلێى كەسێكى حەكیم و زانستخواز و بە تۆڵە بووە ، ) ان الله قد بعپ لكم گالوت ملیكا . (لە قورئاندا ئاماژەى پێكراوە. ئەوانیش وتیان ) انى یكون الملك علینا ( ، ئەمە چۆن دەبێت بكرێت بە پاشاى ئێمە لەكاتێكـدا نـەماڵى هەیـە و نە پارە ســــامان.. دوایى كەسێك هەیە ناوو ناوبانگێتى تالوتى زانى بێت ؟ ئەمە مەحاڵە و رازى نین لەسەرى.

ئەم پێغەمبەرە وەڵامى دانەوە كە خودا لە ناو ئێوە هەڵیبژاردووە و زانست و زانیارى تەواوى لەلایە ، ] وقال لهـم نبیهم إن ایە ملكە ان یأتیكم التابوت .. [ ئەم جارە پێغەمبەر شەمعون پێـى وتـن : ئایـا رازیـن كـە خـودا خـۆى تابوتەكەتان بۆ بگەڕێنێتەوە ؟ وتیان بەڵێ ؟ پێمان نیشان بدە ؟ بە فـەرمانى خـودا فریـشتەكان ئـەو تابوتـە گەورەیان لە ناو عەمالیقەكان هەڵگرت و بە ئاسماندا بەرزیان كردو گەڕاندیانەوە دەستى جولەكەكان.

پاشان رەزامەندى خۆیان بـە پاشـا بـوونى تـالوت نیـشاندا و نـاوبراو كرابـە سـەركردەى شـەڕێكى گـەورە بـۆ

رزگارکردنەوەی قودس ، لەبری چوار ملیۆن جولەکە تەنها هەشت هەزار شەڕ کەر چوونە ریزی تالوت و خۆیان ئامادەکرد بۆ هێرشکردنە سەر قودس ، ئنجا تالوت رووی لە سوپاکەی کردو پێی وتن : ان الله مبتليكم بنهر ... واتا نزیك ئاوێك دەبینەوە لە نێوان فەلەستین و ئوردەن ، و پێی راگەیاندن ئەوەی لەو ئاوە بخواتەوە لەمن نی یە و ئەوەی نەیخواتەوە لە منە ] . الا من اغتفر غرفه بيديه [ مەگەر بە پێی پێویست و کەمێك خواردنەوە لە ئاوەکە نەبێت بەقەد یەك مشتە دەست . بەڵام بە هۆی ئەم بڕیارەی تالوت سێ سەد و چواردە کەس لە ریزی سوپاکە مانەوە.

خوای گەورە بەندەکانی خۆی تاقیی ئەکاتەوە تاچەند رازین بە فەرمان و بڕیاری پەروەردگار؟ هەروەها چەندە متمانەمان بە یارمەتی خوای گەورە هەیە و کلیلی دەرگای سەرکەوتن لای خوای میهرەبانە و هێز و توانای زۆر و ژمارەزۆری نابنە پێوەر بۆ سەرکەوتن، بەڵکو دڵسۆزی و متمانە بە خوای گەورە سەنگی مەحەکی هەموو کۆمەڵ و کەسێکە بەسەر دوژمنی بەرامبەر ...

بەڵام ئەو ژمارە کەمە خۆڕاگر بوون و هانی تالوتیان دا کە خودا لەگەڵ ئارامگرانە و سەردەکەوین ، سوپاکەی تالوت بەرەو رووی سوپاکەی عەمالیقەکان کەوتنە رێ ، سەرکردەی عەمالیقەکان ناوی جالوتە ، ئەم سەرکردەیە تابلێی کەسێکی بە هێز و لە رادەبەدەر بالاّ بەرزبووە ، کە چاوی بە سوپاکەی تالوت دەکەوێت خەم دایدەگرێت .

ئەوکاتە لەدەستپێکی هەموو شەڕێك بەهێزترین کەسی نێوان هەردوو سوپا هاتۆتە دەرەوە بۆ ئەوەی رووبەرووی یەکتربینەوە و هێز و توانای یەکتریان بۆ دیاربێت ، جالوت دێتە دەرەوە و هاوار دەکات کەسێك بێتە دەرەوە و رووبەرووم بێتەوە ، تالوت لە بەرامبەردا لە ناو سوپاکەی بانگ رادێرێ و دەڵێ کێ ئامادەیە بەرەنگاریی ئەم سەرکردەیە ببێتەوە ؟ کەسێك دەنگ ناکات و چەندین جار دووبارەی دەکاتەوە و وەڵام نابیستێت...

ئەمجارە دەڵێت کێ بەرەنگاری بێتەوە کچەکەی خۆمی پێشکەش ئەکەم ، چونکە تازە بۆتە پاشا و فەرمانڕەوا.

کورتە بالاّیەکی نۆزدە سالاّن لە ریزی سوپاکە دێتە دەرەوە و ئامادەیی خۆی دەردەبڕێ تا بەرەنگاری جالوت بێتەوە .هێشتا داود نەبۆتە پێغەمبەر ئەم داودە کەسێکی تابڵێی سپی و جوان و قژ زەردی چاو شینە و کورتە بالاّیە .. خوداش بە ) نعم العبد و اواب ( ناوی بردووە چونکە ئەوەندە بە هێز و بەغیرەت بووە لەکاتی هێرشبردن باکی لە هیچ هێزێك نەبووە.

دەچێتە بەرامبەر جالوت بەڵام زۆر لە جالوت بچکۆڵەترە و تەنانەت بالاّی داود پێغەمبەر دەگاتە نزیك قاچەکانی جالوت ، لێرەدا جالوت پێی دەڵێ تۆ بگەڕێوە ناو سوپاکەت و حەزناکەم تۆ بکوژم چونکە تۆ زۆر بچووکیت .. حەزرەتی داود پێی دەڵێ : گەڕانەوەم مەحاڵە و دەمەوێ بتکوژم . حەزرەتی داود کیسێکی بەدەستەوەیە و سێ بەردی تیادایە و بە گوریسێك گرێی داوە ، هەردووکیان لەسەر ئەسپ بەرامبەر یەکتری دێن بۆ ئەوەی یەکێکیان ئەوەی تر بکوژێت ، حەزرەتی داود گوریسەکە کە بەردی پێوە بەستراوە زۆر بەخێرایی بە دەوری خۆی ئەسووڕێنێتەوە و زۆر بە هێز لە نێو چەوانی جالوتی ئەدات و جالوتی پاشا لەسەر ئەسپەکەی دەکەوێتە خوارەوە و دەستبەجێ گیانی دەردەچێت ] وقتل داود جالوت. [

سوپاکەی جالوت کە ئەمەیان بینی ورەیان رووخا ، هەرچەندە ژمارەیان هەزاران هەزار شەڕ کەر بوو بەڵام بەرامبەر سێ سەد و چواردە شەڕکەری سوپاکەی تالوت ئۆقرەیان نەما ، لێرەدا حەزرەتی داود بوو بە سەرکردە و مەلیك و سوڵتە و دین تێکەڵی یەکتر بوون ] واتاه الله الملك و علمه مما يشاء [ خوا کردی بە مەلیك و پێغەمبەر و پاشان کچەکەی تالوتی هێنا و کردی بە خێزانی خۆی، لە قورئاندا خوای گەورە زۆر بەروونی و جوانی وەسفی

حەزرەتی داودی کردووە ] واژکر عبدنا داود ژالایدی انـﻪ اواب . [ چـونکە کەسـێکی ئەوەنـدە بەخـشندە و دەسـت ڕۆیشتوو بووە و کۆمەکی و هاریکاری پێشکەش بە هەموو کەسێك کـردووە و بـەردەوام خێـری کـردووە ، و زۆربـەی کاتیش سەری لە کڕنووش دابووە و زۆر دوعـای کردووە و زۆریش خودای خۆشویستووە وەکو پێغەمبەرمان فەرموویەتـی )کان یحب الله کثیرا.. (

بەردەوایش فەروویـەتی ] اللهم ارزقني حبك  وحب من احبك وحب عمل يقرب اليك واجعل حبك الي [ زۆر دوعـای دەکرد و دەلاڵایەوە و دەیفەرموو خودایە داوای خۆشویستنی تۆ دەکەم کە خۆشەویستتر بێت لە ماڵ و مناڵ و لە خۆم ..چەندێ بەکوڵ لەخوای گەورە پاڕاویتەوە کەخۆشتی بوویٚت؟ چەندێکیش بە دوای هۆکارەکانی گەیشتن ماندووبوویت و گەڕاویت تـاوەکو خوای گەورەت خۆش بوویٚت ؟

لەخۆت بپرسە ئاخۆ ناوت لەوناوانەیە کە خوای گـەورە خۆشـی ئـەوێن ؟ ئـاخۆ منـیش خـوای گـەورەم لەهـەموو دروستکراوەکانی تر خۆشتر دەوێت ؟یاخود پارە و پول و ئارەزووەکانی خۆم لە خواکەم خۆشتر ئەوێت ؟ ئەزانی گـەر خوای خوای گەورە تۆی خۆش بوویٚت ئەبیتە خۆشەویستی هەموو کەس.. ؟؟ !!تەنانەت خۆشەویستی بیٚ گیانەکانیش ؟

لەم سەردەمەی ئێستادا خۆشەویستی ) ماددە ( و ) دنیا ( زاڵترە بەسەر بەندەکان خـالیق و بەدیهێنـەری دنیامـان لەبیرچووە !!.نیشانەی خۆشویستنی خوای گەورە لەوەدایە کـە ئـایین و فەرمانـەکانیت خـۆش بوویٚـت و پـەیڕەوی بکەیت، و خۆت لەحەرام و دەرچوون لەسنووری شەرع و خوای گەورە چی پیٚ خۆشە تۆش بەوشـێوەیە بیـت و خۆشـت بوویٚت، فەرمانەکانیشی جێبەجیٚ بکەیت ئەوا ئەوپەڕی خۆشەویستییە...
هەروەها گەورەترین نیشانەی خۆشەویستی خوای گەورە بۆ بەندەکەی ئەوەیە کە هەوڵت دابیٚ یان هەوڵ بدەی کەلای خەڵکان خوای گەورە خۆشەویست بکەیت !!..نەکەی کارێکی وابکەی بەهۆی تۆوە خەڵکان پشت لە ئـایینی پـیرۆزی ئیسلام بکەن، چونکە بەوهۆیە گوناهبار ئەبیت و گوناهی ئەو کەسەش دەکەوێتە سەرشـانی تـۆ و خـوای گـەورەش لەخۆت دەڕە نجێنیت.

خوای گەورە زەبوری بۆ نارد ] واتینا داود زبورا [ لەمێژووی دنیـادا کەسـێك نـەبووە لـە دەنـگ خۆشـی هاوتـای حەزرەتی داود بوویٚت چونکە دەنگێکی فرە خۆشی هەبووە ، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویٚت کـە کاتێـك حەزرەتی داود زەبوری دەخوێند هەموو چیاکان لەگەڵ دەنگی دەهاتنە جووڵە و تەسبیحاتی خوایان دەکرد و هـەموو باڵندەیەکی ئاسمان بەدەوری دەسووڕانەوە و سوبحانەللأیان دەکرد .. جگە لەوەی لەشەوەوە تاوەکو تابەیانی لەگەڵ حەزرەتی داود چیاو شاخ و باڵندەکان جمەیان دەهات و زیکر و تەسبیـــــــــــحاتی خوایان دەکرد ] والطير محشورة كل له اواب... [

ئەمجارەیان خودای گەورە موعجیزەیەکی تری پێبەخشی ئەویش نەرم کردنی ئاسـنە ، سـوبحانەللاٚ ئاسـن لەبـەر دەستی حەزرەتی داود وەکو هەویر وابووە و زۆر بە ئاسانی کاری پێکردووە و نەرمی کردووە ، جگـە لـەوەی ) درع ( واتە جلێکی ئاسنینی دروستکرد بۆ کاتی جەنگ کە نە شمشێر و نە ڕم زەرەری بە لەشی جەنگاوەرەکە نەدەگەیاند .. چونکە خودا خۆی فێری کرد کە لە ئەڵقە ئەڵقەی بچووك دروستی بکات و بە یەکترییەوە بیانبەستێتەوە ، لیٚـرەوە خودا فێرت دەکات کە دەبیٚ هەوڵ بدەی فێری داهێنان و شت دروستکردن ببیت] علمناه صنعة لبوس . [ جگە لـەوەی کەسێکی زۆر حەکیم و عەلیم و زاناو عابید و دانا بووە ، لە کۆشکەکەیا کاتی خۆی دابەش کردبوو بۆ شەونوێژ بـۆ تەسبیحات بۆ ئاشتەوایی بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ خەڵکان..

لەو کاتەی لە میحرابەکەیا خەریکی زیکر و تەسبیحاتی خودایە دوو کەس دێنە لای و گرفتێکیان هەیە یەکێکیان دەڵێ : من خاوەن تاکە مەڕێکم و ئەمەشیان نەوەد و نۆ مەڕی هەیە و داوای لێکردووم تا مەڕەکەی پێبدەم و بۆم بەخێو بکات ئێستاش داوای هەقی خۆم دەکەم و مەڕەکەم بداتەوە و بەڵام نایداتەوە ؟ حەزرەتی داودیش دەفەرمووێت : ئەوە زوڵمی لێتکردووە و دەبێت بۆت بگەڕێنێتەوە ، لەهەندێ ریوایەتدا هاتووە دەستبەجێ دوو کەسەکە لەبەردەم حەزرەتی داودا ون بوون کە فریشتە بوون و خودا بۆ ئەوەی ناردوون تاوەکو حەزرەتی داود لەم کێشەیە تاقی بکاتەوە..

پاشان کە قسەی یەکێکیانی وەرگرت و کەزانی ئەمە تاقیکردنەوەیەکی خودایە دەستبەجێ داوای لێخۆشبوون و ئیستغفاری کرد ، و راستەوخۆ سەری برد بۆ کڕنووش و خودا لێی خۆشبوو..

ئەمجارە خوا وەحی بۆ ناردو پێی فەرموو ] یا داود انا جعلناك خليفة في الارض فاحكم بين الناس بالعدل . [ هەروەها رۆژێك نا رۆژێك بە رۆژووبووە و شەوانیش بەر لەوەی بچێتە ناو جێگاکەی بەردەوام نوێژی کردووە و داوای ئیستغفاری دەکرد پێغەمبەری ئازیز دەفەرمووێت : خۆشەویستترین رۆژوو لای خوای گەورە رۆژووی حەزرەتی داود بووە، هەموو کاتەکانی دابەش دەکرد بۆ هەموو بوارێك. لەم رۆژگارەشدا ئەوانەی شوکری نیعمەتەکانی خوای گەورە دەکەن بە پەنجەی‌دەست دەژمێردرێن و ژمارەیان کەمە، یاخود کەسی واهەیە هیچ خشتەیەکی ئەوتۆوی نییە بۆ دابەشکردنی کارەکانی رۆژانەی بەردەوام لەبیێ فەرمانی خوای گەورە دایە و ئامادەیە تابەرەبەیان بەدیار هۆکارەکانی راگەیاندن دابنیشێت کەچی ئامادەنییە شەونوێژێك و سوننەتێکی پێغەمبەر بەجێ نەگەیەنێت ].اعملوا ال داود شكرا [ سەیرکە خودا سەدان نیعمەتی پێبەخشیوە ئەو هەر لە شوکرانەی نیعمەتەکان بێدەنگ نەبووە و کەسێکی ئەوەندە شوکرانەبژێربووە ، دەگێڕنەوە رۆژێك پیاوێك دێتە ناو کۆشکی حەزرەتی داودە وە ، زۆر سەیرە کە ئەم پیاوە لە کوێ هاتۆتە ژوورەوە چونکە دیواری کۆشکەکەی ئەوەندە بەرز بووە کەس نەیتوانیوە بچێتە ناوەوەی کۆشکەکەیەوە ، هەواڵ دەگاتە حەزرەتی داود کە کەسێك هاتۆتە ناوەوەی کۆشکەکەت، حەزرەتی داودیش دەچێتە کۆشکەکەی و پرسیار لە کەسەکە دەکات کە تۆ کێیت ؟ ئەویش دەڵێ کاتی مردنت هاتووە .. حەزرەتی داودیش دەڵێت : کەواتە تۆ فریشتەی گیان کێشانی ؟ فەرموو گیانم بکێشە و لەو کاتەدا لەلایەن فریشتەی گیان کێشان رۆحی پیرۆزی دەکێشرێت کەتەمەنی سەد ساڵی تەواوە . و حەزرەتی سولەیمانی کوڕی بچووکە و پێشتر وەسیەتی کردبوو کە لە قودس بینێژن .

حەزرەتی سولەیمان سەلامی خودای گەورەی لەسەربێت، فەرمان بە باڵندەکان دەکات سێبەر بکەن چونکە لەو کاتەی تەرمی حەزرەتی داودیان بۆ قودس دەبرد کەش و هەوا لە رادەبەدەر گەرم بووە و بە فەرمانی حەزرەتی سولەیمان باڵندەکان سەرتاپای بەری خۆر دەگرن و دەیکەن بە سێبەر تا ئەوکاتەی تەرمی حەزرەتی داود لە قودس سپاردەی خاك دەکرێت .. خەڵکەکە توانای رۆیشتنی نەبووە بە دوای تەرمەکە چونکە کەش و هەوا زۆر گەرم بووە وەك پێغەمبەرمان بۆ هاوەڵەکانی دەگێڕێتەوە کە حەزرەتی سولەیمان بە دەست ئیشارەتی بۆ باڵندەکان کرد کە لەشەقەی باڵ بدەن تاوەکو تینی گەرماییەکە بشکێنن و ، وایانکرد و خەڵکەکە لە تینی گەرما رزگاریان بوو ، دوای وەفاتی حەزرەتی داود حەزرەتی سولەیمان شوێنی گرتەوە و بوو بە پێغەمبەری خوای گەورە ... پێغەمبەر دەفەرمووێت لەبە هەشتا حەزرەتی داود علیە السلام بە دەنگە خۆشەکەی قورئان بۆ ئیمانداران ئەخوێنێت..

یەکێ لە نزاکانی حەزرەتی داود ئەوەبووە کە بەردەوام دەیفەرموو :خۆشەویستی خۆت و ئەو کەسانەم پێببەخشە کە خۆشیانت ئەوێت، کەواتە تۆش بۆ ئەم نزا و داواکارییە لەخوای گەورە ناکەیتە گەورەترین ئامانجت، لەگەڵ ئەو

کەسانەش هەڵس و کەوت بکە کە خوای گەورە خۆشیانی ئەوێت و بەردەوام لەگەڵیانە و لێیان جیانابێتەوە، بەتایبەت ئەو گەنجانە چ کوڕ چ کچ نزای لەم شێوەیە بکەن و بڵێن : خوایە هاوسەرێکم پێببەخشیت تۆی خۆش بووێت و منیشی خۆش بووێت.چەندە ئاسوودە و بەختەوەرە ئەو خێزانەی کە خوای گەورەیان خۆش ئەوێت، باش بزانە گەر خوای گەورە هاوسەرەکەتی خۆش ویست ئەوا بێگومان تۆشی خۆش دەوێت و لەیادت ناکات .

*　　　　　　　　　　　　　　　　*

*

**پێغەمبەر سولەیمان سەلامی خودای لەسەربێت:**

وَسُلَيْمَانَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِي الْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَاهِدِينَ (78) فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ وَكُلًّا آَتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُودَ الْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَالطَّيْرَ وَكُنَّا فَاعِلِينَ (79) وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَكُمْ لِتُحْصِنَكُمْ مِنْ بَأْسِكُمْ فَهَلْ أَنْتُمْ شَاكِرُونَ (80) وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِي بِأَمْرِهِ إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا وَكُنَّا بِكُلِّ شَيْءٍ عَالِمِينَ (81) وَمِنَ الشَّيَاطِينِ مَنْ يَغُوصُونَ لَهُ وَيَعْمَلُونَ عَمَلًا دُونَ ذَلِكَ وَكُنَّا لَهُمْ حَافِظِينَ ...(82) الانبياء .

سەردەمی ئەو پێغەمبەرە سەردەمێکی زێڕینە لە مێژووی مرۆڤایەتی ، سەردەمێکە بۆ بنیاتنانەوەی شارستانیەت و پێشکەوتن و سەرهەڵدانی داهێنان، پێغەمبەر سولەیمان کەسێکی حەکیم و بە هێز بووە بەهێز بەومانایەی توانی هەموو جنۆکە و باڵندەکان بەویستی خۆی بخاتە جووڵە و لەبەردەستی ئەو کاربکەن و بە گوێی بکەن ، حەزرەتی سولەیمان شە و و رۆژ لە هەوڵ و کارکردن دابوو تا گەیشتە ئەو رادەیەی توانی کۆمەڵگایەکی هۆشیار و مەدەنی دا بمەزرێنێت..

گەلەکەیشی بە خەڵك و جنۆکە و باڵندەوە هەر لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە لە کاردا بوون و ساردبوونەوە رووی تێنەدەکردن ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێ ] علمناه منطق الطير [ ، کاتێك دوو باڵندە بەیەکەوە دەکەوتنە قسە و گفتو گۆ سوبحانەللاً حەزرەتی سولەیمان لێیان حاڵی دەبوو و لەگەڵیان دەکەوتە گفتوگۆ ، و تەنانەت لەگەڵ جنۆکەکانیش دەکەوتە قسە و کاری لەگەڵ دەکردن ] ومن الجن من يعمل بين يديه بإذن ربه [ بە فەرمانی خودا هەرشتێك حەزرەتی سولەیمان داوای بکردایا و ئارەزووی لێبایە دەستبەجێ بۆیان جێبەجێ دەکرد ، تەنانەت لەگەڵ مێروولەکانیش دەهاتە ئاخاوتن و لە یەکتری حاڵی دەبوون... یەکێکی تر لەو موعجیزە و بەخشانەی خودا کە بۆ حەزرەتی سولەیمانی دانابوو موسەخەر کردنی گێژووڵەکە و با و هەڵکردنی با لە هەموو شوێنێك بە ویستی ئەو پێغەمبەرە بوو ] فسخرنا له الريح .... تجري بأمريه . [

بەخششێکی تری خودا بۆ حەزرەتی سولەیمان ، بەخشینی کانییێکی پڕ لەمس بوو بۆ ئەو پێغەمبەرە ] واسلنا له عين القتر [ ئەمە وەنەبێ کە ئەم شتانە هەمووی بێ هەوڵی حەزرەتی لەلایەن حەزرەتی سولەیمانەوە لەلایەن خودا بۆی هاتبێت ، نەخێر ... چونکە ئەو پێغەمبەرە شەوو رۆژ لەهەوڵ و کۆششدا بووە و بەردەوام لە رکوع و کڕنووش دابووە و داوای زانست و زانیاری لە خودای گەورە کردووە..

هەروەها گەورەترین و رێك و پێك ترین سوپا بەخششێکی خودا بوو بۆ حەزرەتی سولەیمان سەلامی خودای لەسەر ، بەلام چ سوپا و لەشکرێك ، سوپایەکی یەکگرتوو لە جنۆکە و باڵندە و گیانداران . بەلام دەبێ ئەوەش بزانین کە تواناو هێزی جنۆکەکان زۆر لەتوانای مرۆڤەکان جیاواز ترە چونکە جنۆکە زۆر بە هێزن و لەتوانایاندایە هەموو شتێك بکەن تەنانەت دەتوانن بە چرکەیەك چەند کیلۆ مەترێك ببڕن و بفڕنە ئاسمانیش ، لەوکاتەدا ئەگەر جنۆکەکان بیانویستایە بڕۆن ئەوا لەسەر تەختەیەك دادەنیشتن و بە خێرایی باو گێژووڵەکە دەکەوتنە رێ، بۆ

هەرکوێ بیانویستایە دەڕۆیشتن.

ئەو نیعمەت و بەخششانەی کە خودا بە حەزرەتی سولەیمانی دابوو تەنها بۆ زانست و زانیاریی و خێر بەکاری دەهێنا ، وەك دەفەرموویێت ] رب اغفرلي وهب لي ملكـــــــا لا ينبغي لاحد من بعدي[ ، خوایە موڵكێكم بدەیتێ لەدوای خۆم بۆ كەسێك نەمێنێت...

ئێستا ئیسرائیل لەشاری قودس بەدوای ئاسەواری ئەو شارستانیەتەدا دەگەڕێن و هیچ شتێكیان دەست ناكەوێت و نەیانتوانیوە بیدۆزنەوە كەئەمەش خۆی لەخۆیدا ئەم ئایەتە ئەسەلمێنێت كە قورئان كەلامی خوای گەورەیە و باوەڕمان پتەوتر ئەكات...

لێرەوە لەم سەردەمەی حەزرەتی سولەیمان سەلامی خودای لەسەر دووشت بەیەكەوە گرێ دراون ئەوانیش زانست و داهێنان و باوەڕی ئەو پێغەمبەرەیە بە خوداكەی خۆی ، ئەم پێغەمبەرە فێرمان دەكات كە زانست و زانیارییەكانمان لە ڕێی خودا ببەخشین و بە خۆڕایی بێت و باوەڕی كاملیشی لەگەڵدا بێت وامان لێنەیەت بە زانستەكە هەڵبخەڵەتێین چونكە باش بزانین ئەو هەموو زانست و بەخشش و زانیاریانە لە خوداوەیە و هی ئێمە نییە با هەردەم بڵێین ] هذا من فضل ربي ليبلوني ااشكر ام اكفر. [ فێرت دەكات كەتۆ خاوەن بڕوانامە و دەرچووی كۆلیژێت یاخود خاوەنی هێز و كاری ئەوە ئەوبڕوانامە و هێز وتاقەتە هەڵتنەخەڵەتێنێت و لووت بەرزت نەكات، چونكە هەر خودا خۆی پێی بەخشیویت و زۆرلای ئاسانیشە بە ) كن فيكون ( یێك لێتی بسەنێتەوە، ئەگەر خاوەن هێزو بازووی خۆتی ڕۆژێك دادێت پیر دەبیت و تواناو هێزەكەت نامێنێ و تەنها توانات نییە چەند كیلۆگرامێكی كەم بەدەستتەوە هەڵبگریت .

ئەگەر خاوەنی بڕوانامەش بیت، ڕۆژێك دێت لەدەستت بچێت بەهۆی تەكەبوری و لووت بەرزیەكەت، كەنەزانیت چۆن و لەچ ڕێگایەك بەكاری بهێنیت ، دەبێ بزانیت كەزانست و زانیاری بڕوانامەكەت بۆ پارەبێت یاخود بۆ سوود گەیاندنی مرۆڤایەتی و لە پێناو خوای گەورە بێت ... پیاوێك ئەناسم زۆر دەوڵەمەند بوو، ئەو پیاوە ڕۆژێك خۆی ئەشوات كە دێتە دەرەوە ئەبووریێتەوە، دواتر كەهەڵئەستێتەوە و هۆشی دێتەوە سەرخۆی هیچی لەبیر نەماوە تەنانەت ناوی خێزان و منداڵەكانیشی نازانێت !!!... تەنانەت وای لێهات نەیزانی ماڵ و داراییەكەی چەندە !!!..

گەرخوا لێی سەندەوە ئەوا لەماوەیەكی زۆر زوو و ئاسان لێی ئەسەنێتەوە چونكە خوای گەورە بەسەر هەمووشتێك زاڵە و توانای بەسەر هەمووشتێكەوەیە، تكائەكەم نزاكانی ئەو پێغەمبەرە بكەن بەبەرنامەی ژیانتان ] هذا من فضل ربي [ نەكەی موڵكی دنیا بەهی خۆتی بزانیت چونكە موڵكی دنیا كاتییە و لەدەستت ئەچێت كەواتە دڵی خۆت بەو موڵكە كاتییە خۆش مەكە و خوای گەورەت لەبیربێت .

بێینە سەر باسی جنۆكەكانی ژێر دەستی حەزرەتی سولەیمان ] ومن الجن من يعمل بين يديه بإذن ربه [ و هەروەها ]يعملون له مايشاء من محارب و تماثيل .. [ لە فەرمانی دەرنەدەچوون ملكەچی بڕیارەكانی بوون و هەموو كارێكیان بۆ دەكرد ، وە ئەگەر سەرپێچیان لە بڕیارەكانی حەزرەتی سولەیمان بكردایا ئەوا ئازاری دەدان كارگەی گەورەیان دروست كردبوو و باڵەخانەی بەرز و پەیكەری لەڕادەبەدەر گەورەیان دروستكرد..

دواتر خودای گەورە بە نەخۆشیەكی ئیفلیج بوون حەزرەتی سولەیمان بەسەردەكاتەوە ] ولقد فتنا سليمان [ و [ والقينا على كرســــــــيه جسدا ثم اناب [ ، ویستی خودا وایە و دەیەوێت هەموو پێغەمبەرەكانی تاقی بكاتەوە چونكە كە خودا یەكێكی خۆش ویست ئەوا بە موسیبەت و نەخۆشكەوتن ئەوكەسە بەسەر دەكاتەوە، لێرەدا حەزرەتی

سوله یمان جەستەی بەتەواوەتی لە کاردەکەویت و لەسەر کورسییەك دایدەنیشێنن .. گەر دەردەدارانیش بەرامبەر بە تاقیکردنەوەی خوای گەورە ئارامگربن ئەوا دەبن بەهاوەڵیی حەزرەتی سوله یمان سەلامی خوای گەورە لەسەربێت.
بەڵام ئەو پێغەمبەرە زۆر شوکرانە بژێر و خۆڕاگرە و هەردەم دەفەرمووێت [ ربـــي اوزعني ان اشـــكر نعمتك الـتي انعمت علي و علي والدي وان اعمــــــــل صالحــا ترضــــــاه [ ئەم نزایانەی هەر لەرابردووش دەیفەرموو چونکە لەلای روون بوو کە ئەم نیعمەت و بەخششانە هەر هی خودایە و هی خودی خۆی  نییە هـەر بـۆلای پـەروەردگاریش دەگەڕێتەوە ، هەروەها خودا خۆیشی پێی راگەیاندبوو کـە قـسە و گفتوگۆکـانی لەگـەڵ باڵنـدەکان و جنۆکـەکان هەمووی بەخشش و نیعمەتی خودا خۆیەتی و هیچی هی حـەزرەتی سـوله یمان نییـە ، هـەموو جارێـك حـەزرەتی سوله یمان هەموو جنۆکە و باڵندەکانی کۆ دەکردەوە و پێی دەفەرموون وامەزانن ئەم هەموو بەخشش و نیعمەتانە هی منە بەڵکو هەمووی فەزڵ و نیعمەتی خودان و هیچ شتێکی بە هێز و بازووی من نەهاتۆتە ژێردەستم و لەو کاتانەدا حەزرەتی سوله یمان زۆر سوپاسی نیعمەتەکانی خودای دەکردو زۆریش لە خودادەپاڕایەوە تاوەکو زانست و زانیاریی زیاتری پیٚ ببەخشێت.
با باس لە بەسەرهاتەکانی حەزرەتی سوله یمان بکەین ، بۆ نموونە لەوکاتەی سوپاکەی ڕێکخستووە کە لە جنۆکە و باڵندەکان پێکهاتوون بەرێ دەکەون و تادەگەنە شیوێك و ماڵی مێروولەکانی لێیە ] حتی اذا اتو الی وداي النملة [واتە کە گەیـشتنە ئـەو شـوێنەی مێروولـەکانی لێیـە مێروولەیـەك سـوپاکەی سـوله یمانی بینـی و ئاگـاداری مێروولەکانی تری کردەوە و پێی وتن ئاگاداری خۆتان بن نەوەك سوپاکەی حەزرەتی سوله یمان لەناوتان ببـات و بکەونە ژێر پێی سوپاکەی !!!..
کە حەزرەتی سوله یمان گوێی لە دەنگی مێروولەکە بوو زەردەخەنە گرتی و پێکەنی ، حەزرەتی سوله یمان لێـرەدا سوپاکەی رادەگرێت کە ئەسپ و سوارچاکێکی ئێجگار زۆری لەگەڵدایە و دەفەرمووێ بوەستن و هـەموو ئـەم ئەسـپانە بکەن بە خێر .. لێی دەپرسن لەبەرچی ؟ ئەویش دەفەرمووێت : زیکرێکی خودام بیرچوو بیکەم ، و بـەهۆی سـەرنج دانم لە زۆری سوپاکەم بیرم چوو تەسبیحاتی خودای گەورە بکەم..
رۆژێکیان لەگەڵ ئەو هەموو سەرباز و موڵك و سامانە بەرێ ئەکەوێت و پێی ئەڵێن : چەندە موڵك و سامانێکی زۆرت هەیە !!!... حەزرەتی سوله یمانیش ئەفەرمووێت : وەڵلاهی هەرهەموو موڵـك و سـامانەکەم یـەك ( سبحان الله ) ناهێنێت کەبیڵێم!!!...
هەروەها حەزرەتی سوله یمان کۆشکێکی زۆر گەورە و لەرادەبەدەر نایاب و خۆشی هـەبوو هـەموو شـتێکی تێـدابوو، لئاستێکی لەرادەبەدەر پێشکەوتن دابوون گەر باڵەخانەیەك زەوییەکەی شووشە بێت و ژێرەوەی شووشەکەش ئاو بێت ، ئاخۆ شێوازی بیناکە و تەکنەلۆژیاکەی دەبیٚ چەندە پێشکەوتوو بوو بێت؟!!!
لەدووری حەزرەتی سوله یمانە گەلێك هەبوون کەگەلی بەلقیسیان پـێ دەووتـن ، خۆریـان ئەپەرست، حـەزرەتی سوله یمان پەپوویەکی هەبوو زۆر گوێڕایەڵ و تۆکمە و زیتەڵ بوو ، گەڕا بە دوای نەیبینیەوە ، دوایی خۆی هاتەوە و هەواڵی بۆ حەزرەتی سوله یمان هێنا کە چوومەتە ) سبأ ( کە لە یەمەنەو گەلێك هەن کە شاژنەکەیان بەلقیـسە خۆر ئەپەرستن.
لەوکاتەدا پەپووەکە واتا ) هود هود ( دەنووکی لەزەوی ئەدا و بە حەزرەتی سوله یمان دەفەرمووێ کە خودایەك لە ژێر ئەم زەوییە و لەسەر ئەم زەوییە رزق و رۆزیمان بدات چۆن دەبێت ئەمانە خۆر بپەرستن ؟؟
حەزرەتی سوله یمانیش نامەیەك بۆ شاژنە بەلقیس دەنووسێت و داوای لێدەکات باوەڕ بـەخوا بهێنێـت و هیدایـەت

وەربگرێت ، بەرلەوەی بەلقیس بێت بۆلای حەزرەتی سولەیمان ئەم پێغەمبەرە روو لە سوپاکەی دەکات دەفەرموێت کام لە ئێوە تواناو هێزی هەیە کۆشکەکەی شاژنە ) بـةلَقيس( م، بـە تـەواوەتی بـۆ بهێنێـت بـەلاَم بیگۆڕێـت ؟ جنۆکەیەك دەڵێت روو وەرگێڕە بە چرکەیەك بۆت دەهێنم و حەزرەتی سولەیمانیش دەفەرمووێ نـا .. یـەکێکی بـە زانست ترم دەوێت و لێرەدا گەرەکیەتی زانستەکە هەموویان بگرێتەوە و نەوەك تەنها بۆ کەسێك و جنۆکەیەك...

یەکێکی تریان بە حەزرەتی سـولەیمان ئەفـەرمووێت : بـە چـاو تروکانێـك عەرشـەکەی شـاژنە بەلقیسـت بـۆ دەهێنمـــــــــە ئێرە!!!

جنۆکەکەعەرشەکە دەهێنێت لەو کاتەی بەلقیس هاتۆتە لای حەزرەتی سولەیمان، بەلاَم جنۆکەکە گۆڕانکـاری لـە عەرشەکەی بەلقیس کردووە و حەزرەتی سولەیمانیش روو لە بەلقیس دەکات و پێی دەفەرمووێت ) أهذا عرشـك( ؟؟ ، بەلقیس لێرە دوو دڵی رووی تێدەکات و بە وردی سەیری دەکات و دەڵێت ) کأنه هو ( چونکە گۆڕانکاریی تیا کراوە ، پاشان حەزرەتی سولەیمان بەلقیس دەباتە عەرشەکەی خۆی و نیشانی دەدات ] فلما رأته حسبته لوجـە [ ژێـر عەرشەکەی سولەیمان هەمووی ئاوە و عەرشەکەش لە شووشە دروستکراوە .. بەلقیس جلـەکانی هەڵـدەکات نـەوەك تەڕبێت بەلاَم نازانێ شووشەیە و ژێری ئاوە !! ئنجا بەلقیس دەڵێت ) وأسلمت مع سليمان لرب العالمين ... (

چۆنیەتی وەفاتکردنی حەزرەتی سولەیمان :

جنۆکە و عیفریتەکان کۆشکێکی گەورە دروست دەکەن و حەزرەتی سولەیمانیش بەرامبـەریان و دەسـتاوە و سـەیریان دەکات و دارێکی بە دەستەوەیە و ئەیخاتەژێر باڵیەوە و بە دیاریانەوەیە..

کە راوێژکارێکی لێی نزیك دەبێتەوە دەبینێت حـەزرەتی سـولەیمان گیـانی دەرچـووە و وەفـاتی فـەرمووە ، ئـەم راوێژکارەی هیچ دەنگێك ناکات و نایـدرکێنێت نـەوەکو جنۆکـەکان سـاردبوونەوە روویـان تێبکـات و دەسـبەرداری دروستکردنی کۆشکەکەبن و ئەم دیمەنە ماوەیەکی زۆر وەکو خۆی دەمێنێتەوە واتە دیمەنەکەی حەزرەتی سولەیمان ، و جنۆکەکانیش غەیبیان نییە کە حەزرەتی سولەیمان وەفاتی کردووە و تاوەکو کۆشکەکە تەواو دەکەن، و تیشکی خۆر لە گۆچانەکەی حەزرەتی سولەیمان ئەدات و دەکەوێتە سەر زەوی ئنجا ئەزانن کە وەفاتی فەرمووە ..

* *

*

پێغەمبەر عوزەیر سەلامی خودای لەسەربێت:

أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَى قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّى يُحْيِي هَذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَـهُ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَلْ لَبِثْتَ مِئَةَ عَامٍ فَانْظُرْ إِلَى طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ وَانْظُـرْ إِلَـى حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِلنَّاسِ وَانْظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنْشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّـهَ عَلَـى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (259) وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِنْ قَالَ بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَـئِنَّ قَلْبِـي قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَى كُلِّ جَبَلٍ مِنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُـنَّ يَأْتِينَـكَ سَعْيًا وَاعْلَـمْ أَنَّ اللَّـهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ .. البقرة.

دوای ماوەیەکی زۆر پاش پێغەمبەر سولەیمان و حەزرەتی موسا خودای گەورە پێغەمبەرێکی تری هێنایـە دنیـا کـە ئەویش حەزرەتی عوزەیرە سەلامی خودای گەورەی لەسەربێت ، حەزرەتی عوزەیر لەناو بەنی ئیسرائیلیەکان دەژیا و

خواى گەورە فەرمانى پێكرد خۆى ئامادە بكات و بەرەو دێیەك بڕوات و خەڵكەكەى بەرەو باوەڕ هێنان و هیدایەت بانگ بكات.

حەزرەتى عوزەیر كەوتە خۆو خواردن و كەل و پەلەكانى ئامادەكرد و بە گوێ درێژەكەیەوە بەرەو دێیەكە كەوتە رێ كە خودا پێى راگەیاندبوو ، بەڕێ كەوت تاگەیشتە شوێنەكە بینى دێیەكى تەواوە بەلاّم كەسى تێدانییە و چۆڵە [ خاوية على عروشـــــها ] بەو واتایەى دیوارى خانووەكان ماوە و هەموو سەرەوەى خانووەكان كەوتۆتە سەر زەوى و پووش و پەلاّش خانووەكانى داپۆشیوە و تەنانەت لە دێیەكە باڵندەیەكیش نەدەبینرا ,حـەزرەتى عـوزەیر سـەرى سوڕدەمێنێت و دەكەوێتە بیر كردنەوە كە ئایا ئەم خەڵكە چى لێهاتووە و كەسى تیا نەماوە ؟ یاخود دەبێ مـن بـە هەڵە نەهاتبم و ڕێگام لێ ون بووبێ ؟ دەگەڕێت زۆریش لە ژێر دار و پەرووى خانووە رووخاوەكان دەگەڕێت و هـیچ كەسێك نابینێتەوە !!! ... حەزرەتى عوزەیر كەوتە بیر كردنەوە كە رەنگە خوداى گەورە منى بۆ ئەوە ناردبێ كە بەم زووانە كۆمەڵە خەڵكێك روو لە و دێیە بكەن و تێیدا نیشتەجێ ببن.. دواى مانـدووبوون بـە رێگـاوە و پـاش نـان خواردن كەلەگەڵ خۆیدا هێنابووى وەك دەڵێن نان و ترێ و هەنجیرى لەگەڵ خۆى بردووە لەسەر زەوى رادەكـشێت و قاچەكانى بە دیوارێك هەڵئەپەسێرێت و سەیرى دێیەكە دەكات و شتێك هاتە خەیاڵیەوە [ قال انى يحيى الله هذه بعد موتها [ ، واتا كەى دەبێ خوداى گەورە ئەم دێیە زیندوو بكاتەوە و بەچ شـێوەیەك ؟ پرسـیارەكەى مەبەسـتى تواناى خواى گەورە نیە، بەڵكو سەرسوڕمانى خۆیەتى كەى ئەم شارە ئاوەدان ئەبێتەوە تـاوەكو ئـایین و فـەرمانى خواى گەورەیان پێبگەیەنم.

خودا لێرەوە ئەم تاقیكردنەوە نیشانى حەزرەتى عوزەیر دەدات و ] فأماته الله مائة عام [ خودا لەتواناى داهەبوو هەموو خەڵكى دێیەكەى زیندوو كردبایە و پیشانى حەزرەتى عوزەیرى دابایە ، بەلاّم مردنەكەى بۆ ماوەى سەد ساڵ نیشانى حەزرەتى عوزەیردا ، دواى سەد ساڵ حەزرەتى عوزەیر گیانى هاتـەوە بـەر و وەكـو خـۆى قاچـەكانى بـە دیوارەكەوە وەستاون و خواردنەكەى وەكو خۆیەتى و بەلاّم گوێ درێژەكەى نەماوە و چەند كۆنە ئێـسقانێكى كـۆن و رزیوى لە نزیكە ..

لەوكاتەدا خوداى گەورە فریشتەیەك لەسەر شێوەى مرۆڤ دەنێرێتە لاى حەزرەتى عوزەیر و پرسیارى لێدەكات ] كم لبثت [ واتە چەندێك خەوتى ؟ ئەویش وا هەست دەكات رۆژێك یان چەند رۆژێك خەوتبێت ] قال يوما او بعض يوم [، فریشتەكەش كەلە شێوەى مرۆڤە پێى دەڵێت ] بل لبثت مائة عام !!!.. [

حەزرەتى عوزەیر سەرسامى رووى تێدەكات و لە دڵى خۆیـدا دەڵێـت چـۆن شـتى وا دەبێـت سـەد سـاڵ خـەوتبم ؟ فریشتەكە پێى دەڵێ سەیرى گوێ درێژەكەت بكە ] ولنجعلك اية [ تۆ دەكەین بە ئایەتێك بۆ هەموو خەڵكى كەدەبێ بمرن و دواییش زیندوو ببنـەوە ، لـە بەرامبـەر چـاوەكانى حـەزرەتى عـوزەیردا و بـە فـەرمانى خـوداى گـەورە ئێسقانەكانى گوێ درێژەكە یەكیان گرت و دەمـارو گۆشـتەكان و پێـستەى بـۆ هاتـەوە و وەكـو خـۆى لێهاتـەوە و هەڵسایەوە سەر پێیەكانى ، سەیرى كارى ئەم خالیقە بكە كە چەندە جوان و پڕ فەڕە و هەربەو هۆیەشە حەزرەتى عوزەیر و سەرجەم پێغەمبەرانى تر باوەڕیان بەخوداى تاك و تەنها پتەوو بەهێزبووە و بەو هۆیەشـەوە خـۆڕاگر و پێشەنگ بوونە، ئەمە خۆى لەخۆیدا تاقیى كردنەوەیەكى خواى گەورەیە بۆ پێغەمبەران و بۆ ئێمەش كـە لـەدواى زیندووبوونەوەت پرسیارت لێئەكات لەبارەى ئایەتەكانى زیندووبوونـەوە و گەڕانـەوەت بـۆلاى خـواى گـەورە كـە لەقورئانى پیرۆز و لەبەسەرهاتەكەى حەزرەتى عوزەیر باسى كـردووە و بەنموونـە نیـشانى ئـەو پێغەمبەرەیـدا، باشیش بزانە كە خواى گەورە لێپرسینەوەت لەگەڵ دەكات چونكە عەقڵو هۆشى پێبەخشیوى، جگە لەمـەش هـەموو

گەردوون و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ژیان بەدەستی ئەوە و لەژێر فەرمانی ئەودایە.
پاشان فریشتەکە پێی فەرموو ] فانظر الى طعامك لم يتسنة . [ میوە و خواردنەکانت وەکو خۆیەتی و تێك نەچووە !!...سەیری ئەم موعجیزەیەش بکە کەخوای گەورە دوای سەد ساڵ نەیهێشت میوەکانی بڕزێت، کەواتە خوای گەورە زەمەنی بۆ سەد ساڵ وەستاند هەم بۆ گوێدرێژەکە هەمیش بۆ میوە و خۆراکەکەی حەزرەتی عوزەیر بەهەمان شێوەش بۆ یارانی ئەشکەوت بەم شێوەیە ...دواتر خوای گەورە فەرمانی پێدەکات بڕۆ بۆ دێیەکەی کەتۆم راسپارد، بۆچی بچێت ؟ بێگومان حیکمەتێکی خۆی هەیە، کەتۆش ناوت لەکۆلێژێك یاخود پەیمانگەیەك دەردەچێت بێگومان حیکمەتێکی تێدایە، قوتابی وائەناسم دوای تەواوکردنی قۆناغەکانی کۆلێژ ناوی لەدێیەکی زۆر دوور و لەسەر سنوور دەرچووە ...کەچۆتە دێیەکە جگە لەچەند کەسێکی بەساڵاچوو کەسێکی تر نوێژی نەکردووە و کڕنووشی بۆ خوای گەورە نەبردووە، لەئەنجامدا ئەو گەنجە وایکردووە کە دێیەکە ئاوەدان بکاتەوە و لەهەمان کاتیش هەڵساوە بەدروستکردنی مزگەوتێك بۆ دانیشتوانی دێیەکە لەپاڵ دیواری ئەو قوتابخانەیەی کەتێیدا بە مامۆستا دامەزراوە ..!!!
ئەوە ئاوەدانکردنەوەی دێیەکە و فەراهەم هێنانی خۆشگوزەرانی بەختەوەرییە بۆ دانیشتوانی دێیەکە، چونکە بەهۆی ئەو مامۆستا گەنجەوە دانیشتوانی دێیەکە روویان لەخوای گەورە کرد و تەنانەت ئەوانەی جاران نوێژیان نەدەکرد بەهۆی ئەو مامۆستایەوە نوێژێکیان بەبێ کۆمەڵ نەدەکرد و ئەوەندە خەڵکی دیندار و رێك و پێکیان لێدەرچوو، کەواتە چوونت بۆ هەر شوێنێك ئەوە حیکمەتێکی تیایە و متمانەت هەبێت خێری بەدواوەیە، حەزرەتی عوزەیرکە دەگاتە دێیەکە دەبینێ زۆر قەرەباڵغ و پڕ لە خەڵك و ئاوەدانییە و گەلێکی ئیسرائیلی بوون ، حەزرەتی عوزەیر لایان نزیك بۆوە و لە نزیك کۆمەڵێکیان دانیشت و لەگەڵیان کەوتە گفتوگۆ ، پێی فەرموون ئێوە ناوی حەزرەتی عوزەیرتان بیستووە و ئەیناسن ؟ وتیان بەڵێ زانیومانە کە نێردراوی خودا بووە و نزیکەی سەد ساڵێك دەبێت مردووە و نەماوە..
ئەویش پێیان دەفەرمووێت من عوزەیرم و نێرداوی خودای گەورەم ، ئەوانیش دەڵێن شتی وا چۆن دەبێت و راست نییە ، دیسان دەڵێت من عوزەیرم ، ئەوانیش دەڵێن حەزرەتی عوزەیر چەند نیشانەیەکی هەبووە ... تەنها پیرەژنێك خەسڵەتەکانی حەزرەتی عوزەیر دەزانێت و تەمەنی لەسەرووی سەد و بیست ساڵیەوەو چاوەکانی کوێرن.
هەندێك دەڵێن خزمەتکاری حەزرەتی عوزەیر بووە و هەندێکیش دەڵێن دایکی بووە ، کە پیرەژنەکە دەهێنن و ئەویش پێی دەڵێت من حەزرەتی عوزەیرم ، پیرەژنەکەش دەڵێت یەك لە نیشانەکانی حەزرەتی عوزەیر ئەوە بووە هەموو تەوراتی لەبەر بووە ، وەئەگەر دوعای بۆ کەسێك بکردایە راستەوخۆ خودا دوعاکەی وەردەگرت و گیرای ئەکرد ، حەزرەتی عوزەیر دوعا بۆ پیرەژنەکە دەکات چاوەکانی چاك بێتەوە دەستبەجێ خودا شیفا بۆ پیرەژنەکە دەنێرێت و رووناکی دەگەڕێتەوە چاوەکانی و پاشان لە سەرەتاوە تاکۆتایی هەموو تەوراتیان لەبەر بۆ دەخوێنێتەوە و زۆر بە جوانی و رەوانی . خۆ لەو سەردەمە تەورات نەمابوو و کەسێك لەبەری نەبووە جگە لە حەزرەتی عوزەیر نەبێت .
ریوایەتێکی تر هەیە دەڵێن حەزرەتی عوزەیر پێی ووتون : وەرن لە گەڵما تەوراتێکی کۆن هەیە شاردوومەتەوە لە دێیەکەی خۆما بابچین بیهێنین ، کە پیرەژنەکە چاوەکانی چاك بوونەوە و دەیناسێتەوە و دەستبەجێ بەنی ئیسرائیل باوەڕی پێدەهێنن و تەوبە دەکەن و جارێکی تر روو لە خودای گەورە دەکەن ، جوولەکەکان ئەوەندە عوزەیریان گەورە کرد تەنانەت گەیاندیانە ئەو رادەیەی وتیان کوڕی خودایە ] وقالت اليهود عزير ابن الله... [
لێرەوە دڵنیابن ئایینەکانی تر خوار و خێچی و دەستکاری کەوتە ناویەوە و تەنها ئاینی پیرۆزی ئیسلام وەکو خۆی

به پاك و بێگەردی مایەوە و تادنیاش ماوە هەر بەو پاکییە دەمێنێتەوە و خوای گەورەش خۆی پارێزگاری لێدەکات و کەسێك بۆی نییە دەستکاری ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بکات، کەواتە پێویستە ئێمەش دەست بەئایینەکەمانەوە بگرین و لەکاروباری ڕۆژانەماندا پەیڕەوی بکەین و پشتگوێی نەخەین ..ئەمە پیشەی جولەکەیە و ئەوەتا یان پێغەمبەرانیان شەهید کردووە ویان ئەزیەتیان ئەدەن، یان لەشێوەی سروشتی خۆی دەری ئەکەن و ئەیکەن بەکوڕی خوا !!!.. ئەگەر ئێمە بەچاوی خۆمان نەبینن مردو زیندوو ئەکرێتەوە، ئەی ئەوەنییە خۆمان پێش ئەوەی بێینە بوون مردوو بووین ؟؟!!

ئێستا زیندووین و هەرئەو خوایەشە کە ئەمان مرێنێت و زیندووشمان ئەکاتەوە، کەواتە زیندوو کردنەوەی دووەم جار زۆر ئاسانترە لە دروستکردنی یەکەم جار.

چی لە عوزەیر پێغەمبەر فێربووین:

گەورەیی و باڵادەستی خودای گەورە.

زیندووبوونەوەمان دوای مردن.

لێرە بۆمان دەردەکەوێت بۆچی سەد ساڵ ، چونکە بەوماوەیە حەزارەت دێتە بوون

فێربووین کەخودا توانای بەسەر هەموو شتێکەوە هەیە و هەرخۆی زیندووکەرەوەیە

پێمان دەڵێت بێ ئومێدمەبن لە هیدایەت وەرگرتنی خەڵکان خودا خۆی هیدایەت بەخشە و گەورە و میهـــــــــرەبان و بەرەحمە.

*    *    *

پێغەمبەر زەکەریا و یەحیا سەلامی خودایان لەسەربێت:

كهيعص (1) ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا (2) إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاءً خَفِيًّا (3) قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنْ بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيًّا (4) وَإِنِّي خِفْتُ الْمَوَالِيَ مِنْ وَرَائِي وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا فَهَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا (5) يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوبَ وَاجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا (6) يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ نَجْعَلْ لَهُ مِنْ قَبْلُ سَمِيًّا (7) قَالَ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيًّا (8) قَالَ كَذَلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِنْ قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْئًا (9) قَالَ رَبِّ اجْعَلْ لِي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَ لَيَالٍ سَوِيًّا (10) فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَنْ سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيًّا (11) يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا (12) وَحَنَانًا مِنْ لَدُنَّا وَزَكَاةً وَكَانَ تَقِيًّا (13) وَبَرًّا بِوَالِدَيْهِ وَلَمْ يَكُنْ جَبَّارًا عَصِيًّا (14) وَسَلَامٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا (15) مريم.

وَزَكَرِيَّا إِذْ نَادَى رَبَّهُ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنْتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ (89) فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَى وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ ...(90) الانبياء.

لەدوای حەزرەتی موسا سەلامی خودای لەسەر بێت بنەماڵەیەکی ئیماندار و لە خواترس و زۆر دڵسۆز بۆ پەیامەکەی خودا پەیدابوون و بە ) ال عمران ( ناسراو بوون تابڵێی دیندار و خۆراگر و بە ئەمەك بوون بۆ گەیاندنی پەیامی خودا بە خەڵکی ، لەنەوەی ئەم ئالی عیمرانە دووکچ هەبوون لەگەڵ زاوایەکیان کە ئەویش حەزرەتی زەکەریا بوو علیه السلام ، ئەمانە لە فەلەستین دەژیان و جگە لەوان کەسێکی تر نەبووە باوەڕی بە خودا هەبووبێ لەو سەردەمەدا.

ویستی خودا وابوو کە ئەم خێزانەی عیمران کوڕیان نەبووە نە ئالی عیمران و نەحەزرەتی زەکەریا ، خێزانی عیمران لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەناوی نەکراوە ، بەڵام ئەوەندە خەمخۆری دینەکەی خوا بووە چونکە لە

هەموولایەکەوە فەساد و بەد ڕەوشتی سەری هەڵدابوو ، ئەو ئافرەتە بەردەوام سەری لە کڕنووشدابووە و لە خوا پاڕاوەتەوە بەڵکو خودا منداڵێکی پێببەخشێت و ببێت بەو عیسا مەسیحەی کە خەڵکی لە چاوەڕوانی ئەو پێغەمبەرە دابووینە ... لە هەمان کاتیش ئەو کچەی کە داویەتی بە حەزرەتی زەکەریا ئەمیش منداڵی نابێت ، خێزانی عیمران لەتەمەن دەرچووە کە منالی ببێت و کەسیش لەو باوەڕەدا نەبووە کە ئەو ژنە منالی ببێت ، هەروەك حەزرەتی زەکەریاش تەمەنی گەورە بووە و دەیفەرموو ] إني وهن العظم مني واشتعل الرأس شيبا [ و دەڵێت : من تەمەنم بەسەرچوو و تەنانەت ئێسقانەکانم تواناو لەنگەرییان نەماوە و سەرتاپای سەریشم سپی بوون ، و چۆن منالم دەبێت چ جای ئەوەی دایکی خێزانەکەم منالی ببێت ؟؟؟ دوعاکانی خەسووی حەزرەتی زەکەریا لەبەر بەرژەوەندی خۆی نەبوو بەڵکو لەبەرژەوەندی دینەکەی دابوو چونکە دەیانووت : ئەم خەڵکەی بەنی ئیسرائیل پەند و عیبرەت وەرناگرێت مەگەر پێغەمبەرێکیان بۆ نەیەت.

خێزانی عیمران دوعا دەکات ] إذ قالت امرأة عمران ربي اني نذرت لك مافي بطني محررا فتقبل مني إنك انت السميع العليم [ وتی نەزری دەکەم کە خزمەتی پەرستگاو ئاینی تۆ بکات ، لێرەوە خودا نزاکەی قەبوڵ کرد و خێزانی عیمران زۆر دڵی خۆش بوو و هەردەم سوپاسی خودای دەکرد و سەری لە کڕنۆشدا بوو .. گەورەیی ئەو ئافرەتە لەوەدایە پەیمان بەخوای گەورە ئەدات گەر منالم ببێ ئەوە بۆ خزمەتکردنی ئایینەکەی تۆ تەرخانی ئەکەم !!..هەرکەس خاوەنی ئەم نیەتە پاکە بێت و بڵێت : خوایە منالێکم بدەیتێ و پەیڕەوی بەرنامەکەی تۆ بکات و خزمەتکاریی ئایینەکەت بێ و کەسێکی بانگخواز بێ بۆ ئایینەکەت یاخود خاوەنی بڕوانامەیەکی بەرز بێت و خزمەتی مرۆڤایەتی بکات بکات لە پێناو خوای گەورە ... تکایە با نیەتەکانمان لەدروستکردنی ژیانمان ڕۆڵ بگێڕێت.

پێیان دەوت : منالەکەت کوڕ بێت دەبێت بە پێغەمبەر و قودس لە ژێر ڕکێفی خوانەناس و موشریکەکان ڕزگاردەکات ، بەلام کەسکەکەی داناو منالی بوو ، کوڕ نەبوو ، و کچ دەرچوو و دەڵێت ] ربی إني وچعتها انپی ولیس الـڗکر کالانپی [ خوایە من کچم بوو ] !!!!... وإني سميتها مريم [ و لە نەزر و پەیمانەکەی کە داومە پەشیمان نیم کە ببێتە خزمەتکاری پەرستگا ، و پاشان دەفەرمووێت : خودایە پەنات پێئەگرم لەوەی کە شەیتان بتوانێ زەفەر بەو مەریەمە و نەوەکەیشی بگەیەنێت، سەیری ئەم ئافرەتە بەڕێز و خواناسە بکەن کەچەندە بەپەرۆشە منالێکی ببێت خزمەتی ئایینەکەی بکات، خۆخەم لەنەزۆکیی جارانی ناخوات بەڵکو خەم دەخوات کەلەو سەردەمەی ئەوی تیا دەژێیت کەخەریکە ناوی خوا لەسەر زار و زمانەکان نامێنێت و بگرە تەنها باوی نامێنێت.

خوای گەورە وەحیی بۆ نارد کە نەزرەکەتمان قەبوڵ کرد و زۆر دڵی خۆش دەبێت ، کە مەریەم گەورە بوو و لە شیر خواردن بڕوە ، ژنەکەی عیمران کە دایکی مەریەمە ئەم کچە جوان و نورانیە بۆ پەرستگا ئەبات و دەیەوێت نەزرەکەی بگەیەنێتە سەر ، مەریەم تا بڵێی منالێکی جوان و نورانی بووە و لە دوورەوە خەڵك تامەزرۆی بینینیان کردووە و بۆی پەرۆش بوون ، لەو کاتەدا بەپێی یاسای بەنی ئیسرائیل قەدەغە بوو کە کچ یاخود ئافرەت نزیك پەرستگا بکەوێت و پەرستش و عیبادەتی تێدا ئەنجام بدات و خزمەتی پەرستگاکەش بکات بۆیە داوایان کرد بۆ ئەم کارە کەفیلێك پەیدا بکات ، بەلام سەیر لەوەدابوو هەرهەموو خەڵکی حەزیان دەکرد ببن بە کەفیلی مەریەم و بۆیە لەسەر کەفالەتکردنی مەریەم بە گرەو ڕێککەوتن ، ڕێککەوتنەکەش چۆن بوو ؟ هەموو کاهینەکان دەبێ قەڵەمی دەستیان هەڵبدەنە ناو ئاوێك و قەڵەمی کام کاهین بە بەرزی لەناو ئاوەکەدا وەستا ئەوا دەبێت خاوەنی ئەو قەڵەمە ببێت بە کەفیلی مەریەم .

سەرجەم قەڵەمی کاهینەکانیان خستە ئاوەکەوە و قەڵەمەکەی حەزرەتی زەکەریا بە بەرزی لەناو ئاوەکە وەستا و حەزرەتی زەکەریا کەفالەتی کرد ، ئەمە ویستی خودای گەورەی لەسەر بوو کە دەبێت پێغەمبەرێك کەفالەتی مەریەم بکات نەوەك کاهینێك و بەندەیەك چونکە ئەو دەزانێت چۆن چۆنی پەروەردەی بکات، لێرەدا ویستی خوای گەورە وابوو کە ئەبێ ئەوکەسەی ئەوان چاوەڕوانی ئەکەن بێتە دنیاوە، ئەبێ ئافرەت ڕۆڵی خۆی تێدا ببینێت و خاوەن پڕۆژەی خۆی بێت بۆ خزمەتکردنی پەرستگاکە و ئاوەدان کردنەوە و زیندووکردنەوەی ئایینەکەیان هەرلەبەر ئەمەشە لەو مەریەمە عیسای مەسیح لەدایك ئەبێت و دێتە دنیاوە.

مەریەم دەنێردرێتە پەرستگاو بەردەوام خزمەتی پەرستگا دەکات و نوێژ دەکات و نزا دەکات، بەلاّم چ مەریەمێك مەریەمێکی بەحەیاو بەشەرم و گوێڕایەڵ و ملکەچی خودا، خۆزگە لەم ڕۆژگارەی ئێمەش خوشکان و دایکانمان نموونەی مەریەمیان دەبوو، بەڵێ هەر جارەی برسی بێت بە فەرمانی خودا فریشتەکان خواردنی بۆ دەهێنن هەموو جۆرە خواردنێکی چوار وەرزە !!!.. ئەوەتا حەزرەتی زەکەریا ڕۆژێك مەریەم بەسەر دەکاتەوە و جۆرەها خواردن لەبەردەم مەریەم دەبینێت و لێی دەپرسێت ) انی لکی هڑا ( ئەویش وەلاّمی دەداتەوە ) هو من عنداللّه ( ... ) هنالك دعا زکریا ربه ( بیر دەکاتەوە ئەمە لەلایەن خوداوە رزق و ڕۆزی بۆ دێت و منیش منالّم نییە..

نزا دەکات ) ربي هب لي من لدك ذرية طيبة ( خوایە منداڵێکی پاك و خاوێنم پێببەخشی بۆ زیاتر خزمەتکردنی ئایینەکەت کە خەریکە لەناو بەنی ئیسرائیل باوی نامێنێت بە هۆی شیرك و گوناهەکانیان، با ئێمەش لەرۆژگارێکی وەك ئەمڕۆ بەردەوام ئەو جۆرە دوعایانە بکەین، کەخەریکە لەم ڕۆژگارەدا منالّەکانمان بەرەو هەلاکەت بچن بەهۆی بلاّوبوونەوەی دەیەها هۆکاریی ڕاگەیاندن کە کەمێکیان بۆ سوود و خێر بەکاردەهێنرێت .

حەزرەتی زەکەریا لە نزاکانی بەردەوامە و دەفەرمووێ ] ولم اكن بدعائك ربي شقيا [ ، هەروەها دەفەرمووێ ] وإني خفت الموالي من ورائي [ ، حەزرەتی زەکەریا ئاماژە بە بەنی ئیسرائیل دەکات کە ترسی هەیە لەوەی ئەوان ئایینی خودا لەناوبەرن ، خۆ دەشزانێت کە خێزانەکەیشی لە تەمەن دەرچووە و ئەستەمە منداڵی ببێت ، بۆیە دەستبەجێ خودای گەورە دوعاکانی حەزرەتی زەکەریای گیرا کرد و قەبوڵی کرد و خێزانەکەی سکی بوو و کوڕێکی پێبەخشی بە ناوی ) یحیی ( خودا پێی فەرموو ] یا زکریا انا نبشرك بغلام اسمه یحیی لم نجعل له من قبل سمیا ... [ بەلاّم گرنگییەکەی لەوەدایە خودای گەورە خۆی ناوی یەحیا... گەر کەسێ منالّی نەبێت پەنا بۆ کێ ئەبا؟ بۆ مەزارگە و شێخ و سەیدەکان !!!...ئەی خوای گەورە بۆ خۆی ) وهاب ( نییە ؟؟؟ پێغەمبەرێك ئەوەندە ساڵە منالّی نەبووە پەنای بۆ کێ بردووە..؟؟

لەراستیدا ئەوەی جگە لەخوای گەورە داوای منالّ لەکەسی تر بکات ئەوەگوناهێکی زۆر گەورەی کردووە، و متمانەی بەخوای گەورە نییە .... بەڵکو متمانەی بە دروستکراوەکانی خوای گەورە هەیە ... پاڕانەی خۆت .... زیکری ) استغفار ( ی، خۆت ... شەونوێەکانی خۆت ... متمانەی خۆت ... بەخوای گەورە، گەورەترین هۆکارن بۆمنالّ بەخشین کەواتە تەنها ڕوولەخوای گەورە بکە و ڕوو لەهیچ کەسێکی تر نەکەیت.

لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە کە بۆچی ناوی نا ) یەحیی ( ؟ لەبەرئەوەی یەحیا بە مانای زیندوو دێت و نامرێت بە مانای شەهید بوون دێت ، چونکە شەهیدانی ڕێی خوا بەهیچ شێوەیەك نامرن و زیندوون ، دوای ئەوەی خودا وەحیی بۆ حەزرەتی زەکەریا ئەنێرێت حەزرەتی زەکەریا سەرسامی ڕووی تێدەکات و دەفەرمووێ ] انی یکون لی غلام و كانت امرأتي عاقر [ واتە هیچ خەسڵەتێکی منالّ بوونی تیانییە و نەزۆکە و لەتەمەنیش دەرچووە !!!... ئەمجارە دەفەرمووێت ] وقد بلغت من الكبر عتيا [ خوداش وەحیی بۆ دەنێرێ ] قال كذلك ربك علي هين [ ئەی

زەكەریا ئەمەلای من زۆر ئاسانە ] وقد خلقتك من قبل ولم تك شيئا [ حەزرەتی زەكەریا داوا لــە خــودای گــەورە دەكات ئایەتێكی پیشان بدات كە نیشانەیەك بێت بۆ لەدایك بوونی یەحیای كوڕی ، ] ان لا تكلم الناس ثلاثة ايام سويا [ بۆئەوەیە تـاوەكو بەردەوام لە بری قسەكردن تەسبیحات و شوكری خودا بكات.

بە فەرمانی خودا یەحیا بە سێ ساڵ پێش حەزرەتی عیسای كوڕی مەریەم هاتە دنیا و خــودای پێــی فــەرمو ] یـا یحیى خذ الكتـــــاب بقوة واتيناه الحكم صبيا [ ، لەتەمەنی سیانزە ساڵان خودای گەورە كــردی بــە پێغەمبــەر و زانست و زانیاریی پێبەخشی و هەڵیبژارد بۆ ڕێنماییكردنی بەنی ئیسرائیل .

گەنجەكان لەم سەردەمەدا چەندە بەجوانی و پڕ بەدڵت دینداری بكەیت هێشتا كەمــە، چــونكە هۆكــاری لەخــشتە بردنی گەنجان زۆرن ... وابكەیت وەكو حەزرەتی یەحیای گەنج بەهەموو هێزتەوە دەست بە ئــایینی خــوا بگریــت و بەردەوام لەگەڵ قورئان بژیت، نەكەی پاشــەگەز بیتــەوە و دەســەبەرداری ئایینــە جوانەكــەت و ڕەوشــتە جــوان و نایابەكەت نەبیت، نەكەی لەجێبەجێكردن و بەجێگەیاندنی ئەركەكان شلگیریی بكەیت، یەحیا ئاسا گەنجییەكەت بكە بەقوربانی خوای گەورە.

حەزرەتی یەحیا زۆر هەوڵی لەگەڵ بەنی ئیسرائیل داو هیچ سوود و قــازانجێكی نــەبوو و بــە گوێیــان نــەدەكرد و سەرپێچیان لە فەرمانەكانی دەكرد و ئەزیەت و ئازاریان دەدا ، لەو ســەردەمەدا پاشــایەك هــەبوو حــەزی لەكــچی براكەی خۆی دەكرد و بۆیە حەزرەتی یەحیا ئاگاداری ئەو پاشایەی كردەوە كە ئایین و بەرنامەی خــودا، ڕێ بــەو كارە نادەن كە برازاكەی خۆت بۆ خۆت مارەبكەیت و بیكەیتە خێزانی خۆت . برازای پاشاكە چوو بۆلای پاشاكە، كە مامی بوو و پێی وت : گەردەتەوێت من بهێنیت مارەییەكەم یەك شتە ئەویش ئەوەیە دەبێ سەری یەحیام بۆ بڕیت و بۆم بهێنیت ئنجا ڕازی ئەبم !!! مەلیكەكەش بە گوێی برازاكەی كرد و فەرمانی كرد كە سەری یەحیا بــبڕن و بــۆی بهێنن ، بە گوێیان كرد و یەحیای نەوجەوانیان سەربڕی و حەزرەتی زەكەریا ئەم دیمەنەی سەربڕینی ڕۆڵەكەی بینی ، بەوەندەش نەوەستان و پلانیان دارشت بۆ شەهید كردنی حەزرەتی زەكەریا ســەلامی خــودای لێبێــت ، حــەزرەتی زەكەریا بەمەی زانی و لەناو دارێك خۆی شاردەوە و جوولەكەكان بەمەیان زانی و دارەكەیان كرد بــە دوو لەتــەوە و حەزرەتی زەكەریاشیان شەهید كرد.....

هەموو مرۆڤێك مردنی لەسەرە و یەخەی دەگرێت، هەرئەبێ بمرێــت ومالئــاوایی لــە دنیــا بكــات و خــوای گــەورە بڕیاریداوە هەركەسە و بەجۆرێك بمرێت .گەر ئاوتت ڕەزامەندی خوای گەورە بێت و دینداریش خەسڵەتت بێت،هەوڵت سەرخستنی پەیامەكەی خوای گەورە بێت و، كار و كاسبیت حەڵاڵ بێ و هەموو نیەتێكت بۆ خوای میهرەبــان بێــت و پەرۆشی ئایینەكەی پەروەردگارت بیت گەر بمریت بە ) شەهید( ی، ئەمریت و یەحیای گەنج هاوەڵتە لە فیردەوس و بەدیداری شادئەبیت.

جێی خۆیەتی باوكە بەڕێزەكان چاو لەحەزرەتی زەكــەریا بكــەن و كــوڕ و كــچەكانتان گــۆش بكــەن بەدینــداری و پەروەردەیەكی ئیسلامیی، خوای گەورەیان لەلاشیرین و خۆشەویــست بكــەن ...دایكــە خۆشەویــستەكانیش دروشمــی دایكەمەریەم هەڵبگرن بۆ پەروەردەكردنی منداڵەكانتان خەمیی قیامەتیان بخۆن و نزا بكەن چونكە نــزای ئێــوەلای خوای گەورە قەبوڵە و بێ هیوایی و نائومێدی ڕووتـان تێنەكات، و بەهیچ شێوەیەك مەڵێ : كە ئەو منداڵــەی خــوای گەورە پێی بەخشیوم كچ یان كوڕ، زەحمەتە ڕۆڵی گەورە بگێڕێت بۆ خزمەتكردنی ئەم ئایینە، و بەردەوام شانازییان پێوەبكە مادام باوەڕدارن و لەسەر ئایینی ئیسلامی پیرۆز جێگیرن و ساردبوونەوە ڕوویان تێنـاكات.

* * *

پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریەم سەلامی خودای لەسەربێت :

وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِنْ شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِنْهُ مَا لَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا (157) بَلْ رَفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا (158)وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا . ال عمران...

حەزرەتی عیسا کە بە مەسیح ناسراوە یەکێکە لە پێغەمبەرانی خودا ) مەسیح ( واتــا زۆر گەشــتیار و زۆر گــەڕاو، یاخود بەدەستهێنان بەسەر نەخۆش و کەم ئەندام و مردووەکان و ئەمانە هەرهەموویان لە مەسیحەوە هاتوون، واتا دەستی بەسەرهەر کەسێکدا هێنابێ بە فەرمانی خوای گەورە ئەوکەسە شیفای بۆهاتووە و چاك بۆتەوە.

جگەلەوەش بە درێژایی هاتنە دنیای ماڵ و شوێنێکی حەسانەوەی نەبووە و ، بە بەردەوام خەریکی بانگەواز بووە و خەڵکی بۆلای خودای گەورە بـانگ کردووە و کۆڵی نەداوە . پێغەمبەرێکە بەبێ باوك هاتە دنیاوە بۆ ئەوەی هەمووان بزانن کە خودا توانای بەسەر هەموو شتێکەوە هەیەو هەرخۆی خالیق و بــە دەســەڵاتە وەك چــۆن ئــادەم و حــەوای لەنەبوونەوە هێنایــــــــــــە بوون.

پاش ئەوەی خاتوو مەریەم گەورە دەبێ خودای گەورە دەفــەرموێت ] واذكـر في الكتـاب مـريم اذ نتبـدت مـن اهلـها مكـــــــــــانا شرقيا [ مەریەم لە خەڵکەکە دوور کەوتەوە و شوێنێکی بۆخۆی تەرخان کرد بەمەبەستی پەرستش و زیکر کردنی خودای گەورە ، تـاوەکو گەورە دەبێت و تەمەنی دەگاتە سەرووی پانزە ساڵان.

بە فەرمانی خــودای گــەورە حــەزرەتی جبریـل لــە شــێوەیەکی زۆر نــورانی و درەوشــاوەوە دەچــێتە لای حــەزرەتی مەریــــــــــــــــەم و ] وارسـلنا إليها روحنا [ ، لەو کاتەدا حەزرەتی مەریەم سەری سووڕ دەمێنێت و پێی دەڵێت ]اني اعوذ بـالرحمن ان كنت تقيـا [ ، من پەنـات پێ ئەگرم بە خودا بێی بەلامدا و ئەزیەتم بـدەیت . حــەزرەتی جبریل پێی دەفەرموێت لەلای خوداوە هاتووم و ] لاهب لكِ غلاما زكيـا [ مەریەمیش دەڵێت ] انـى يكـون لـي غـلام ولم يمسسني بشر ولم اكن بغيـا [چۆن شتی وادەبێت کەسێك لەمن نزیك نەبۆتەوە ، مەریەم بــاوەڕی تــەواوی بــە خودا هەبوو کەتوانای بەسەر هەموو شتێکەوە هەیە وەکو چۆن لــە بەهەشــتەوە میــوەی بــۆ نــارد لــەو کاتــەی لــە پەرستگاکەی خۆیدابوو.

ئەمجارە جبریل سەلامی خودای لەسەر بێت پێی دەفەرموێت ئەمە لای خودای گــەورە زۆر ئاســانە کــە منـاڵـت پــێ ببەخشێت و ئەمە دەکەین بە ئایەتێك بۆ هەموو مرۆڤ....

لەم وتوێژەی نێوانیاندا حەزرەتی جوبریل فووێك دەکات بەرووخسار و باڵای مەریەم و بەو هۆیەوە سکی پڕدەبێـت چونکە ئەمە بڕیارێکی ئیلاهییە و دەبێت وابێت ، مەریەم تـا سکی تەواو گەورە دەبێت ناچێتە دەرەوە دواتــر خــودا مزگێنی پێدەبەخشێت ] وإذ قـالت الملائكـــــــــة يـا مريم ان الله اصطفاكِ علـى و طهـركِ واصطفاكِ علـى نســـاء العــــالمين. [

مژدەیان پێدا کە خودا تۆی هەڵبژارد و پاك و بێگەردی کردیت و تۆی لە هەموو ئافرەتێکی جیهان بەرزتر کـرد و هەڵبیژاردیت . بێگومان گەیشتنی مەریەم بەم مەقامە بەرز و پیرۆزە بە هۆی گوێڕایەڵیی تەواوی بووە بۆ خودا کــە پێی فەرمووبوو ] يـا مريم اقنتي لربكِ واسجدي واركعي مع الراكعين [ چونکە کچێکی گوێڕایەڵ بوو بە فەرمانەکانی خوداو تـابڵێی ژیر و ئاقڵ لە لوتکەی پاکێتی دابوو و هەروەها بەندەی خودای گەورە بوو.

خوای گەورە دووجار وشەی ) اصطفی ( بەکار دەهێنێت واتا هەڵبژێردراو، لەنێوان ئـەو دوو ) اصطفی ( یـەش، ) گهرك ( هاتووەپاك و بێگەردی لە رەوشت و هەڵس وکەوت و بیرو باوەڕ و شەرم و حەیاو جەستە ....بێنە بەرچـاوت کەکاتێ گوناهێك ئەنجام ئەدەیت چـەندە هەسـت بەنارەحـەتی و ناخۆشـی و پیـسیی ناخـت ئەکـەیت، خوشـکە بەرێزەکەم تۆ پاکیت نەکەی ئەم پاکیی و بێگەردییەت لەدەست بدەیت و بەقسەی کوڕێك هەڵنەخەڵەتێیت، نەکەی لاشەی خۆت بە جل و بەرگی پیس ناشیرین و پیس بکەیت و بۆ چاو پیسان جەستەکەت پیس بکەیت.

چەندە جوانە لای خوای گەورە بە پاکیی بناسرێیت، و هاوەڵیی مەریەمی داوێـن پـاك بیـت ...لـەم رۆژگـارەدا وای لێهاتووە بەهەنجەتی جۆراو جۆر خیانەت ئەکەین ... گەر من کچێك نەناسم یاخود کوڕەکە نەناسم و پێشتر نەزانم چۆنە و چۆن نییە؟ چۆن ژیانی هاوسەرایەتی لەگەڵ پێك بهێنم!!؟؟ بۆ ماوەیەك پەیوەندیی دڵداری دا ئەمەزرێت و دواتر لەیەکتر بێزار ئەبن، بەلآم دوای ئەو هەموو قسە ناسك و جوانانە کەلەگەڵ یەکتری کردوویانە و بگرە مـاچ گۆڕینەوەی نێوانیان ...تەنانەت زۆربەی جار گەیشتۆتە لەدەستدانی شـەرەف و کەرامـەت و ئـابڕوو !!!...مەریـەم فێری داوێن پاکیی و ئابڕووپاکیمان ئەکات، گەریەکێك لەدەرگای دڵتی دا، ئازایانـە پێـی بڵـێ : ئـەوە بـاوکم و ئەوەش خێزانم و دەتوانی بێیتە خوازبێنیم ...پێویست بە پەیوەندیی بـێ شـەرعیی ناکـات ئـەزانن گـەر کـچێك بەئاسانی خۆی بدات بەدەستی کوڕێکەوە، هیچ کات ئەو کچە لای کوڕەکە گەورە نییە و هەر لەبەر ئەمەشە زۆرجـار دیاردەی ) طلاق ( سەر هەڵدەدات.

پێویستە خوشکان و دایکان پاك بن و بەهەشتیش لە پێشوازی کەسانی پاك و بێگەرددایە خوای گەورەش کەسـانی پاك و بێگەردی خۆش دەوێت و بەوهۆیەوەش لەبەهەشتی بەریندا دەبیتە هاوەڵ و رەفیقی مەریەمی داوێن پاك.

مەریەم لە شار چووە دەرەوە وتەواو لە شار دوورکەوتەوە و لە قودسەوە رووی لە بەیت لـەحم کـرد ، و تاگەیـشتە دارخورمایێکی زۆر وشك و بێ بەر ، لە ژێر دارەکە ژانی مناڵ بوون سەرتا پای گیانی مەریەمی گرتەوە و ئازارێکی زۆر توند بەرۆکی بەرنەدا و وتی ] یالیتني متت قبل هذا وکنت نسیا منـسیا [ مەریەم لەبـەر ئازارەکـانی خۆزگـە بـە نەبوون دەخوازێت . ئا لەو کاتەدا حەزرەتی عیسا بەبێ باوك دێتە دنیـا ، خـودای گـەورە دار خورمایەکـەی بـۆ ژیاندەوە و پڕی کرد لە خورما ، فەرمانی پێدەکات لە دار خورماکە بدات و دەنکە خورماکـان دەکەونـە خـوارەوە و بیخۆ ، هەروەها لە ژێر پێکانی ئاو هەڵدەقوڵێ و تێر لە ئاوەکە دەخواتەوە و تینوێتی دەشـکێت ، پاشـان خـودا فەرمانی پێدەکات بۆ شارەکەی خۆی بگەڕێتەوە ..

کە دەگاتەوە قودس خەڵکەکە بەرەو رووی دێن و سەریان سووڕدەمێنێت و پێی دەڵێن ئەی خوشـکی هـارون براکـەت وانەبوو خۆ عـابیدو لە خوا تـرس بوو تۆ ئەم مناڵەت لە کوێ بوو ، مەگەرتۆ کچی عیمران نیـت ؟؟ ] وماکـان امـكِ بغیا [ ، دایکت پاك بووە و پەنای نەبردۆتە بەر زینا!!!...

خودا فەرمانی بە مەریەم کردووە کە هیچ قسەیەکیان لەگەڵ نەکەیت و ئەویش وا دەکات ) ولم اکلم الیوم انسیا ( ، ئا لێرەدا مەریەم بەسەر ئیشارەتێك بۆ جوولەکەکان ئەکات کە قسە لەگەڵ ئەم مناڵە بکەن.....

یەکەم وشە کەلەزاری عیسای کوڕی مەریەم دەردەچێت لەو کاتەی لە باوەشی دایکیدایـە و جوولەکـەکان چـاوەڕێی وەلآمـــــن ] قال اني عبدالله [ دەڵێت من بەندەی خودام ، پاشان دەڵێت ] اتني الکتاب [ پـەیام و کتێـبم بـۆ دەنێرێت و ] وجعلنی نبیا [ و ] وجعلنی مبارکا اینما کنت [ منی کردۆتە پێغەمبەر و بچم بۆ هەر شوێنێك پیرۆزم..

راستەوخۆ جوولەکەکان کەوتنە خۆ و وتیان ئەمە سیحر و جـادووە مەریـەم دەیکـات و راسـت ناکـات !!!.. ئنجـا مەریەمیان بە باغیە ناوبرد و تۆمەتی زیناکاریان خستە پاڵ و عیسا پێغەمبەریشیان بە کوڕی زیناکارەکە نـاوبرد

..

خودای گەورە لە فەرموودەی قودسیدا فەرموویەتی نەوەکانی ئادەم جنێو بەمن دەدەن و شیرك دەکەن و وادەڵـێن کـە عیسا و عوزەیر کوڕی منن بەلاّم من خودای تـاك و تەنهام و ) احدٌ صمدٌ ( م ، و هـەروەها ) لم الـد ( و کەسـیش لەمن نەبووە ، نە منالّم لێبووە و نە منالّیشم دەبێت . خودا فەرموویەتی ] إن مثل عیسی کمثل ادم خلقه من تراب [ ، حەزرەتی عیسا گەورە دەبێت تـا دەگاتە سی سالاّن ] وقفینا علی اثرهم بعیسی ابن مـریم مـصدقا لمـا بـین یدیـه واتیناه الانجیـــــــل [ بەوتەی زانایان کەحەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم تەمەنی گەیشتۆتە سـی سـالاّن خـودا وەحیی بۆ ناردووە لەگەڵ کتێبی ئینجیل.

هەندێك لە شەرع و بەرنامەکانی ئینجیل و تەوراتی تێکەڵ بەیەکتر کرد و چاکە و خراپەی بۆ جوولەکەکان خستە روو و لە شتی حەرام و حەلاّڵ ئاگاداری کردنەوە ، خودا چەندین موعجیزەشی بۆنارد و پیـشانی خەڵکەکـەی ئـەدا وەکو خۆڵ و ئاوی تێکەڵ بەیەکتر دەکرد و دواتر شێوەی چۆلەکەیەکی دروست دەکرد یەکسەر ئەو شێوەیەی دروسـتی دەکرد رۆحی بۆ دەهات و بەرەو ئـاسمان هەڵدەفڕی وەکو دەیفەرموو ] اني اخلق لكم من الطين كهيأة الطير فأنفخ فيه فيكـــــــون طيرا بإذني [ ، دیسان جوولەکەکان باوەڕیان پێنەکرد چونکە ئەوەندە سەرسەخت و لووت بـەرز و لـە خۆبـایی بوون.

یەکێکی تر لە موعجیزەکانی حەزرەتی عیسا ئەوە بوو هەر کەسێك لە زکماکییەوە چاوی نەبووایە دەستی دەخـستە سەر چاوەکانی و دەستبەجێ رۆشنایی دەکەوتەوە چاوەکانی چاك دەبۆوە ، هەروەها ئەوەی پێـستی بەڵـەك دەبـوو چاك بوونەوەی ئەستەم بوو حەزرەتی عیسا دەستی بەسەردادەهێنا و راستەوخۆ چاك دەبۆوە ، جگە لەوەی دەیزانـی کە خەڵکەکە نیوەڕۆیان و ئێواران چی دەخۆن و چی دەکەن و چی ناکەن ، بەلاّم هەر باوەڕیان پێنەکرد و دەیانووت : عیسا جادووگەرەو سیحر دەکات .. بەلاّم زۆکەم باوەڕیان پێهێنا وەکو زانایان دەڵێن ئەوانەی باوەڕیان بە حەزرەتی عیسا هێنا ژمارەیان یانزە کەس بووە و هەندێکیشیان دەڵێن حەڤدە کەسێك بوون.

لێرەوە جوولەکەکان بوون بە سێ بەش و بەشێکیان وتیان عیسا خودایە و بەشەکەی تریان وتیان کـوڕی خودایـە و بەشی سێیەمیان وتیان بەندەی خودایە بەلاّم کۆمەڵێك شك و گومانیان لـە دلا بـوو ، ئـەمجارەیان حەوارییـەکان پێیان وت ) هل یستطیع ربك ان ینزل علینا مائدة من السماء ( ؟ خۆ ئەمانە حەواریونەکانن و باوەڕیان بە عیسای کوڕی مەریەم هێناوە بەلاّم گومانیان بۆ دروست بووە ] قال یا قومي اتقوا الله [ پێی فـەرموون گەلەکـەم لـە خـوا بترسن....

دواتر بە فەرمانی خودا سفرە و خوان و نانێکی زۆر گەورە لە ئاسمان هاتە خوارەوە و باوەڕیان هێنا و لەنانەکەیان خوارد تەنها یەکێیان خیانەتی کرد و هەڵگەڕاوە و سەرجەم جوولەکەکان لەم دیاردەیە ترسان .

بۆیە جوولەکە بێ باوەڕەکان خۆیان گەیاندە لای پاشای ئەو سەردەمە کە رۆم بوو ، پێیـان وت : ئەگـەر هـەوڵێك نەدەیت بۆ لەناوبردنی عیسا ئەوا سەروەت و سامان و موڵکی ئێمە و تۆ لە دەست دەچێت ، پاشا رۆمەکەش بڕیاریدا کە عیسا قۆڵبەست بکرێت و دەبێ لە خاچیش بدرێت ، بێگومان ئەم بڕیارەش دەرهەق بە عیسای کوڕی مەریەم پاش سێ ساڵ لە پێغەمبەرایەتی هات کە تەمەنی گەیشتبووە سی و سێ سالاّن...

)ئیبن عباس ( لە پێغەمبەری پێشەوا دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ : کاتێ عیسای کوڕی مەریەم بەم هەواڵەی زانی کە پیلانیان داڕشتووە بۆ لە خاچ دانی ، خۆی شۆرد و چووەلای هاوەڵەکانی ئەوانەی کە باوەڕیان پێ هێنا بوو و پێـی فەرموون کێ لە ئێوە ئامادەیە شێوە و رووخساری بێتە سەر شێوە و رووخساری من چونکە لەبەهەشـتدا لەگـەڵ مـن

دەبێت ...

گەنجێکی تازە پێڕاگەیشتوو هەڵسایە سەر پێ و وتی : من ئامادەم ، حەزرەتی عیسا فەرمووی : تۆ دانیشە ... دیسان دووبارەی کردەوە کێ لە ئێوە ئامادەیە ئەم کارەی پێ بسپێرم ؟ جارێکی تر گەنجەکە هەستایەوە و ئنجا حەزرەتی عیسا پێی فەرموو ] ولك ذلك [ ئنجا چووە پێش حەزرەتی عیسا و شێوە و رووخساری وەکو حەزرەتی عیسا لێهات.. پاشان پێغەمبەر دروودی خوای لەسەربێت دەفەرمووێت : بەم شێوەیە و بەبەرچاوی هەموو هاوەڵەکانی حەزرەتی عیسا سەلامی خودای لەسەربێت بە فەرمانی خودا بەرەو ئاسمان بەرز بۆوە و بۆلای خودا رۆیشت و پاشان گەنجەکە کە شێوەی وەکو حەزرەتی عیسا لێهات قۆڵبەستکرا و لە خاچ درا....

ئەو کەسەی کە خیانەتی لە حەزرەتی عیسا کرد دوانزە جار قۆڵبەستکرا و وتی : لەریزی هاوەڵانی عیسا نیم و دژی ئەوم ، پێشتریش حەزرەتی عیسا ئەم هەواڵەی بە هاوەڵەکانیدابوو کەکەسێك لەنێو ئێوەدا هەیە دوانزە جار خیانەت دەکات و لە باوەڕەکەی پەشیمان دەبێتەوە!!!!...

ئایینی مەسیحیەت دووسەد و چل ساڵی خایاند و پاشان پاشایەك هات بەناوی قوستەنتینیە ، ئەم پاشایە ئایینی مەسیحییەتی هەڵبژارد بەڵام گۆڕانکارییەکی تەواوی تێدا کرد و لەوکاتەوە مەسیحییەکان بوون بە سێ بەش کە بەشێکیان پێیان ئەوترێت یەعقوبیە ئەمانە لەو بڕوایەدابوون کە حەزرەتی عیسا خودایە ... بەشەکەی تر مەستورییەن کە ئەمانە ئێستاش هەن و لەو بڕوایەدان کە حەزرەتی عیسا کوڕی خودایە!!!...

بەشەکەی تریان پێیان دەووترێ یونیتریا ، ئەمانە ئێستاش هەن و کڵێسایان زۆرە و لە ئەمریکادا زۆرن و لەو بڕوایەدان کە حەزرەتی عیسا بەندەی خودایە.. پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت : رۆژێك دادێت کە حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم لە ئاسمان دێتە خوارەوە و نیشانەکانی قیامەت نزیك دەبێت و هەموو پێغەمبەرانیش دەبن بە برا هەروەها دەفەرمووێت لەوکاتەدا من نزیکترین کەسم لە حەزرەتی عیسا چونکە هیچ پێغەمبەرێکی تر لە نێوان من و حەزرەتی عیسادا نەبووە ...

بۆیە حەزرەتی عیساش بەشارەت دەدات کەلەدوای من پێغەمبەرێك دێت ] يأتى من بعدى اسمه احمد [ ، کە بەڕاستی ئەمانە هەموو راستی و هەقیقەتی قورئانی پیرۆز دەخەنە روو ..وتەیەك بۆ ئەوانەی ) أهل كتاب ( ن، و مەسیحین ...چاولێکردن لە باوباپیران و دەوروبەر و بێ نەزانین ژیان بەفیڕۆدانە، ئایینی مەسیحیەت راستەو باوەڕمان هەیە کەلەلای خوای گەورەوە هاتووە ...بەڵام کەی لە خوای گەورە ئەوەشێتەوە بۆ خەڵکی سەر زەوی لە یەکتردا چەند یاسایەك بنێرێت، هەروەك لەوڵاتێك چەند ) دەستوور ( ی نابێت، بەهەمان شێوەش بۆ مرۆڤەکان چەند بەرنامەیەك نابێت.

هەر پێغەمبەرێك هاتبێت فەرمانەکانی خوای گەورەی بەجێگەیاندووە ئنجا ماوەی ژیانی کۆتایی پێهاتووە، و پەیامەکەیشی کاری پێئەکرێت تاوەکو خوای گەورە پەیامێکی تر رەوانە ئەکات، کەپەیامێکی تر هات پەیامەکەی پێشتر لەکارپێکردن ئەوەستێت هەر لەبەر ئەمەشە ) تەورات ( و ) ئینجیل ( وەکو خۆیان نەماونەتەوەو دەستکاری کراون و هەقیقەتەکانیان شێوێنراون و دەستکارییان کراوە!!!...

ئیتر کاتی ئەوەنەهاتووە بپرسین بۆ هەزار و چوار سەد ساڵ زیاتر قورئان هاتووە و کەسێك نەیتوانیوە دەستکاری بکات؟؟؟ بێگومان کەسێك بۆی نییە دەستکاری بکات چونکە خوای گەورە خۆی پارێزگاری لێئەکات ] إنا نحن نزلنا الذكر وإنا له لحافظون[ ، بەڵام ئینجیل و تەورات دەستکارییان تێدا کراوە و هەرکەسە و بەئارەزووی خۆی و بەهەرناوێك بێت ئینجیل و تەوراتی نووسیوەتەوە و بەئارەزووی خۆیشی دەستکاری کردووە!!!!...

بەکوڕناسینی ) عیسی ( پێغەمبەر بـەکوری خـوا ، دووره لەهـەموو تێگەیـشتنێك گـەر سـیفەتی خـوای گـەورەی تیادابووایە نەخەو دەیبردەوە و نەخۆراکی ئەخوارد و نەشێوەشی وەکو مرۆڤ ئەبوو ... چـۆن خـالیق وەکـو مـەخلوق ئەبێت!!؟؟ خالیق بەدیهێنەر و نەمرە و کەس شێوەی لەو ناچێت و کەسیش لەو نەبووە و تاك وتەنهایـە ] قُـلْ هُـوَ اللَّهُ أَحَدٌ * اللَّهُ الصَّمَدُ * لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ * وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ.[*

براو خوشکانی مەسیحی کاتی ئەوەنەهاتووە چاو لە راستییەکان بکەن و دان بەگەورەیی خوای گەورە بنێن و ملکەچی بڕیار و فەرمانەکانی ئەوخوایە بن کە تاك و تەنهایە و بالأدەستە بەسەر هەموو شتێکەوە؟ کـاتی ئەوەنـەهاتووە چیتر خەسڵەت و بیرۆکەی باب و باپیرانتان نەکەنە بیر و هۆشی خۆتـان.

بۆبیری جوانی خۆتـان ناکەنە کار و فەرمانەکانی خوای گەورە جێبەجێ بکەن ؟ کە دوایین فەرمانە بـۆ مرۆڤـەکان ئەویش دەست هەڵگرتن لە ئایینەکانی تر و پەیڕەوکردن و شوێنکەوتنی ڕێبازی سەرداری پێغەمبەران کـە ئـەویش حەزرەتی موحەممەدە سەلآت و سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت و دەستگرتنە بە ئایینەکەی کە بێگومان کتێبەکەی کە قورئانی پیرۆزە مەزنترین و پیرۆزترین کتێبە کەلەلایەن خوای گەورەوە بۆی هـاتووە و کەسـێکیش نـەیتوانیوە دەستکاری بکات و هیچ کەسێکیش بۆی نییە دەستکاری بکات کە خوای گەورە خۆی دەیپارێزیت....

وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انْتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا (16) فَاتَّخَذَتْ مِنْ دُونِهِمْ حِجَابًـا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَـا رُوحَنَـا
فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا (17) قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَنِ مِنْكَ إِنْ كُنْتَ تَقِيًّا (18) قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّـكِ لِأَهَبَ لَـكِ
غُلَامًا زَكِيًّا (19) قَالَتْ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا (20) قَالَ كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ
وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَقْضِيًّا (21) فَحَمَلَتْهُ فَانْتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا (22) فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَى
جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنْتُ نَسْيًا مَنْسِيًّا (23) فَنَادَاهَا مِنْ تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ
سَرِيًّا (24) وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا (25) فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ
أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنْسِيًّا (26) فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَـالُوا يَـا مَـرْيَمُ لَقَـدْ جِئْـتِ
شَيْئًا فَرِيًّا (27) يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا (28) فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَـنْ
كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا (29) قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا (30) وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنْتُ وَأَوْصَانِي
بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا (31) وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا (32) وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدْتُ وَيَوْمَ أَمُـوتُ
وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا (33) ذَلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ (34) مَا كَانَ لِلَّهِ أَنْ يَتَّخِذَ مِنْ وَلَدٍ سُبْحَانَهُ
إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ (35) وَإِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ (36) مريم.

* *